# مێژووی دەوڵەتی عەباسی








نووسینی : محمد سهيل طقوش
وەرگێڕانی: هێمن ئەحمەد

**تەنها بەناوی خوای گەورە**

**ناسنامەی کتێب**


- ناوی کتێب بەعەرەبی: (تأريخ الدوله العباسيه)
- نوسینی: د. محمد سهيل طقوش
- ناوی کتێب بەکوردی: (مێژووی دەوڵەتی عەباسی)
- وەرگێڕانی: هێمن ئەحمەد. ژ.م (٠٧٧٠١٩٧٣٣٠٩)
- پێداچونەوەی: دێرین کامیل
- چاپخانەی: چوارچرا
- نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم / ٢٠١٥
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردنی ( ١٢٩٣ ) ی ساڵی (٢٠١٥)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێرست

**پێشکەشە بە......**

- ئەو کەسانەی کە چرای زانست هەڵدەگرن بۆ ئەوەی رێگە بۆ گەلەکەیان رۆشن بکەنەوە.

- ئەو سەرکردانەی کەوا پەند لە مێژوو وەردەگرن و سوود بە نەتەوەکەیان دەگەیەنن.

- دایك و پووری خۆشەویستم, کەوا زۆر ماندوو بوون لە پەروەردە کرن و پێگەیاندنم.

## وتەی وەرگێڕ

بێگومان مێژوو گرنگیەکی زۆری هەیە لەلای گەل و نەتەوە جیاجیاکان، چونکە بەشێکە لەبوونیان، رابردوویان پێکدەهێنێ و ئایندەیان دیاری دەکات، مێژوو مامۆستایەکە دەتوانی شتی زۆری لێ فێربی و پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگری و هەڵەکانی دووبارە نەکەیتەوە، ئەم کتێبەش یەکێکە لە سەرچاوە مێژووە گرنگەکانی کتێبخانەی عەرەبی کە چاپخانەی (دار النفائس) هەستاوە بە چاپ و بڵاو کردنەوەی بە زمانە عەرەبیەکەی، ەبەر ئەوەی کتێبخانەی کوردی، بەراورد بە کتێبخانەی عەرەبی و ئینگلیزی و..... هتد، هەژارە، کردنی بەکوردی دەتوانێ کەلێنێکی بچووک لەبواری مێژوودا پڕبکاتەوە.

بەئومێدی ئەوەی خوێنەرو رۆشنبیر و توێژەرانی کورد سوودی لێ ببینن و بە مێژووی ئەو گەل و نەتەوە و گروپ و تاقمانەی کە هاوسنوور و هاو نیشتمانیان، ئاشنا بن.

✍

هێمن ئەحمەد

## پێشەکی

سوپاس بۆ خودای پەروەدگاری جیهانیان، درودو سلامیش لەسەر محمد (صلي الله علية وسلم) پێغەمبەری خۆشەویستمان، لەسەر یارویاوەر وشوێنکەوتووان......

پاشان:

ئەم توێژینەوە باس لەمێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دەکات لە رووی سیاسیەوە بە شێوەیەکی بابەتیانە. ئەوەی راستیش بێ رووداوەکانی مێژووی دەوڵەتی عەباسی زۆرو ئاڵۆزو تیکەڵ وپێکەڵەن و پێکهاتەی سیاسی زۆری هەیە, بۆیە دەوڵەتێکی ئیسلامی بەرفراوانی لێ دروست بوو وە بە تەواوکەری دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی دادەنرێت کە چەند لایەنێك ململانێیان لەسەری دەکرد وەکو لایەنی عەرەبی و فارسی و تورکی، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و دەمارگیری جیاوازی بە خۆوە بینی لەگەڵ گەشەکردنێکی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی گرنگدا، کە رێرەو و رێبازی دیاری کرد، بیروباوەری ئیسلامیش هۆکارێکی روون و ئاشکرا بوو لەدروستبوونی ئەم رووداو و ئاوێتەبوونە ئەوەش چونکە کاریگەریەکی بنەرەتی هەیە لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی تەنها بەیعەت دان نەبوو بە خەلیفەیەك ونەدانی بەخەلیفەیەکی تر, یاخود گواستنەوەی دەسەڵات لە ئەمەویەکانەوە بۆعەباسیەکان، بەڵکو ئەم رووداوە شۆرشێکی گشتگیر بوو لەمێژووی ئیسلامیدا و وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە رێرەوی گەشەکردنی ئیسلامی کە بە شێوەیەکی رەگو ریشەیی کۆمەڵگەی ئیسلامیی گۆری و وێنایەکی قووڵی بە جێهێشت لە هەموو لایەنەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ئابوری، دەرگای لە بەردەم موسڵمانە نا عەرەبەکان کردەوە تا بەشداربن لەو لایەنانە. مێژونووسەکانیش هەوڵیان داوە پەنهانی و شاراوەیی ئەم وەرچەرخانە بدۆزنەوە و راڤەی بکەن لەچەند بۆچۆنێکی جیاوازدا. هەندێکیان بۆچوونیان وا بوو ئەمە شورشی فارسە دژی دەسەلاتی عەرەبی، لەکاتێکدا هەندێکی تر پێیان وابوو ئەمە تەنها شۆرشێکە دژی

دەسەڵاتی بنەماڵەی ئومەیە بۆلابردنیان لە سەر دەسەڵات و دانانی عەباسیەکان لەجێگەیان، هەندێکی تریش وتیان ئەم وەرچەرخانە هەر دەبوو ڕووی بدایە بە هۆی ئەو گەشەکردنەی کە جیهانی ئیسلامی لەسەدەی یەکەمی کۆچی بەخۆیەوە بینی.

ئەوەی ڕاستیش بێ ئەمە دەرئەنجامی سیاسەتی نا هاوسەنگی ئەمەویەکان بوو بەرامبەر ئەو گەل و نەتەوانەی کە عەرەب نەبوون و بەرامبەر هەندێ لایەنی عەرەبیش، وە هەڵئوتانێکی ڕوون و ئاشکرا بوو لە ژیانی سیاسی کەوا عەباسیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان یەکلاییان کردەوە، هەروەها سوودیشیان لە نەبوونی سەرکردە وەرگرت کەوا مردنی – ئەبوهاشمی کوڕی موحەمەدی کوڕی حەنیفە– بە جێی هێشت خاوەن و ڕابەری–بانگەشەی کەیسانی –، جا ئەم بۆشاییەیان پڕ کردەوە ئەوەش بە کردنی (موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) بەسەرۆکی بانگەشەی کەیسانی تا–ال محمد–ڕازی بکەن بەرووکەش، ژێر بەژێریش تایبەتی بکەن بۆ – بنەماڵەی عەباس– وە بە هۆی زیرەکی ولێهاتوویی ئەم کابرایە توانی بگاتە مەبەستی خۆی.

جا کاتێك کەسێکی پەیداکرد بۆ سەرکردایەتی, زەمینەی لەباریش بۆ پەسەندکردنی بانگەوازەکە دۆزرایەوە، ئەوەش بریتی بوو لە خوراسان وەکو خاك و خوراسانیەکان وەکو گەلێکی پەرۆش و ئامادە بۆ پەسەندکردنی ئەم گۆرانکاریە کە کۆمەڵێ هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و بیرو باوەڕی پاڵنەریان بوون.

بۆ نموونە عەربەکان لە خۆراسان لەناو خۆیاندا ناکۆك بوون و ململانێ قەیسی – یەمەنی هەر نەدەبرایەوە. هەروەها ئەم وڵاتە چەندین پێکدادانی بە خۆوە بینی لە گەل تورکە بتپەرستەکاندا بە هۆی ئەو شوێنە سنوریەی کە هەیبوو لە ناوچەی – وڵاتی دوای ڕووبار–، هەروەها فارسێکی زۆر هەبوون بێزار بووبوون لە دەسەڵاتی ئەمەوی و پشتگیری لێکردنیان، بەتایبەتیش خۆراسان زۆر دوورە لە ناوەندی خیلافەتی ئەمەوی، ئەمەش هۆی نەگەیشتنی فریاگوزاری بوو بۆی لە کاتی گونجاودا، بۆیە ئەم هۆکارە یارمەتیدەرێك بوو لە دروستبوونی ئاژاوە و ڕاگەیاندنی یاخی بوون لە ناوەندی خیلافەت.

ئابەم شێوەیە ئەبو موسلیم خوراسانی کە ئیبراهیمی کوڕی عەلی ناردی بۆ خۆراسان توانی بانگەشەی عەباسی ئاشکرا بکات وفارسی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی، پاشان سوپاکەی بەرەو عێراق کەوتەڕێ ولەوێش توانی سوپای ئەمەویەکان ببەزێنێ و لە ساڵی (١٣٢ک/٧٤٩ن) چووە ناو بەسرەو کوفەشەوە.

هاوکات ئەبو عەباسی خوێنڕێژ، کەوا (ئیبراهیمی ئیمام)ی برای لە سەرۆکایەتی بانگەشەکە دانا، بەرەو کوفە ڕۆیشت، وتارێکی بۆ خەڵکی خوێندەوە تێدا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیی ڕاگەیاند، بۆیە ناوبراو بە یەکەم خەلیفەی عەباسی دادەنرێ، سەرکردەکانی تریشی ئەو دوای ئەمەویەکانیان لە ناوبرد.

ئەبو عەباس لەپاش مردنی، ئەبو جەعفەری مەنسوری برای لەجێی خۆی دانا، کەوا بەڕاستی بە دامەزرێنەری دەوڵەتی خیلافەتی عەباس دادەنرێ..ئەوجا لەپاش ئەم، خەلیفەکان یەك لە دوای یەك دەسەڵاتیان دەگرتە دەست بۆ ماوەی چوار سەردەمی مێژوویی کە تا ساڵی(٦٥٦ک/١٢٥٨ن) بەردەوام بوو.

کاتێك خیلافەت کەوتە دەستی بنەماڵەی عەباس، سنووری جیهانی ئیسلامی هەردوو هەرێمی جرجان و تخارستانی گرتەوە، نزیکی سنووری وڵاتی تورك وچین بووەوە، لە باشووری ڕۆژهەڵات گەیشتە وڵاتی کەشمیر، وڵاتی نووبە لە باشوری میسر، ئەو ناوچانەی کە لەدوای مەغریبەوە دێت لەبیابان بەرەو باشور ، وە چیاکانی قۆقاز و ئەرمینیا لە باکوور، نزیکی سنووری ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بووەوە، دەربارەی ئەندەلوس – یش ئەوا سنووری لای باشوری گەیشتە نزیکی وڵاتی فەرەنجە ([1]).

دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە چەندین ناکۆکیی ناخۆیی بەخۆوە بینی لە پێناو بەدەستهێنانی دەسەڵات کە دواتر پەرەی سەندو بووە پێکدادانێکی خوێناوی، وەکو یاخی بوونی (عەبدوڵلای کوڕی عەلی) لە (ئەبو جەعفەری مەنسور)ی برازای و ڕەنگە مەترسیدارترین ململانێ کە سەردەمی عەباسی

---

[1] فەرەنجە:دانشتوانی ئەوروپا

یەکەم بە خۆیەوە بینیبێتی بریتیە لەو ناکۆکیەی کە لە نێوان ئەمین و مەئموندا رویدا.

خەلیفە عەباسیەکان لە ماوەی سەردەمی عەباسی یەکەمدا دووچاری بەرهەڵستی ئامۆزاکانیان بوونەوە – تالبیەکان – کەوا لەکاتی پشتگیری کردنیان لە شۆڕشدا بە تەمابون خیلافەتیان پێ بسپێردرێ. ئەگەرچی کاتێك عەباسیەکان دەسەڵاتیان خستە ژێر رکێفی خۆیان، مافیان پێشێل کرا بۆیە ئەوانیش بە پشتبەستن بە بزوتنەوی دوژمنانی عەباسیەکان روبەرویان بونەوە. هەروەها عەباسیەکان روبەروی بزوتنەوە گەلێکی دەمارگیری فارسی بوونەوە کە دژی دەسەڵاتی عەرەبی بوون، بە تایبەتی لە دوای کوشتنی ئەبو مسلیمی خۆراسانی وەکو بزوتنەوەی بابەکی و خۆرەمیەکان.

هەروەها دەوڵەتی خیلافتی عەباسی لە سەدەی یەکەمیدا چەندین پێکدادانی بەخۆوە بینی لەسەر سنورەکەی لەنێوان خۆی و دراوسێکانی بە تایبەتی بێزەنتیەکان.جا جەنگی هاوینان وزستانان هەر بەردەوام بوو، کە سەرسنور گۆڕەپانەکەی بوو، بەڵام دەوڵەتی عەباسی هەوڵی نەدا دەوڵەتی بێزەنتی لە ناو بەرێ. سەبارەت بە بەرەی رۆژهەڵات ئەوا عەباسیەکان دەسەڵاتی خۆیان لە هەرێمەکانی – وڵاتی دوای روبار– و هەرێمی سند, چەسپاند.

هەروەها دەوڵەتی عەباسی کاری کرد بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆی لە وڵاتی مەغریب، بەڵام ئەندەلوس زۆری نەخایاند لێی جیا بووەوە ئەوەش بە هەنگاوێکی سەرنج راکێشانە بە سەرکردایەتی (عەبدولرەحمان ئەلداخل)ی ئەمەوی، ئیدریسیەکانیش هاوشێوەی ئەو, مەغریبی ئەوپەریان جیاکردەوە، ئەمەش وای لە عەباسیەکان کرد هەوڵ بدەن ئەو هەرێمانەی تر کەوا دەیانەوێ جیا ببنەوە, بە شێوەیەکی فەرمی بە دەوڵەتی خۆیان ببەستنەوە – بۆنمونە دانانی (ئەلرەشید ئیبراهیم کوڕی ئەلئەغلەب) بە والی لەسەر ئەفریقیا.

دەوڵەتی خیلافەی عەباسی زۆر کاریگەر بوو بە ململانێی نێوان عەرەب و فارس و تورك لەسەر دەسەڵات. جا دەسەڵاتی فارسەکانیش بە هێز بووەوە بە هۆی بێ توانایی خەلیفەکان لەپاراستنی هاوسەنگی نێوان ئەم گەلانە، بۆیە زاڵ بون بەسەر زۆربەی دامو دەزگاکانی دەوڵەت و وەزیر و سەرکردەی زۆرداریان هەبوو هەر

لەسەردەمی مەنسورەوە، تا ئەو کاتەی کە (هارون رەشید) ناچار بوو وەزیرەکانی خۆی لەبەرمەکیەکان لەدەسەلات دووربخاتەوە و سەر شۆڕیان بکات، پاشان کە مەئمون سەرکەوت بەسەر (ئەمین)ی برای، جارێکیتر تای تەرازویان قورس بووەوە و بنەماڵەی سەهد -کەوا فارس بوون- پلەوپایەیەکی گەورەیان بەدەستهێنا لە سەردەمی ئەودا، (المعتصم)یش وای بینی گروپ و تاقمێکی نوێ بۆ خۆی پەیدا بکا کە بتوانێ پشتی پێ ببەستێ، بۆیە تورکەکانی کردە دۆست و نزیکی وەزیرو سەرکردەی خۆی، بەوەش کوتایی بە دەسەڵاتی فارسی هێنا.بە مردنی (الوثق) لەساڵی (٢٣٢ك/٨٤٧ز) سەردەمی عەباسی یەکەم کۆتای پێ دێت.

ئەوەی کە عەباسیەکان لە سەردەمی عەباسی یەکەمدا دووچاری بوون لە گرفتی ناوخۆیی و دەرەکی، ڕێگەی لێ نەگرتن دەوڵەتەکەیان بەرەوپێش بەرن و ئاستی بەرز بکەنەوە و توانایەکی سیاسی و شارستانی پێ ببەخشن، ئەوە بوو لە سەردەمی مەنسوردا شاری بەغدایان دروست کردو لەو کاتەوە بۆتە پایتەختی دەوڵەت و یەکێك لە گەورەترین شارستانیەتی ئیسلامی و بنکەیەکی بازرگانی گەشاوەیە. (المعتصم)یش شاری سامەرای دروست کردو نیشتەجێی بوو و کردی بە بناغەی دەوڵەت , بەڵام ئەوە لە گرنگی بەغدادی کەم نەکردەوە.

بازرگانیش گەشەکردنێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی و پشتی بە بەرووبوومی هەرێمەکانی دەڵەت دەبەست یان ئەوەی کە لە دەرەوە هاوردەیان دەکردو پاشان هەناردەیان دەکردەوە، هەروەها ژیانی ڕۆشنبیریش گەشەی کردو بە عەرەب کردنی کەلتوری زانستی مرۆڤایەتی چالاك بووەوە.

دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لە سەردەمی عەباسی دووهەمدا کەوا لە ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٧ز) دەستیپێکرد، چالاکی و کاریگەری خۆی لە دەست دا. ئەوەش لە ئەنجامی لاوازبوونی دەستەی حوکمڕانی کە بووە هۆی لاواز بوونی دەسەڵاتی ناوەندی لە ڕووی سیاسی و ئیداری و داراییەوە، لە ئاکامدا ویلایەتەکان یەکە یەکە لێی جیابوونەوە. بەڵام ئەو بنەمایانەی کە شۆڕش بانگەشەی بۆ دەکرد هەر بەرهەمی هەبوو هەرچەندە خیلافەتیش لاواز بووەوە, دەوڵەت لە سیستەمی حوکمدا لە

مەرکەزی بوون بووە نامەرکەزی بەبێ ئەوەی هیچ لایەنێك جیا بێتەوە، نەتەوەی تازە هاتەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە و توانی بگاتە دەسەڵات و خەلیفەکان کەوتنە ژێر دەستی ئەوان، بۆیە ڕۆڵی سیاسیان کز بووەوە، ئەوەبوو تورکەکان هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسیەوە و بەڕێوەبردنی دەوڵەتیان لە ئەستۆ گرت، خەلیفەکانیش لە سێبەری ئەواندا, ونبوون.

ڕێڕەوی مێژووی سیاسیش وەرچەرخا, وە بەمێژووی خیلافەت نەمایەوە, بەڵکو وای لێهات نەتەوە ئیسلامیەکان ئەم مێژووە دروست بکەن و ئاراستەی بکەن.ئەوە بوو دەمارگیری و نەتەوە پەرەستی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا لەژێر دروشمی یەکسانی سەری هەڵدا، خیلافەتیش بەرژەوەندی هەرێمەکانی لەبەرچاو گرت و بەدەنگیانەوە چوو، لەئەنجامیشدا نامەرکەزیەت هاتەکایەوە.

جا شتێکی زۆر ئاساییە لەم ڕەوشە دەگمەنەدا هەوڵی مێژوو نووسەکان بۆ ئەوە بێت سیاسەتی نەتەوە ئیسلامیەکان بە کۆمەڵگە بناسێنن کە هەوڵی ئەوە دەدەن خودی خۆیان و بەرژەوەندیان و دەسەڵاتیان بەهێز بکەن و گەشە ی پێ بدەن، لەباتی ئەوەی خەریکی تۆمار کردنی کار و کردەوەی خەلیفەکان بن.

لەم سەردەمەدا بیرۆکەی کۆکردنەوەی جیهانی ئیسلامی لەژێر یەك سەرکردەی سیاسی, پەرش وبڵاو بووەوە، پەیوەندی خیلافەت لەگەڵ وڵاتەکانی دراوسێیدا جۆلانەی دەکرد لە نێوان دوژمنایەتیەکی سەخت و هاریکاریەکی بە سوود.

سەردەمی عەباسی سێهەمیش کە وا لە ساڵی(٣٣٤ك/٩٤٠ن) دەستی پێکرد کاردانەوەیەکی ئەوتۆی بە خۆیەوە بینی دژ بە دەسەڵاتی تورکی کەوا زاڵ بوو بوون بەسەر دامودەزگاکانی خیلافەت لە سەردەمی عەباسی دووهەمدا، ئەوەش لە ڕێگەی بزوتنەوەیەکی فارسی – شیعی کە (بنەماڵەی بووەیە) ڕابەریان دەکردو کەوا وڵات گەلێکی (جیاخواز – إنفصالی)یان بنیاتنا لە فارس و ئەهواز و کرمان و ڕەی و ئەسفەهان و هەمەداندا، توانیان دەسەڵاتی تەواوەتی خۆیان بەسەر عێراقدا بسەپێنن وناویان دەرکەوت ودەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە گەورە بوو و سەردەمی عەباسی سێهەم بە ناویان ناونرا.

لەپاش هەوڵێکی زۆردا (بووەیهیەکان) توانیان پارێزگاری لە پۆستی خیلافەت بکەن و زاڵ بن بەسەر دامودەزگاکانی حوکمداو بەشێوەیەکی ڕەها هەڵسوکەوتیان دەکرد. جا دیاردەی لاوازبوونی خەلیفەکان و لەدەستدانی سامیان تا ئەم سەردەمەش هەر بەردەوام بوو.

سەردەمی عەباسی چوارەم کەوا لە ساڵی (٤٤٧ك / ١٠٥٥ز ) دەستیپێکرد کاردانەوەیەکی ئەوتۆی بە خۆوە بینی دژ بە دەسەڵاتی شیعی ئەم سەردەمەش لەسەردەمی پێش خۆی ئەچێ لە ڕووی بایەخدانی سەلجوقیەکان – کەوا جێگەی بووەیهیەکانیان گرتەوە – بە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەوە بوو دەسەڵاتی خۆیانیان سەپاند بەسەر خیلافەتدا هاوکات ڕێزیان لەخودی خەلیفەو ناوەندی خیلافەت گرت، لەڕووی مەزهەبیەوە ئەم سەردەمە جیاوازە لە سەردەمی پێش خۆی، چونکە سەلجوقیکان مەزهەبی – سونی – یان هەڵبژاردو کەوا خەلیفەی عەباسی بە سەرکردەی روحی ئەم مەزهەبە دادەنرێت. پەیوەندی خیلافەتیش بە سەلجوقیەکان جۆلانەی دەکرد لە نێوان هاریکاریەکی بە سوود و دوژمنایەتیەکی سەخت، بە تایبەتی لە کاتی پەرتەواز بوونی سەلجوقیەکان، خەلیفەکانیش ئاواتە خواز بوون لەگەمارۆ و کۆت و بەندی سەلجوقیەکان رزگار بن. بەڵام خیلافەت خۆیی بە دەستەوسانی بینی و توانای نەبوو سنورێك بۆ ئەو پەشێوییە دانێ کە لە ئەنجامی ململانێی بنەماڵەی سەلجوقی هاتبووە ئاراوە، بۆیە پشتی بەست بە خوارزمیەکان بۆ لە ناوبردنی سەلجوقیەکان، ئەمەش دیسانەوە خیلافەتی خستە ناو ململانێیەکی دیکە لەگەل ئەم کۆمەڵە تازەیە، چونکە دەیانەویست بەسەر دامودەزگاکانی خیلافەتدا زاڵ بن.

خیلافەتیش بۆ ئەوەی رزگار بێ لەڕکێفی خەوارزمیەکان، بەئەنقەست پشتی بەست بە کۆمەڵێکی نوێ، کە مەغۆلەکان بوون کەوا بە تۆندو تیژی و دڕەندەیی ناسراو بوون، ئەوە بوو لە ساڵی (٦٥٦ ك / ١٢٥٨ ز) بە دەستی ئازار بەخشی مەغۆلەکاندا, ڕوخا.

وادیارە کتێبخانەی عەرەبی تۆژینەوەیەکی زانستی گشتگیر و تایبەتی نیە کە بتوانێ مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی هەر لە سەرەتای دروستبونیەوەو تاوەکو

ڕوخاندنی چارەسەر بکات و ئەوەی کە نووسینی عەرەبی تا ئێستا چارەسەری کردوە تەنها بەشێکی زۆر کەمە لەم مێژوودا، جگە لە سەردەمی عەباسی یەکەم کەوا بایەخێکی ئەوتۆی پێدراوە، لەبەر ئەوەش ئەمە پاڵنەرێك بوو بۆ ئێمە کە دەربارەی ئەم بابەتە بنووسین، بۆ ئەوەی وێنەیەکی چڕو پڕ بخەینەڕوو دەربارەی مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە تاوەکو ڕوخانی، لە گەڵ ڕەچاو کردنی ئەو بارودۆخەی کە پێیدا تێپەڕ بووە و ئەو ڕەوتە جیاوازانەی کە حوکمی کردوە، بەمەش ئێمە مێژووی قۆناغێکی ئیسلامی – کە بێ گومان گرنگترین قۆناغی مێژووی ئیسلامیە– خستۆتە بەردەستی خوێنەر، چونکە چەندین ڕەوتی سیاسی و ئارەزووی حیزبی و هەستی دەمارگیری لە خۆ گرتووە، کە تا ئەمڕۆش کاریگەری هەیە لەسەر ڕەوشی جیهانی ئیسلامیدا.

لەم توێژینەوەدا بە وردی باسی ڕوداوەکان ناکەم، جگە لەوەی کە پێویستە، ئەوەش بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستیەکان یان وەکو شایەتێك. بێگومان ناتوانرێ بە چڕو پڕی و بابەتیانە باسی ئەم مێژووە تێکەڵ وپێکەڵە بکرێ تەنها بە گەڕانەوە بۆ بنچینەکانی نەبێ، بە تایبەتی ئەگەر بیرۆکەو زانیاری و هەڵوێست و بۆچوونە جۆراوجۆرەکان لەبەرچاو بگرین.

ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە ئامانج لە خوێندنی ڕوداوەکانی مێژوو بریتیە لە وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری، ئەرکی مێژوو نووسیش ئەوەی بە سەردا ئەسەپێنێ بازبدات بە سەر هەموو ئەو لەمپەرو ڕێگرانەی کە دێنە ڕێی لە کاتی لێکۆلینەوەدا کەوا دیدەی ڕاستەقینەی لێ دەشارێتەوە و دووری دەخاتەوە لەگەیشتن بە ڕاستیە زانستیەکان.

لەبەر ئەوەش لەم توێژینەودا پشتم بە سەرچاوەی گەورەو گرنگ و زۆرو هەمەجۆر بەستووە، کە خوێنەر لە پەراوێزی توێژینەوەکەدا، دەیبینێ.

وە هیوادارم توانیبێتم خزمەتی حەقیقەتی مێژووی بکەم، هەروەها هیوادارم ئەم توژینەوە سادەیە نزمترین ئاستی مەرجەکانی توێژینەوەی زانستیی هێنابێتە دی و شتێکی گرنگ و بەسوودم بۆ نەوەکانی دوای خۆمان پێشکەش کردبێت.

سەبارەت بە شێوەی ڕێکخستنی بابەتەکان کەوا خوێنەر ناونیشانەکانی بە نووسینێکی گەورەرە دەبینێ ئەوا بۆ دە بەند دابەشم کردوە کە بەسەر هەر چوار سەردەمی عەباسیدا دابەشکراوە.

بەندی یەکەم باس لە دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دەکات، کەوا لە خوراسانەوە بەرەو عێراق دەستی پێ کرد، لەپاشماوەی دەوڵەتی خیلافەی ئەمەوی.

بەندی دووهەمی توێژینەوەیەکەش دەربارەی دوو کەسایەتی عەباسی یە: ئەبو عەباسی خوێنرێژو پاشان ئەبو جەعفەری مەنسور– کەوا بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەم دەوڵەتە دائەنرێ. بۆیە منیش باسی هەوڵ و کۆششی هەردووکیانم کردوە لە چەسپاندنی پێی عەباسیەکان لە دەسەڵاتدا و لە ڕووبەڕووبونەوەی ئەو گروپ وتاقمانەی کە لەژێر فەرمانیان دەرچوون، تا ئەوکاتەی کە بە تەواوەتی کارەکە بۆیان یەکلایی بووەوە.

لەبەندی سێهەمدا باسی دوو کەسایەتیم کردووە، (محمدالمهدی) و (موسی الهادی) و هەوڵ و کۆششیان لە تەواو کردنی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی هەردوو خەلیفەی پێش خۆیان.

هەروەها لەبەندی چوارەمدا گرنگیم داوە بە باسکردنی کەسایەتی (هارون ڕەشید) کەوا لە سەردەمی ئەودا دەوڵەت گەیشتە لوتکەی درەوشانەوەی سیاسی و سەربازی، ئەوەش لە میانەی کارەکانی لە کێڵگەی سیاسەتی ناخۆ و دەرەوەدا.

لە بەندی پێنجەمدا باسی کەسایەتی هەریەك لە (ئەمین) و (مەئمون)م کردوە ئەوەش لەمیانەی کارەکانیاندا. ئەوە بوو لەسەردەمی ئەم دووانە دەمارگیری فارسی گەیشتە لوتکەو چووە ناو ململانێیەکی توند لەگەڵ عەرەبدا.ئەمین نوێنەری لایەنە عەرەبیەکان بوو, مەئمون–یش نوێنەری حەزو ئارەزوی فارسەکان بوو، ئەوەش لە میانەی خانەوادەی (بنەماڵەی سەهل)ی فارسی.

سەبارەت بە بەندی شەشەم ئەوا تیشکم خستۆتەسەر دوو کەسایەتی گرنگ، یەکەم (المعتصم) کەوا کۆمەڵێکی نوێی هێنایەناو بازنەی ململانێ نەتەوە پەرەستی بەمەبەستی لە ناوبردنی دەسەڵاتی فارسی، ئەم کۆمەڵەش تورکەکان بوون.

ئەوەبوو لەپاش مردنی ناوبراو، تورکەکان بەسەر دامودەزگاکانی خیلافەتدا زاڵ بوون، پاشان (الوپق) جێی گرتەوە کەوا لەساڵی (٢٣٢ ك / ٨٤٧ ز) کۆچی دوایی کردو بەمردنی سەردەمی عەباسی یەکەم کۆتایی پێ هات.

لەبەندی حەوتەم و هەشتەمدا، باروتۆخی ناوخۆ و دەرەوەی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیم لەسایەی زاڵبونی رەگەزی تورکی بەسەر دامودەزگاکانیدا باسکردووە. ئەوەبوو باروتۆخی لاوازو تێکچووی خیلافەت بووە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوە گەلێکی جیاخواز کە هیواو ئاواتە دەمارگیریەکانیان هێنایەدی لەپێکهێنانی چەند دەوڵەتێکی هەرێمی و پەیوەندی ئەم دەوڵەتانە بە خیلافەت جۆلانەی دەکرد لە نێوان هاریکاریەکی بەسوود و دوژمنایەتیکی سەختدا. رووداوەکانی ئەم دوو بەندە، سەردەمی عەباسی دووەمی پێکهێنا کەوا لە ساڵی (٣٣٤ ك / ٩٤٦ ز ) کۆتایی هات.

لە بەندی نۆهەم پەیوەندی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی بە (بووەیهیەکان)م باسکردووە کەوا ناوی سەردەمی دەسەڵاتی فارسی لێنرا، ئەوەش سەردەمی عەباسی سێهەمە کەوا لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) کۆتایی هات.

بەندی دەیەمیشم تایبەتکرد بۆ ریزکردنی رووداوەکانی سەردەمی عەباسی چوارەم کە بریتیە لە دەسەڵاتی سەلجوقی تورکی. وە پەیوەندی نێوان دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی و تورکە سەلجوقیەکانم روونکردۆتەوە کەوا لەنێوان دوژمنایەتی و هاریکاری کردنی یەکتر جۆلانەی دەکرد.

ئەم سەردەمەش بەروخانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی کۆتایی هات لەساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) لەسەردەستی مەغۆلەکان..

من دڵنیام کە خوێنەر چێژو سوودێکی باش لەم توێژینەوەدا وەردەگرێ، هەروەها لەباسکردنی رووداوەکان بێ لایەنی تیا بەدی دەکات.

داوام ئەوەیە لە خوای گەورە ئەم کارەم لەپێناوی ئەودا بێ، خوێنەری موسڵمان سوودی لێ ببینێ، خوا خۆی بیسەر و فریادرەسە.

بەیروت لە ١٩٩٦/٢/١

د. محمد سهيل طقوش

# سەردەمی عەباسی یەکەم

## سەردەمی بەهێزی و فراوانخوازی و گەشەکردن

## (١٣٢-٢٣٢ك/٧٥٠-٨٤٧ن)

**خەلیفەکانی سەردەمی عەباسی یەکەم و ماوەی خیلافەتی هەریەك لەوان :**

أبوالعباس عبدالله السفاح - (خوێنڕێژ) (١٣٢-١٣٦ك/٧٥٠-٧٥٤ن)

عبدالله أبوجعفر المنصور (١٢٦-١٥٨ك/٧٥٤-٧٧٥ن)

أبو عبدالله محمد المهدی (١٥٨-١٦٩ك/٧٧٥-٧٨٥ن)

أبو محمد موسی الهادی (١٦٩-١٧٠ك/٧٨٥-٧٨٦ن)

أبو جعفر هارون الرشيد (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٩ن)

أبو موسی محمد الامين (١٩٣-١٩٨ك/٨٠٩-٨١٣ن)

أبو جعفی عبدالله المأمون (١٩٨-٢١٨ك/٨١٣-٨٣٣ن)

أبو إسحاق محمد المعتصم (٢١٨-٢٢٧ك/٨٣٣-٨٤١ن)

أبو جعفر هارون الوپق (٢٢٧-٢٣٢ك/٨٤١-٨٤٧ن)

## بەندی یەکەم

## دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

### ڕێکخستنی بانگەشەی عەباسی

دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی تەنها بەیعەت دان نەبوو بە خەلیفەیەك و نەدانی بە یەکێکی تر، یاخود گواستنەوەی دەسەڵات لەئەمەویەکانەوە بۆ عەباسیەکان لەحوکمکردنی موسڵماناندا، بەڵکو ئەم بەسەرهاتە لە گۆڕانکاریەکی ناو خانەوادەی دەسەڵاتداردا زۆر گەورەترە.

بێ گومان شۆڕشی عەباسی و ئەو گۆڕانکاریە بنەڕەتیەی کە لەئەنجامیدا هاتەکایەوە لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا، بە وەرچەرخانێکی گرنگ و یەکلایی کەرەوە دادەنرێ لەم کۆمەڵگەیە کە بە درێژایی سەردەمی عەباسی یەکەمدا پەیوەست بوو پێی.

بێگومان ڕێکخستنی بیروباوەڕی لەماوەی ئامادەکاری بۆ شۆڕش سەلماندی کە ئەم کارە نیشانەی بلیمەتی و زیرەکیە لە گەڵاڵەکردن و ڕێکخستندا. عەباسیە یەکەمینەکان ڕێبازێکیان دانا لە ڕێکخستنی نهێنی کە دوایی بووبە نموونەیەك پەیڕەو دەکرا. هەندێ لەو دەوڵەتانەی کە لەسایەی خیلافەتی عەباسیدا هەستان پەیڕەویان کرد، وەکو (فاطمي)یەکان، سەرەڕای ئەو بزوتنەوە نهێنیانەی کە لەوڵاتانی موسڵماندا سەریان هەڵدا, وەکو (قرمطي)یەکان, جا ئەم ڕێکخستنە لەسەر نهێنییەکی ڕەها هەڵدەستێت. ئەوان لەئەنجامی ئەو کارەساتانەی کە لەسەردەمی ئەمەویدا بەسەر (ئەل البيت) بنەماڵەی پێغەمبەر داهات, ئەم شێوازە نهێنییەیانە پەیڕەو کرد و ئەوەی کە دەوڵەتی ئەمەوی بە ئەنقەست کردی لە لەناو بردنی بزوتنەوەی عەلەوی و بە تایبەتی ڕابەرەکانی، بە شێوەیەك کە جارێکی تر نەتوانن هەستنەوە سەر پێ.

بانگەشەکە نهێنی لە ڕێگەی کەسێکەوە دەکرێت لە (ال البيت) کە جڵەوەی ئەم بزووتنەوە نهێنییانە بەڕێوە دەبات و چاودێری ئەم ڕێکخراوانە دەکات، وە ئاڕاستەو

سەرکردایەتی نەقیب و بانگخوازەکان دەکات(١).

وە لەم ڕێکخراوە نهێنییە ئیمامەت (واتە پێشەوایەتی) ڕادەستی بنەماڵەی عەباس کرا، لەقۆناغێکی زۆر گرنگدا[١].

هەروەها ئیمام (موحەمەدی کوڕی عەلی) عەباسی (١١٨ – ١٢٥ك)، کەوا بانگەشەی عەباسی ڕادەستی کراو هەوڵی دەدا خیلافەتیش بەدەست بێنێ، زانی کە گواستنەوەی مافی ئیمامەت لەبنەماڵەیەکەوە بۆ بنەماڵەیەکی تر دەبێ گەلاڵە کردنی بیرۆکەو ئامادەکردنی دڵ و دەروونەکانی لەپێشدا بێت بۆ ئەوەی بارودۆخی نوێ لەلای خەڵکی پەسەند بکرێ، بۆیە بەوریاییەوە داوای لەشوێنکەوتووانی کرد خەڵکی بانگهێشت بکەن بۆ لایەنگری (ال البیت) بێ ئەوەی ناوی کەسیان بێنێ.

لەبارەگای خۆی لە (حەمیمە) دەستیکرد بە ڕێکخستنی بانگەشەکە و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی و ناردنی بانگخواز و نەقیبەکان بۆ ناوچە گونجاوەکان کە گرنگترینیان خۆراسان بوو، ئەوەش لە ڕێگەی تۆڕێکی نهێنی کەچەندین بازنەی هەبووە و ناوی ((دعوەی ال البیت – بانگەشەی ئەهلی بەیت)) ی هەڵگرتووە، جا شاردنەوەی تەماحیشی بۆ بەدەستهێنانی خیلافەت لەبەرچاو گرتووە. بەم کارەش

---

[١] عەباسیەکان چیرۆکێك دەگێڕنەوە، بەم چیرۆکەش خیلافەت بە مافی شەرعی خۆیانی دەزانن، کەوا ئەبو هاشم – ڕابەری شیعەی کەیسانی، ڕووی کردە دیمەشق لە سەر بانگهێشتی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی خەلیفە، بە جوانی پێشوازی لێکرد و ڕێزی لێنا، خەلیفە کە ناوبراوی بینی زمانپاراو و بە سام و خاوەن زانستە، ئیرەیی پێبرد، و ترسێکی لا دروست بوو، چونکە زانی شیعە حزبێکی ڕکابەرە بۆ بنەماڵەی ئومەییە، بۆیە ژەهر خواردی کرد. ئەبو هاشم-یش کە زانی ژەهر خوارد کراوە و دەمرێ، جا ئەوکاتە نزیکی شاری (الحمیمة) بوو، ڕووی تێکرد و لەگەڵ – عەلی کوڕی عەبدوڵای عەباسی کۆبووە و پێ وت کە ئەو ئەمرێ و ئامۆژگاری کرد، مافی خۆی لە ئیمامەت بە ئەودا و جڵەوی بانگەشەکە کەیسانی-شی ڕادەست کرد، ناوی بانگخوازی بانگخوازەکانی خۆی لەشاری کوفەو ئەو بانگخوازانەی کە لەدوایەوە دێن، پێدا، نامە گەلێکی پێدا بۆ ئەوەی بیانداتێ. بە پێی ئەم ماف پێدانە هەمو ئەو پلان و پڕوپاگەندە نهێنیە کە هی شیعەی کەیسانی بوو بۆ (عەلی کوڕی عەبدوڵلا ی عەباسی و (موحەمەدی کوڕی) لەپاش خۆی، مایەوە، ئەمەو ژمارەیەك لە مێژوو نووسان تکۆڵی لەم بەسەرهاتە دەکەن و بە ڕاست دای نانێن.

بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم بابەتەوە بگەڕێوە بۆ :- ابن اثیر ب ٤ ل ١٥٩٧، و بەراوردی بکە بە - ابن طقطقا ((الفخري في الاداب السطانية و الدول الاسلامية)، ل ١٤٢٧، کە تێیدا هاتووە : کەوا ئەم کەسەی بانگهێشتی ئەبو هیشامی کردووە (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) بووە . العبادي، أحمدمختار : في التاريخ العباسي و الاندلسي ل ١٩٢-٢١. العمرو، علي عبدالرحمن : أثر الفرس السياسي في العصر العباسي الاول: ل ٨٢-٨٣.

زۆر لەلایەنگرانی بانگەشەکەی هەڵخەڵەتاند، چونکە ئەوان پێیان وابوو کار بۆ نەوەی (عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب) دەکەن. جا لێهاتوویی و شارەزایی ئەو، لەنەخشە و پلانێکدا دەرکەوت کە بۆ ئەو ڕێکخراوە نهێنیە داینا، کەوا لەسەر گەلێ دروشمی پڕوپاگەندەیی هەستابوو کە ناوەندی بانگەشەکە هەڵی دەبژارد لەگەڵ ئەو شارانەی کە تێدا بانگەشە دەکرا، هەروەها بارەگای بانگخوازەکانیش دیاری دەکات، پیشەکانیان، شێوەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکدا.

سەبارەت بە ناوەندی بانگەشەکە، ئەوا (حەمیمە)ی هەڵبژارد، بەهۆی گرنگی شوێنە جوگرافیەکەی چونکە دەکەوێتە سەرهێڵی کاروانە بازرگانیەکان و ڕێگەی حەج، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە شوێنەکەی دوورە لەگۆڕەپانی سیاسیەوە.

سەبارەت بەدروشمەکانیان ئەوە بانگەشەی بۆ یەکسانی و ڕازیبوون لە(ال محمد) و چاکسازی دەکرد، ئەم دروشمانەش هۆکارێك بوو بۆ سەرکەوتنی بانگەشەکە، ئەوەش لە ڕێگەی :

- ئاوێتەبوونی ئەو گەل و نەتەوانەی کەوا بوون بە موسڵمان بەدەوڵەتی ئیسلامی.
- مسۆگەرکردنی گردبوونەوەی تاڵبیەکان لەدەوروبەری بانگەشەکە.

سەبارەت بەو شارانەی کە بانگەشەکەی تیا دەستی پێ بکات، ئەوا (موحەمەدی کوڕی عەلی) فەرمانی بە بانگخوازەکاندا جەخت بخەنە سەر خۆراسان. ئەمەش لە ڕووی مێژووییەوە مانای ئەوەیە، کە عەرەب و مەوالیی ([1]) جەنگاوەر و جەنگ نەکەری لەخۆ گرتووە. وادیارە ئەو هەستی کردبوو بە گرژبوونی بارودۆخەکە لەخۆراساندا و نزیکبوونی تەقینەوەی بە هۆی ململانێی هۆزایەتی و بێزار بوونی مەوالیەکان، بۆیە وای بینی (مرو)، کە شارۆچکەیەکە لەخۆراسان، شوێنێکی گونجاوە بۆ ڕاکێشکردنی لایەنگرانی بۆ سوپای شۆڕش، بەوەش سەلماندی کە ئەو بەتەواوەتی لەڕەوشی سیاسی تێگەیشتووە و بەباشی لایەنگرە سیاسیەکانی لە هەرێمە ئیسلامیەکاندا

[1] بگەڕێوە بۆ ئامۆژگاری ئیمام بۆ بانگخوازەکانی سەبارەت بە دیاریکردنی خۆراسان وەکو ناوەندێك بۆ بڵاو کردنەوەی بانگەشەکە لەلای – المقدسی، أحسن التقاسيم في معرفة الاقاليم – ل ٢٩٢-٢٩٤.

دابەش کردووە([1])

ئەوەی کە گومانیشی تێدا نیە ئەوەیە کە ئەم راگوێزراوانە زەمینەیەکی باشیان بینی لە هەرێمەکانی فارسدا بۆ بڵاو کردنەوەی بیرۆکەکانیان دەربارەی پێشەوای چاوەڕوانکراو (مەحەمەدی مەهدی)، چونکە مەوالیە فارسەکان هێشتا وا هەستیان دەکرد پێویستیان بەفەرمانڕوایەکی ڕەها هەیە کە کومەڵێ سیفاتی هەبێ دەر ئاسا بێ و مرۆڤێکیتر نەبیێت وەکو چۆن ڕاهاتبوون لەکاتی (کیسرا) دا، وەکو ئەوەی لەناو کۆمەڵگەی ساسانیدا باوبوو لەبیروکەی مافی خۆدایی بۆ پاشاکان، کەوا دەسەڵات بۆ بنەماڵەی پادشا دەمایەوە و نابێ بگوازرێتەوە بۆ بنەماڵەیەکی تر. جا پەیوەندی باشی نێوان خۆراسان و نێوان کوفە و بەسرە، ئەم دوو شارەش ناوەندی ڕاکێشکردنی – گالبی – کانە، هۆکارێك بوو بۆ چەسپاندنی ئەو بیرو بۆچوونانە –کە دژی ئەمەویەکاندایە– لەناخی خەڵکی فارسدا، بۆیە بانگەشەی عەباسییان پەسەند کرد تا لە دەسەڵاتی ئەمەویەکان رزگاریان بێ و بە ئومێدی ئەوەی دەسەڵاتە دێرینەکەیان بگەڕێننەوە کەوا موسڵمانەکان هەڵیان وەشاندەوە، ئەوە بوو زورێنەیان پەرۆش بوون بۆ پشتگیری کردن لە هەر شۆرشێك دژ بە ئەمەویەکان بکرێ.سەبارەت بە هۆکارەکانی پشت بەستنی عەباسیەکان بەفارسەکان و بەدەنگەوە چوونی ئەمان بڕوان بگەڕێرەوە بۆ: العمرو :سەرچاوەی پێشوو ١١٠ – ١١٥

و سەبارەت بەدیاریکردنی بارەگا بۆ بانگخوازەکان ئەوا ئیمام (موحەمەدی کوڕی عەلی) عباسی (کوفە)ی کردە بارەگا بۆیان، چونکە ئەم شارە خەڵکەکەی ناسراون بە پشتگیری کردنیان لە ئەهلی بەیتی پێغەمبەر. شارەکەش گونجاوە بۆ ئەوەی ببێتە ئەڵقەی گەیاندن لە نێوان هاشمیەکان لە (حەمیمە) و گۆڕەپانی بزوتنەوەکە لە (مرو)، ئەوەش بەهۆی پشتگیری کردنیان لە شۆڕش و بەرهەڵستی کردنیان لە ئەمەویەکان.

---

[1] ئەوەی راست بێ بانگەشەی شیعی کەوا بە ناوی (ال البیت)ەوە هەستا و کەوا بانگەشەی بۆ – طالبي – یەکان دەکرد کە جێگرەوەی سروشتین بۆ پێغەمبەر. خوراسانی بە زەمینەیەکی باش زانی بۆ پەرەسەندنی. چونکە هەر لە رۆژانی – زیاد بن ابیە – ئاوارە کردنی ژمارەیەکی زۆر لە شیعەکان دەستی پێکرد لە کوفە و بەسرەوە بۆ ناوچەی (بلخ) لە خوراسان. تا رۆژانی (حجاج بن یوسف الثقفي) بەردەوام بوو.

هەروەها موحەمەدی کوڕی عەلی تەمێی بانگخوازەکانی کرد بازرگانی بکەن بۆ ئەوەی بانگەشەکەیان لەدەسەڵات بشارنەوە و تەمێی کردن بە جوانی و دانایی بانگەشە بکەن. ئابەم شێوەیە بانگەشەی عەباسی، سەرکردەیەکی شاز و بانگخوازی دڵسۆز و زەمینەیەکی لەباری بۆ رەخسا.

## قۆناغەکانی بانگەشەی عەباسی

### بانگەشەکە عەباسی بەدوو قۆناغی گرنگدا تێپەڕبوو:

**قۆناغی یەکەم:**

ئەم قۆناغە لە سەرەتای سەدەی دووهەمی کۆچی دەستپێدەکات و بەهاتنی ئەبو موسلیمی خۆراسانی بۆ ناو بانگەشەکە کۆتایی پێ دێت، ماوەی نێوان دوو ساڵی (١٠٠ – ١٢٨ ك /٧١٨ –٧٤٦ ز) دەگرێتەوە.

بانگەشەکە لەم قۆناغەدا کۆمەڵێ تایبەتمەندی هەبووە، نهێنیەکی تەواوەتی، پەیڕەو نەکردنی شێوازی توندوتیژی، ئەمە لەکاتێکدا دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی هێشتا خۆی گرتبوو.

بانگەشەکە لەعێراقدا، سێ بانگخواز ڕێکیان خست: ئەوانەش (مەیسەرە لعەبدی) کە مەولای عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەلعەباس بوو، (بکیری کۆڕی ماهان) کەوا بە یەکێك لەبانگخوازە گرنگەکانی عێراق دائەنرێت، (ئەبو سەلەمە لخەلال) کەوا لە پێنج ساڵی کۆتاییدا سەرکردایەتی بانگەشەکە کرد، پێش ئەوەی بنەماڵەی عەباس دەسەلات بگرنە دەست.

سەبارەت بە خۆراسان، ئەوا بانگەشەکە لە سەرشانی کومەڵێ بانگخواز هەستا، ناودارترینیان: (ئەبو عیکریمە لسەراج) بوو کە مەولای ئیبن عەباس بوو، (موحەمەدی کوڕی خونەیس) و (حەیان لعەتار) و (کەسیری کوفی) و (خەداش لبلخی) و نەقیبی نەقیبەکان (سولەیمانی کوڕی کەسیر الخوزاعی).

وادیارە دەسەڵاتی ئەمەوی بەدەنگوباسی بانگەشەکەی زانی، جا بانگخوازەکانی ڕاونا و هەندێکیشیانی کوشت، هەروەها هەندێکیشان بوونە قوربانی توندڕەوی خۆیان وەکو (خەداش لبلخی).

ئیمام (موحەمەدی کوڕی ئەلعەباس)یش، کە بانگەشەکەی تایبەتکرد بۆ خۆی، ئەوا گۆڕانکاریەکی ستراتیجی گرنگی ئەنجامدا لە ناوەڕۆکی، جا ئەمەشی بۆ بانگخوازەکانی ئاشکرا کرد، کەوا ئەم کارە تەنها تایبەت بێ بەوان.

ئیمام موحەمەد لەساڵی (١٢٥ ك / ٧٤٢ ز) کۆچی دوایی کرد، لەپاش ئەوەی

بانگەشەکە ماوەیەکی دوورو درێژی بڕی، لە دوای خۆی تەمێی کرد ئیمامەت ڕادەستی ئیبراهیمی کوڕی بکرێ.([1]).

قۆناغی دووهەم :

ئەم قۆناغە بە هاتنی ئەبو موسلیم بۆ ناو بانگەشەی عەباسی دەستپێدەکات، تاساڵی (١٣٢ ك /٧٥٠ ز) بەردەوام بوو، ئەمەش ئەو ساڵەیە کە دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی تێدا ڕوخا و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دامەزرا.

لەپاش مردنی موحەمەدی کوڕی عەلی بانگەشەی عەباسی هاتە لەرزە لەرز بە هۆی سەرهەڵدانی چەندین بزوتنەوەی شیعی لەخۆراساناو جیابوونەوەیان، جا ئیمام ئیبراهیم ترسا جڵەوی کارەکان لەدەستی دەرچێ و ئەم بزوتنەوانە بانگەشەکەی ڕامالێ.

بۆیە هەوڵیدا گوێڕایەڵی عەرەبە خۆراسانیەکان – بەتایبەتی – بگەڕێنێتەوە، لەرێگەی دەسەلاتی کەسی خۆیەوە توانی (سولەیمانی کوڕی کەسیر لخوزاعی)ی ڕابەریان بۆ لای خۆی ڕاکێشی، ئەمیش توانی پەیوەندی نێوان کۆمەڵەی خۆراسانی و سەروکایەتی لە (حەمیمە)دا، بگەڕێنێتەوە.

بانگەشەکە لەم قۆناغەدا ناسرا بە (بەکارهێنانی هێز بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی).

ئەوە بوو لە دوای بەرفراوان بوونی یەکەی ڕێکخراوەکەی و قووڵبوونی ڕەگ وریشەی لە کۆمەڵگەی خۆراسانیدا، پێویستی بە سەرۆکێك هەبوو ئاستی بەرز بێ و بە توانا بێ، تا سەرپەرشتی کاروباری بانگەشەکە بکات و پلان بۆ جموجوڵەکانی داهاتوو دابنێ.

ئیبراهیمی ئیمام پۆستی سەرکردایەتی خستە ڕوو بۆ نەقیبی نەقیبەکان (سولەیمانی کوڕی کەسیر)، جا کابرایەکی بە ساڵا چوو بوو، بەڵام قایل نەبوو و داوایی لێبوردنی کرد ([2])، پاشان خستەیە ڕوو بۆ (ئیبراهیمی کوڕی سەلەمە)، ئەویش داوای

---

[1] ابن کثیر، ب ١٠ –لا ٥

[2] کاتێك سەرکردایەتی کردنی بانگەشەکە خرایە ڕوو بۆ سولەیمانی کوڕی کەسیر وتی، (ئەنانەت سەرکردایەتی دوو کەسیش

لێبوردنی کرد (❀)، ئەو جا هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەینا و ئەبو موسلیمی خۆراسانی وەکو نوێنەرێك بۆ خۆی هەڵبژارد لە خوراساندا (❀) و ئەرکی سەرکردایەتی پێ سپارد و ناردی بۆ ئەوێ. (❀)

هەڵبژاردنی ئەبو موسلیم هەنگاوێکی سەرکەوتوو بوو و سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو لە ڕاپەراندنی بانگەشەکە و بوژاندنەوەی، چونکە ناوبراو کاروباری ناوخۆراسانی– کەوا لە ڕووی هۆزایەتیەوە تێکچوو بوو– بەڕێوە دەبردو جەماوەرو دەسەڵاتێکی باشی هەبوو لەناو فارسەکاندا، بۆیە ئەبو موسلیم لەلایان متمانە پێکراوتر بوو لە عەرەبێکی ئازاد. جا ئەو نامەیەی کە ئیمام ئیبراهیم ناردی بۆی، کاتێك کردی بەکاربەدەست لەخۆراسان، باسی ئەوەی دەکرد کە بەدەستهێنانی پشتیوانی عەرەبە یەمانێکان بەردی بناغەیەو کلیلی سەرکەوتنە ([1])، ئەوە بوو کاروباری عەباسیەکان لەخۆراساندا سەقامگیر بوو لەئەنجامی هەوڵ و کۆششە سیاسی و سەربازیەکانی ئەبو موسلیم، ئەم پیاوەش بەو ئەزموون و شارەزاییەی کە هەیبوو توانی ببێتە ئەو بانگخوازە عەباسیەی کە هەموو ڕۆژهەڵات کۆنترۆل بکات، بە تایبەتی لەپاش ئەوەی متمانەی سولەیمانی کوڕی کەسیری بەدەست هێنا ([2])

ئەمەو چوارساڵی دوایی لەژیانی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی (۲۱۹–۱۳۲ك/۷٤٦–

---

ناکەم) ، ابن الاثير ب ٤ لا ٢٩٥

❀ ئیبراهیم پاساوی ئەوەی هێنایەوە کە لەئەو شایستەتر هەیە. هەمان سەرچاوە.

❀ ڕیوایەتە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە رەگ و ریشەی ئەبو موسلیم فارسیە. مەولایەکی فارسیە ناوی راستەقینەی (بازوان)ە. لە کوفە بنچینەکانی بانگەشەکەی خوێند و توانی سەرنجی بانگخوازەکانی راکێشێ. بۆیە بردیان بۆلای ئیمام ئیبراهیم ، ناوبراویش زیرەکیەکی لەرادەبەدەرو ئیرادەیەکی بەهێزی لێ بینی و دڵنیابوو کە کەسێکە پشتی پێ دەبەسترێ. سەبارەت بە رەگ و ریشەی ئەبو موسلیم و سەرەتای ژیانی. بگەڕێوە بۆ: (الطبري): ب٧ لا١٩٨ – ١٩٩. الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد. ب ١٠ [illegible] ١٠٧ – ١٠٨ ابن خلكان: وفيات الاعيان. ب ٣ لا ١٤٥ – ١٤٦.

❀ ابن خلكان: هەمان سەرچاوە [illegible] ١٤٧.

[1] بگەڕێوە بۆ دەقی [illegible] لەلای (الطبري): ب [illegible] لا ٣٤٤. شایانی باسە هەندێ لە مێژوونوسەکان نکوڵی دەکەن لە هەبوونی جۆرە ئامۆژگاریەکی ئاوەها. وە ئەمە لەلایەن دوژمنانی شۆرشی عەباسی هەڵپەسێردراوە تا شێوەو ئامانجەکانی تێکدەن و عەرەبەکان دژی هەڵگەڕێننەوە چونکە ئامۆژگاری دەکات بە لەناوبردنی رەگەزی عەرەبی. بەڵام ڕوداوەکان هەندێ لە ناوەرۆکی نامەکە دووپات دەکاتەوە بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە بەدەستهێنانی یەمانیکان و کارکردنیان دژ بە هۆزی (مضر).

[2] محمود، حسن احمد و الشريف، احمد ابراهيم : العالم الاسلامي في العصر العباسي لا ٤٨–٤٩

٧٥٠ز) گەشەکردنێکی خێرای بە خۆوە بینی کە ڕەگ و ڕیشەی دەوڵەتی عەباسی پێکهێنا و بەشێوەیەکی گشتی ڕۆڵی ڕەگەزی عەرەبی لاوازبووەوە لەئەنجامی ئەو ململانێ و پەرتەواز بوونەی کە لەئارادا بوو، لاواز بوونی ئەمەویەکان بەشێوەیەکی تایبەت و تیرۆرکردنی ناودارەکانی ڕژێمی ئەمەوی. دەرکەوتنی هێزو قەوارەی نوێ لەپاشماوەی شەڕەکاندا دوو قۆناغی بە خۆوە بینی : قوناغی ئەبو موسلیمی خۆراسانیو قۆناغی قوحتوبەی کوڕی شەبیب، کە بەدامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی کۆتایی هات.

**قۆناغی ئەبو موسلیمی خۆراسانی:**

ئـەبوموسـلیم لـەپـاش گەیـشتنی بـۆ خۆراسـان دەسـتبەجـێ لـە (بلـخ) دابـەزی و بەماوەیەکی کورت متمانەی سولەیمانی کوڕی کەسیری بەدەستهێنا، پاشان بە ژیری و دانایی کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد، ئەوجا کەوتە گەڕان بەناو گوندەکانی ڕۆژهەڵاتـداو هـانی خەڵکـەکـەی ئـەدا پـشتگیری لـەبانگەشـەکە بکـەن و سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەستهێنا لەم کارەدا، ئەوەش لەمیانـەی بیرخـستنەوەیـان بـەو زۆر وسـتەمـەی کـە لەژێر سایەی دەسەڵاتی ئەمەویدا چەشـتیان، بـەڵێنی پێـدان بیانکاتـە کاربـەدەست و زەویان پێ بدات، هەروەها توانی دەهاقینە و گوندنشینەکانیش بەلای خـۆی ڕاکێـشێ، ئەوەش بە نزیکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی لە بیروباوەڕی میلی، بەتایبـەت ئـەوەی کە پەیوەندی بە مەزهەبی (تناسخ الارواح – کۆپی کردنـی ڕۆحـەکـان) هوە هەیـە ([1]) پاشان هۆزەکانی عەرەبی یەمـەنی هێنایە پـاڵ خـۆی و خـەڵکی – تقـادم – یش کـە ناسراون بە بەرهەڵستکاریان بۆ ڕژێمی ئەمەوی هاتنە پاڵی.

ئەبو موسلیم کە دڵنیابوو بانگەشەکە بەهێز و بڵاوە، ڕاپـۆرتێکی بـۆ سـەرکردایەتی لە(حەمیمە) بەرزکردەوە، ئیمام موحەمـەدی کـوڕی ئیبراهیم–یش لەلایـەنی خۆیـەوە دەستپێشخەری کـرد و بـەرواری دانـا بـۆ دەسـتپێکردنی جموجـوڵ و چـالاکیـەکانیان، ئەوەشی لە بەرچاو گرت کە ڕەوشی ناوخۆی بانگەشـەکە بـەهێـزە و ڕەوشـی نـاوخۆی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی خراپە.

لەڕۆژی پێـنج شـەممە لـەبیـست و پێنجی (مـانگی ڕەمـەزان، سـاڵی ١٢٩ك/مـانگی حـوزەیـران، سـاڵی ٧٤٧ز) شـۆڕش ڕاگـەیـەنرا لـەسـەر دەسـتی (سـولەیمانی کـوڕی کەسیر). شیعە عەباسیەکانیش پشتی ئەبو موسلیم–یان گرت و ڕەنگی ڕەشیان کـردە دروشمـی خۆیـان لـە جـل و بـەرگ و ئـاڵا و بـەیداخـەکانیانـدا، هـەر بۆیـە ناسـران بـە (المسودە – ڕەشگەرەکان).([2])

لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، لە (سفیذنج) یەکەم نوێژ کرا بۆ لایەنگرانی عەباسیکان

---

[1] ابن أعثم : أبو محمد أحمد : كتاب الفتوح ب ٤ لا ٢٤٨. بارتولد، تركستان من الفتح العربي الي الغزو المغولي : لا ٢١٤

[2] ابن أعثم : ب ‌ لا٢٤٨

([1])، بۆیە پرسەکەیان ئاشکرا بوو. هەر دەبوو ڕوبەڕوی هێزەکانی ئەمەوی ببنـەوە بـۆ دیـاریکردنی هەڵویـستی سیاسـی و سـەربازی. ئـەبو موسـلیم شـێوازی ئاوێتـەکردنـی سیاسـەت و هێـزی سـەربازیی پـەیڕەو دەکـرد، بـەمەبەسـتی کـەرتکردنـی هێزەکـانی خۆراسان، بەگژ یەکتری دانیان تا یەك ڕیز و یەك دەنگ نەبن و نەبنە مەترسی لەسـەر بانگەشەی عەباسی. بـەزیرەکـی و شـارەزایی خـۆی تـوانی دوژمنایـەتی بهێڵێتـەوە لـە نێوان فەرمانڕەوای ئەمەوی لەخۆراساندا (نەسری کوڕی سـەیار)و نێـوان ناحـەزەکانی، دەستی خستەناو دەستی (جەدیع کرمانی) و پاشان (عەلی)ی کوڕی هەروەها (شەیبان لحروری)یش بۆ ڕوخاندنی ئەمەویەکان، ئەوجا تۆوی دووبەرەکی لەنێوان فـەرمانڕەوای ئەمەوی و سەرۆك هۆزەکاندا چاند. لەکۆتاییدا شەیبان لحروری و هەر دوو کـوڕەکـەی جەدیع کرمانی، عەلی و عوسمان—ی لەناوبرد.

ئابـەم شـێوەیـە ئـەبو مـسلیم لـەگـەل سـەرجەم بـەرەی هێـزە سیاسـیەکاندا ([2]) دەجوڵایەوە، سەرکەوتوو بوو لە چنینی بەرهـەمی هـەوڵ و کۆششەکەی، ئـەوەش بـە لەناوبردنی نەیارەکانی و بەتەنها حوکمی خۆراسانی کرد، نەسری کوڕی سـەیاریش بـۆ (نیسابور) هەڵهات ([3]).

ئەبو موسلیم هەر کە پێی جێگیر بوو لـەو ناوچـانـەی زاڵبـوو بـە سـەریاندا، کەوتـە کوشتنی ئەو ڕابەرە گەورانەی کە ڕکابەرییان دەکرد لەسەر سـەرکردایەتی. ئـەوە بـوو نـەقیبـەکـان (سـولەیمانی کـوڕی کەسـیری خـوزاعی)، کوشـت، هـەروەهـا موحەمەدی کوڕیشی لەناوبرد ([4]) و هەندێ لـە لایـەنگرانی شۆڕشـەکەشی لـەنـاو بـرد، ئەوانەی کەوا بەشداربوون لەگەڵیدا لە کاری سیاسی و سەربازی.

---

[1] الطبري : ب ■ ■ ٢٥٧

[2] سەبارەت بەو سیاسەتەی کە ئەبو موسلیم پەیڕەوی دەکرد وە کەوا جێگیری کرد ■ بەڕێوەبردنی خۆراسان، بگەڕێوە بۆ : ابن أعثم : ب ٤ ■ ٣٢٨، ٢٤٨-الطبري : ■ ٧ ٧ ٢٥٥، ٢٦٧، ٢٧٧، ٢٨١.

[3] الطبري هەمان سەرچاوە : ■ ٢٧٧-٢٨١.

[4] شایانی باسە کوشتنی - سلیمان بن كثير ڕوویدا بەبێ گەڕانەوە بۆ خەلیفەیان پرسکردن بەمیر ئەبو جەعفەر ■ لەوکاتەدا لە خۆراسان بوو. بگەڕێوە بۆ : عمر : سەرچاوەی پێشوو ٧ ٨١

بەوەش گۆڕەپان چۆڵ بوو بۆ ئەبو موسلیم و بوویە تاکە فەرمانڕەوای وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات و نازناوی میری (ئال موحەمەد) ی ([1]) بۆ خۆی هەڵبژارد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو تەنها فەرمانڕەوای هەرێمێك نیە، بەڵکو زیاترە.

تواناو لێهاتوویی ئەبو موسلیم لە ڕووی سەربازی و سیاسی و کارگێڕییەوە لەکاتی جەنگی خۆراساندا دەرکەوت، ئەو توانا گەورەیەی کەوا کردی بە یەکێك لە سەرکردە مەزنەکانی عەباسی.

ئەم پیاوە لەپاش ئەوەی نزیکبووەوە لە دانیشتووە خۆماڵیەکانی وڵات، بوویە ئەو هیوا و ئاواتەی کە خوازیاری بوون، وەکو کەسێکی بەهێزو لێهاتوو تەماشایان دەکرد بۆئەوەی پلەو پایەیان بگەڕێنێتەوە، کەلتووری دێرینی فارس زیندوو بکاتەوە، دەشتوانرێ ئەمە بەسەرەتای دەرکەوتنی (بەرمەکی و تاهیری و بوویەهی) یەکان دابنرێ، بەوەش بنچینەی دەوڵەتی خۆراسانی دانا.

---

[1] الطبري : ب ۷ -- لا ۲۸٦-۲۸۸.

## قۆناغی قوحتوبەی کوڕی شەبیب

هێشتا شۆڕشی عەباسی بەتەواوەتی لەخۆراساندا جێگیر نەبوو، هێشتا سەرکردایەتی ئامادە نەبوو بۆ ئاراستەکردنی لێدانی کۆتایی بۆ (نەسری کوڕی سەیار) کەوا بەناچاری ڕووی کردۆتە نیسابور لەگەڵ ئەو عەرەبانەی کە لایەنگری بوون لە هۆزەکانی (تەمیم و بەکرو قەیس)، سەرکردایەتی کارە سەربازیەکان لە (ئەبو موسلیم)ەوە بۆ (قوحتوبەی کوڕی شەبیبی تائی) گۆزرایەوە، ئەوەش بەفەرمانی ئیمام ئیبراهیمی کوڕی موحەمەد([1]) وادیارە سەرکردایەتی بالآ لە(حەمیمە)، پەرۆش بوو بزانێ لەدوای خۆراسان چی ڕوو دەدات، پێی باش بوو ئەبو موسلیم لەچوار چێوەی سنووری خۆراسان دەرنەچێ، دەبێ کارە سەربازیەکان لەناوچە عەرەبیەکاندا ڕادەستی سەرکردەیەکی عەرەبی بکرێ.

(قوحتوبە) ناوچەی (طوس) و (نیسابور)ی([2]) کۆنترۆڵ کرد، نەسری کوڕی سەیاریش لەلایەن خۆیەوە زانی کە بەرگریکردن و گەڕانەوەی دەسەلآت مەحاڵە، لە (نیسابور)ەوە بۆ (ڕەی) هەڵهات ([3]).

حکومەتی ناوەندی لەدیمەشق بەم گۆڕانکاریە خێرایەی خۆراسان زارە ترەك بوو، بۆیە، لەشکر لەدوای لەشکری دەنارد بۆ لەناوبردنی ئەو شۆڕشە، بەلآم شکستی هێنا. جا شارەکانی ئەسفەهان و نەهاوەند و هیتریش ([4]) خۆیان ڕادەستی شۆڕش کرد و ڕێگە بۆ عێراق لەبەردەم سوپای شۆڕش کرایەوە. نەسریش لە (ڕەی) مرد، لەکەشێکی نالەبار و نادیاردا بەبێ ئەوەی لە یەك شەڕ سەرکەوێ([5]) جا ئەمەویەکان بەمردنی ناوبراو سەرکردەیەکی گەورەیان لەکیس چوو کە ئەم ململانێ خوێناویەیانە بۆ بەرێتە ڕێوە، بۆیە بە نەرێنی کاریکردە سەر دۆزەکەیان.

(قوحتوبە)یش لە کەشێکی پڕ لەسەرکەوتندا بەسوپاکەی بەرەو (کوفە) چوو،

---

[1] هەمان سەرچاوە :لا ٣٨٨.

[2] الطبري : لا ٣٨٩-٣٩٠.

[3] هەمان سەرچاوە : لا ٣٩٠ ابن أعثم :ب٤ لا٣٥٣.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو:لا ٤٠٥ -٤٠٨ الیعقوبی :تاریخ الیعقوبی ب ٢ لا ٢٧٥

[5] ابن اعثم : ب ٤ لا ٣٥٣

هاوكات (يەزيدى كوڕى هوبەيرە) فەرمانڕەواى عێراق، بەرەو ڕووى ئەو بەڕێ كەوتبوو، شەڕێك لەنێوانياندا بەرپابوو بە سەركەوتنى (قوحتوبە) كۆتايى هات. (هوبەيرە) بەناچارى بۆ شارى (واست) پاشەكشێى كردو خۆى لەوێ حەشاردا. بەڵام (قوحتوبە) نەژيا تا ئەنجامى كۆتايى ببينێ، چونكە لەكاتى پەڕينەوەى لەڕووباردا، خنكا ([1]) وە (حەسەن)ى كوڕى جێى گرتەوە لەو هێرشە سەركەوتووە و (لەچواردەى مانگى موحەڕەم ساڵى ١٣٢ك/٧٤٩ز) چووە ناو (كوفە)وە و (ئەبو سەلەمە لخلال)ى وەكو سەرۆكى بانگخوازەكانى عێراق و وەزيرى (ال محمد) ناساند، بووە خاوەن دەسەڵاتى راستەقينە. ([2])

بەمەش چارەنوسى عێراق بڕيارى لەسەر درا : جا سەقامگيرى شۆڕش لەم وڵاتەدا، لەپاش وڵاتەكانى ڕۆژهەڵات، دەستكەوتێكى مەزن بوو، وە ئەگەرى ئاشكرا بوونى بانگەشەكەى زۆر نزيك كردەوە، تا خۆراسانيەكان رابەرى خۆيان بناسن لە (ال محمد)([3]).

[1] هەمان سەرچاوە :لا ٣٥٧. اليعقوبي ب ٢ لا ٢٧٧

[2] هەمان دوو سەرچاوە

[3] محمود والشريف :سەرچاوەى پێشوو لا ٦٤٥

## بەرزبوونەوەی بنەماڵەی عەباس لەدەسەڵاتدا

ئـەبو موسـلیم زانیـاری تـەواو و بـەردەوامی هـەبوو دەربـارەی ئـەوەی لـەعێراقـدا ڕوودەدات، ئەوەش لە ڕێگەی نوێنەرە سیاسیەکەی (ئەبو لجەهمی کوڕی عەتیە) کـەوا لەگەڵ سوپاکەی (قوحتوبە) بوو و خاوەن دەسەڵات بوو بەسـەر هێـزە چـەکدارەکان. جا ئەبوسەلەمەش دانی پێنا و ڕازی کرد لەو پلە سیاسیەیدا بێ.

سەبارەت بە (ئەبوو سەلەمە) ئەوا بەرپرسی کوفە بوو وەکو (وەزیرێکـی ال محمـد) ([1])، ئەمەش پلەو نازناوێکە تازە داهێنرابوو ([2]).لەمیانەی سروشتی ئەو ئەرکانـەی کـە ئەنجامی دەداو ئەو بەرپرسیارێتیەی درابوو بەسەر شانی لەم مـاوەیـەدا، ئـەوەمان بـۆ دەردەکەوێ کە ئـەو خـاوەن دەسـەڵاتی تـەواوەتی بـووە. هـەموو لایـەنگرانی شـۆڕش دانیان بەم دەسەڵاتەیە دەنا، بەڵام دەسەڵاتی تەواوەتی نەبوو بە سەر سوپادا، بـەڵکو بەدەستی – ئەبو لجەهم – مایەوە.

پاش ئەوەی کە لایەنگرانی شۆڕش لەعێراقدا زاڵبوون بـەسـەر بارودۆخەکـە، کـاتی ئەوە هات کەسێك لە – ال محمد – هەڵبژێردرێ کەوا شۆڕشـەکـە بـە نـاوی ڕاگـەینرا، ناوی (ئیمام ئیبراهیم)یش باو وبڵاو بوو. ناو بڵاوی ئەم ئاشکرای کرد و ئاسانکاری کرد بۆ (بنەماڵـەی ئومەیـە) پەیوەنـدی نێـوان خـۆی و شـۆڕش بدۆزنـەوە. بۆیـە (مـەڕوانی دووهـەم) دەسـتگیری کـرد و خـستیە نـاو زینـدانی (حـەڕان)ەوە، پاشـان لـە(مـانگی موحـەڕەم سـاڵی ١٣٢ك/ مـانگی ئـەیلول سـاڵی ٧٤٩ز)، کوشـتی ([3])، ڕیوایەتـەکانیش ئەوە دووپات دەکەنەوە کە (ئیمام ئیبراهیم) هەواڵی مردنـی بـە بنەماڵـەو کـەسوکاری خۆیدا، کاتی دەستگیرکردنی و خیلافەتی ڕاسپارد بە (ئەبو لعەباس عەبـدوڵلای کـوڕی موحەمەد) ی برای و کردی بە خەلیفە لەدوای خۆی، فەرمانی پێکردن لەگەڵیا بڕۆن بۆ کوفە، پێش مردنی هاوەڵەکانی بەم هەڵبژاردنە ئاگادار کردەوە. ([4])

---

[1] الطبري: ب ٧ لا ٤٥٠.

[2] شعبان، محمدعبدالحي:الثورة العباسية لا ٢٥٧

[3] الدينوري : الاخبار الطوال لاثترة ٢٥٢-٢٥٣. اليعقوبي : بةشي ٢ لاپەرە ٢٧٤. اخبار الدوله العباسيه:نووسەرەکەی نەناسراوە لاپەرە ٣٩٢.

[4] الطبري :ب ٧ لا ٤٢٣.

کە بنەماڵەی عەباس گەیشتنە کوفە، ئەوەش لەپاش چوونە ناوەوەی سوپای شۆڕش، (ئەبو سەلەمە) لەماڵی (ئەلوەلیدی کوڕی سەعد) کە مەولای (بنەماڵەی هاشم)ە، پێشوازی لێکردن و تەمێی کردن خۆیان بشارنەوە. تا نزیکەی چل شەو باسی نەکردن لای هیچ سەرکردەیەکی شیعی، ڕازیش نەبوو خەرجی گواستنەوەیان پێ بدا ([1])، لەهەمان کاتدا بۆ ڕابەرانی (ال البیت) لەبنەماڵەی (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) نوسی کە ببنە فەرمانڕەوای براواداران بەکۆمەڵێ مەرجی دیاریکراو ([2]). وادیارە ئەو نیازی هەبوو کارەکە ڕادەستی بنەماڵەی (عەلی) بکات کاتێك هەواڵی مردنی (ئیمام ئیبراهیمی کوڕی محمد)ی پێ درا، بەڵام داوای لێبوردنیان کرد لە پەسەند کردنی بانگەشەکە ([3]).

بۆمان هەیە بپرسین: ئاخو ئەو هۆکارو پاساوانەی (ئەبو سەلەمە) چین تا خیلافەت بگوازێتەوە بۆ بنەماڵەی (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب)؟ ئەوجا ئەور مەرجانە چین کە داینا بۆ وەرگرتنی ئەم پۆستە ؟

وادیارە وەزیری (ال محمد) ڕاسپاردەکەی (ئیمام ئیبراهیم) بۆ عەباسی برای بەهەند وەرنەگرت، یا خود بەلایەنی کەمەوە، بۆچوونی وا بوو کە عەباس شیاوترین کەس نیە لە هاشمیەکان بۆ فەرمانڕەوی باوەڕداران.

بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نیە، ئەم پیاوە لەژێر فشاری ڕوداوە سیاسیە فرە ئاڕاستەکان بووە، ناوبانگترینیان لایەنی عەلەوی و لایەنی خوراسانی و لایەنی نەتەوەیی فارسی شاراوە، بۆیە پێویستی دەکرد لەسەری کەسێك هەڵبژێرێ لای هەموو لایەنەکان پەسەند بێ، بە تایبەتی هەر لەسەرەتاوە بۆچوونی جیاواز پەیدا بوو لەلای دوو لایەنی یەکەم، عەلەوی و خوراسانی، دەربارەی دەسەڵاتەکانی ([4]).

---

[1] هەمان سەرچاوە : لاپەرە ٤٣٠.

[2] ابو سلمة – نووسراوەکەی بۆ – جعفر الصادق و عبدالله المحض و عمر الاشرف – نارد، هەمووشیان لە حیجاز بوون.

[3] سەبارەت بە ناردنی نووسراوەکان بۆ ئەم ڕابەرانە و کاردانەوەیان لەسەری بگەڕێوە بۆ : الیعقوبی: ج٢ ل٢٨٢- ٢٨٣. ابن الطقطقا: ل١٣٧- ١٣٩.

[4] تالبیەکان داوایان کرد ■ ئیمامەکە هەر خۆی (امیرالمومنین)یش بێ. ئەمەش ئەوە ■ دەگەیەنێ کە فەرمانڕەوا خاوەن

لەهەڵگەڕانەوەی (ئەبو سـەلەمە) بـۆ لای (بنەماڵـەی عـەلی) دەگەیەنـە ئـەوەی کـە ناوبراو لـە میانـەی بـارودۆخی سیاسـی دەوروبـەری و لـە پێـشبینیەکانی بـۆ ئاینـدە، تێگەیشت کە ناتوانێ لەسایەی حوکمی عەباسیدا ئاواتـە سیاسـیەکانی بـەدی بـێنێ. وادیارە ئەو نوێنەرایەتی هەندێ لەرابەرە خۆراسانیەکانی فـارس بـوو، کـەوا مـەیلێکی نەتـەوەیی شـاراوەیـان هـەبوو، بۆیـە ویـستی کارەکـە رادەسـتی (تاڵبیـەکان) بکـات بەشێوەیەك کە خۆی ببێتە خـاوەن چاکـەی گواسـتنەوەی دەسـەڵات بۆیـان بـەشـکو ئامانجەکانی بێنێتەدی کە بریتی بوو لەزیندووکردنەوەی ئاواتە نەتەوەییەکانی فـارس. ([1])

لەئـەنجامی ئـەم جیاوازییـە لـەتێـڕوانینی سیاسـی و بیروبـاوڕی، (ئـەبو سـەلەمە) نزیکەی دوو مانگ سەرقاڵی ئەوە بوو (ال محمد) ڕازی بکات تا لەلای هەمووی پەسەند بێت، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە ڕازی بێ ئەم پۆستە وەرگرێ بەو مەرجانـەی کە خۆراسانیەکان داینـاون کەوا مەحاڵ بوو کەسێك هەبێ بەم پێشنیارە ڕازی بێ، بۆیە ڕابەرانی (ال البیت) ڕازی نەبون. ([2])

سەرەنجام خۆراسـانیەکان پـاڵێوراوی عەباسـی خۆیـان (ئـەبو لعـەباس عەبـدوڵلای کوڕی موحەمەد) سەپاند وەکو مـیری بـاوڕداران، لـەڕۆژی هـەینی (دوانـزەی مـانگی – ربیع الاخر– ساڵی ١٣٢ك /مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ٧٤٩ ز) ([3]) بەیعـەتی پێـدرا بـۆ خیلافەت، شایانی باسە بـەرواری خیلافەتەکـەی لـەپاش کوشـتنی (مـەروانی دووهـەم) دەست پێ دەکات کە دواین خەلیفەی ئەمەویەکانـە، سـێ ڕۆژی مـابوو لـەمـانگی –زی الحجە– لـەسـاڵی ١٣٢ك، ڕێکـەوتـی مـانگی تـەمموزی سـاڵی ٧٥٠ز، ئەمـەش بـەرواری

---

خاوەن دەسەڵاتی دینی و سیاسی بێ لە هەمان کاتدا. بەڵام بۆچوونی خۆراسانیەکان ئەوە بوو دەبێ هەیکەلی سیستەمی سیاسی پێشوو لە ڕەگ وڕیشەی بگۆڕدرێ بە جۆرێك کە (امیرالمومنین) دەسەڵاتێکی دینی دیاریکراوی هەبێت بێ دەسەڵاتی سیاسی.

سەبارەت بەم بابەتە بگەڕێوە بۆ : شعبان، سەرچاوەی پێشوو ■ ٢٥٨.

[1] العمرو : سەرچاوەیەکی پێشوو، لاپەرە ١٤١.

[2] شعبان : ل ٢٥٨– ٢٥٩.

[3] ابن کثیر : ب ١٠ ل ٥٢.

دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسیە.

(ئەبو سەلەمە)ش کەوا کارەکە بەبێ ئاگای ئەو تەواوکرا، هیچی بەدەستەوە نەما جگە لەوەی ڕازی بێ وپاساو بێنێتەوە بۆ هەڵوێستی خۆی لەبەردەمیان: (من ویستم ئەم کارە ڕاست و دروست بێ، ئەگینا هیچ ئیشێکی لێ ناکەم).([1])

وادیارە (ئەبو موسلیم) ڕاوێژی پێ کراوە پێش ئەنجامدانی ئەم کارە و ڕازیش بووە لەسەری، بە بەڵگەی ئەوەی (ئەبو لجەهم)ی نوێنەری هەوڵێکی لەبەر چاوی داوە لەهەڵبژاردنی (ئەبولعەباس).([2])

[1] الیعقوبی ، ب ٢ لا ٢٨٢. الگبری ، ب ٣ ٣ ٤٢٠

[2] الطبري، هەمان سەرچاوە ، لا ٤٢٩-٤٣١.

## ڕووکارە گشتیەکانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە سیاسیەت گەلێکی ڕۆژهەلاتی ڕوونی پەیڕەوکردو ڕووی کردە خۆراسان کە بێشکەی پەیدا بوونێتی، ئەم ڕووکردنە لەخۆراسانیش چەندین هۆکاری لەپشتەوە بوو، گرنگترینیان:

- دژایەتی کردنی خەڵکی شام بۆ عەباسیەکان، چونکە هێشتا لە سەر دڵسۆزی و پشتیوانیان بۆ ئەمەویەکان مابوونەوە- -گوێزانەوەی پایتەخت لە دیمەشقەوە بۆ بەغداد

- کاریگەری فارس لەسەر سیستەم و ژیانی عەباسی.

- بوژانەوەی بازرگانی لەولاتەکانی ڕۆژهەلات.

دوورکەوتنەوەی دەوڵەتی عەباسی لەجیهانی دەریای سپی ناوەڕاست.

- بایەخ نەدانی عەباسیەکان بەدروستکردنی گەلە کەشتی (اسطول)ێکی دەریایی هاوشێوەی گەلە کەشتی ئەمەویەکان.

ئەوەی کە گومانی تێدانیە گوێزانەوەی خیلافەت لە ئەمەییەکانەوە بۆ عەباسیەکان گۆڕانکاریەکی ریشەیی و گەشەکردنێکی بەرفراوان و قووڵ لەهەموو بوارەکانی ژیانی ئیسلامی لەگەڵیدا هاتە کایەوە، ئەمەش لە ڕووکارە گشتیەکانی خیلافەتی عەباسی بەدی دەکراو بەگوێزانەوەی پایتەخت لەدیمەشقەوە بۆ بەغداد دەستی پێکرد، بەوەش جۆرە هەنگاوێکی نا لەبەجێهێشتنی جیهانی بێزەنتی و ڕووکردن لە جیهانی فارسی.

ئەمەو ئەو چالاکی و جموجوڵە سەربازییەی کە سەردەمی ئەمەوی لەبەرەی ڕۆژئاوا لەجیهانی دەریای ناوەڕاست بە خۆی بینیبووی، پاشەکشێی کرد، عەباسییەکان وەکو سنورێك بۆ دەوڵەتەکەیان تەماشای ڕۆخی ئەم دەریایەیانە دەکرد، کە دەبێ بەرگری لێ بکەن نەك هێرشی لێوە بکەن. وە لەئەنجامی ئەم پاشەکشێ کردنە، میرنشینە ئیسلامیەکان لەمەغریب و ئەندەلوس بەرپرسیارێتی بەرگریکردن لەحەوزی ڕۆژئاوای ئەم دەریایەیانە گرتە ئەستۆ.

بە شێوەیەکی گشتی عەباسیەکان ڕوویان کردە ڕۆژهەلات. لەتورکستان مەترسی

هاتنی (چینی)یەکان بۆ سەر وڵاتی موسڵمانانیان وەستاند، پاشان پەیوەندییان لەگەڵ جیهانی چینیدا بەهێزو پتەو بووەوە، بەتایبەتی پەیوەندی بازرگانی، هەروەها لەهەرێمی سند موسڵمانان بڵاو بوونەوە و دەسەڵاتی ئیسلامییان لەوێ جێگیرکرد.

هێزی دەریایی ئیسلامیش لە زەریای هند پەرەی سەند و ڕۆڵێکی بازرگانی باشی پێشکەش کرد، ئەمەش دەرفەتی ڕەخساند بۆ بازرگانی هند بە بێ ترس بچێتە ناو بازارەکانی عێراقەوە، هەروەها ڕێگەشی کردوە لەبەردەم ڕۆشنبیریەتی هندی، ڕێکەوتنی عەباسیەکان لەگەڵ چینیەکاندا بووە هۆی کرانەوەی بازارەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور لەبەردەم بازرگانیەکی ئاڵوگۆڕکراوی دەوڵەمەند، هەروەها ڕێکەوتنی عەباسیەکان لەگەڵ پادشاکانی فەرەنجە دەرفەتیدا بازرگانیان پەرەبسێنێ و بگەیەتە ڕۆژئاوای ئەوروپاو باکوری ڕۆژئاوای، بەڵام زیاتر بایەخیان بە ڕۆژهەڵاتدا. گوێزانەوەی پایتەخت و گرنگی نەدان بەکاروباری ڕۆژئاوا، لاوازبوونی دەسەڵاتی عەباسی لەمەغریبی ئیسلامی لێکەوتەوە، لەئەنجامیشدا لایەنەکانی ڕۆژئاوا جیا بوونەوە لە دەسەڵاتی ناوەندی، ئەوە بوو ئەندەلوس لەسەر دەستی (عەبدولرحمان داخل)ی ئەمەوی جیابووەوە، مەغرەبیی ئەوپەڕیش لەسەر دەستی ئیدریسیە عەلەویکان جیابووەوە، (بنەماڵەی روستەم)یش – خەواریجە ئەبازیەکان– مەغریبی ناوەڕاستیان جیاکردەوە، عەباسیەکانیش تەنها دەوڵەتێکیان وەکو بەربەست دامەزراند کە لایەنگریان بێ لە مەغریبی نزیک، ئەوەش دەوڵەتی ئەغالیبەکان بوو.

دەوڵەتی عەباسی گەشەکردنێکی دیکەی بەخۆوە بینی. سیاسەتیان لەگەڵ ئایندا کۆکردەوە، لەم لایەنەشەوە ئەوان جیاوازن لە ئەمەویەکان کەوا تۆمەتی (بایەخدان بە بەرژەوەندی دنیایی)یان پێکرا، بۆیە وایان ڕاگەیاند کە دەیانەوێ سونەتی پێغەمبەر زیندوو بکەنەوە و دادگەریی بچەسپێنن. دەورووبەری خۆیان پڕکرد لە زانا و فەقێ، عاباکەی پێغەمبەریان لەبەر کرد (درودی خوای لەسەر بێت) وەکو نیشانەیەك بۆ دەسەڵاتە دینیەکەیان، وە بیرۆکەی (ئیمامی مەهدی)یان قۆستەوە و بووە دروشمی دینی و سیاسیان، پشتیان بەست بە بیردۆزی (ئیمامەت) کەوا تەوەری بیروباوەڕ و بانگەشەکەیان بوو. ئەم سیاسەتە دینیەش کە خیلافەتی عەباسی پەیڕەوی دەکرد

پیرۆزیەکی پێ بەخشی و وای لێهات کە گوایە دەسەڵاتی خەلیفە لەخوای گەورەوە وەرگیراوە ([1])، چەمکی خیلافەت وەکو مافێکی خودایی لێهات لە حوکمڕانیدا، کەوا لەسەردەمی ساسانیەکاندا باو بوو.

خەلیفە عەباسیەکان پەیڕەوی هەندی نەریتی فارسیان دەکرد وەکو : قۆرخ کردنی دەسەڵات، دانانی دەرگاوان لەبەردەم کۆشکی خیلافەت، هاتنە دەرەوە بەپاسەوان و دارو دەستەیەکی زۆر، لەئەنجامی ئەوەشدا کاری (الحجابە – دەرگاوانی) هاتە ئاراوە. هەروەها شێوازێکی تایبەت پەیدابوو بۆ سڵاو کردن لەخەلیفە وەکو : خۆدانەواندن، ماچکردنی زەوی و کەناری جل وبەرگ. بەمەش عەباسیەکان سەرپێچی دابونەریت و رەفتاری عەرەبیان کرد کە ناسراوە بە لێبوردەیی و ئاسانکاری. هەروەها ژیانی خەلیفەکان و شێوازی کارکردنیان و شێوەی حوکمڕانیان بەفارسەکان کاریگەر بوو و مۆرکی ئەوانی پێوە دیار بوو، دابونەریتی دیوانی فارسی زاڵبوو بەسەر سیستەمی ئیدراییاندا، هەروەها کۆشکەکانیان پڕ بوو لە خزمەتکار و کەنیزەك.

کاریگەریەکی تری فارسی هاتە ناو سەردەمی عەباسیەوە، ئەوەش پۆستی وەزارەت بوو. ئەوە بوو لەڕووی جلوبەرگ و پسپۆری و ناولێنانەوە وەزیر مۆرکێکی نوێی بەخۆوە بینی کە پێشتر نەزانرابوو. تێبینی ئەوەش دەکرێ کە زۆربەی وەزیرەکانی خیلافەتی عەباسی لەبنەماڵەی فارسی بوون، وەکو (بەرمەکیەکان و بنەماڵەی سەهل و بنەماڵەی تاهیر و بنەماڵەی فورات و بنەماڵەی خاقان و هیتر). وەزیرو نووسەرو پیاوانی دەوڵەتیش دابونەریتی دێرینی فارسییان پەیڕەو کرد لەکارکردن و پەیام نێریدا.

---

[1] بگەڕێوە بۆ دەقەکەی ئەبوجەعفەری مەنسور لەلای – إبن کثیر ب ١٠ لا ١٢٢-١٢٣

## دابەشكردنی مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

دەوڵــەتی خیلافــەتی عەباســی نزیکــەی (٥٢٤) ســاڵ حــوکمی کــردووە (١٣٢-٦٥٦ك/٧٥٠-١٢٥٨ن)، بــە ئــەبو لعەباســی خوێنرێــژ دەســتی پێکــردو بــەمردنــی (المستعـصم) کۆتــایی پێهــات، کــەوا لــەســەر دەســتی مەغۆلــەکان لــەناوچــوو. لــەم ماوەیەشدا توانای دەوڵەت و هێزی خیلافەت وەك یەك نەبووە.

مێژوونووسەکان دەوڵەتی خیلافەتی عەباسییان بۆ چوار سەردەم دابەش کردووە، بەپێی تواناکانی دەوڵەت و گەشەکردنی بارودۆخی و پەرەسەندنی ژیانی رۆشنبیری و هزری، کە بریتیە لە:

سەردەمی یەکەم :

بریتیە لە سەردەمی هێز و فراوانخوازی و گەشە کردن (١٣٢-٢٣٢ك/٧٥٠-٨٤٧ن)

سەردەمی دووهەم :

بریتیە لە سەردەمی دەسەڵاتی تورکی (٢٣٢-٣٣٤ك/٨٤٧-٩٤٦ن)

سەردەمی سێهەم :

بریتیە لە سەردەمی دەسەڵاتی بووەیهی فارسی (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٦-١٠٥٥ن)

سەردەمی چوارەم :

بریتیە لە سەردەمی دەسەڵاتی سەلجوقی تورکی (٤٤٧-٦٥٦ك/١٠٥٥-١٢٥٨ن)

## سەردەمی عەباسی یەکەم : ١٣٢–٢٣٢ك/٧٥٠–٨٤٧ز

ئەم سەردەمە بەخیلافەتی ئەبو لعەباسی خوێنڕێژ دەستی پێدەکات و بە خیلافەتی (الوثق) کۆتایی پێ دێت، خیلافەت لەم سەردەمەدا بەهێز بوو و سەربەخۆییەکی تەواوەتی هەبوو، دەسەلاتی بالا لە دەوڵەت بەدەستی خەلیفەکان بوو کەوا توانایەکی کەسی وسیاسی و کارگێڕی بێ وێنەیان هەبوو، توانیان پارێزگاری لە یەکگرتوویی ولات بکەن و ئەو ئاشوب و شۆڕشانە کپ بکەنەوە کە روبەڕویان بووەوە.

فارسەکان لەم سەردەمەدا پلەوپایەیەکی بەرزیان هەبوو لە دەوڵەت، دەسەلاتی بەرفراوانیان کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەئاراستەکردنی سیاسەتەکانی، سەرئەنجام زاڵبوون بەسەر هەردوو دەزگای ئیداری و سەربازی لەبەغداد و ئەو هەرێمانەی کە سەر بە ئەو بوون، جا ئەوانیش مشتیان توند کرد لەسەر سەرکردایەتی سوپاکان و پۆستە ئیداریە گەورەکان وەکو وەزارەت و نووسین و فەرمانڕەوایەتی شارەکان ([1]).

تاکەکانی سوپاش پارمەتیدەر بوون بۆ خیلافەت و دەزگایەکی گوێڕایەڵ بوون بەدەستی خەلیفەکاندا. ئەم ڕۆڵەشیانە بە نەمانی ئەو جۆرە خەلیفانە کۆتایی هات کەوا سەرکردایەتی لەشکرەکانیان دەکرد و پێشمەرگە بوون و بۆ خۆشگوزەرانی ملکەچ نەدەبوون. ئەم سەردەمە درەوشاوەش ئەم خەلیفانە نوێنەرایەتیان دەکرد : (أبو العباس – المنصور – المهدی – الهادی – الرشید – الامین – المعتصم والواپق).

---

[1] الزاهريي، محمد بن مسفر : نفوذ السلاجقة السياسي في الدولة العباسية لا ١٤.

## سەردەمی عەباسی دووهەم : (٢٣٢-٣٣٤ک/ ٨٤٧-٩٤٦ز)

ئـەم سـەردەمە بـەخیلافـەتی (ئەلموتـەوەكل) دەسـتی پێـدەكات و لەسـەردەمی (ئەلموستەكفی) كۆتایی دێت، لـەم سـەردەمەدا خیلافـەت لاواز بـووەوە و وردە وردە سـامی نـەما، بـەشـێوەیـەك كـە میرنـشینەكانی دەوروبـەر بـەبـێ تـرس پلانیـان بـۆ جیابوونەوە دانا. توركەكان لەم سەردەمەدا مشتیان توند كردبوو لەسـەر دەزگاكانی دەوڵەت. هەر لەسەردەمی (ئەلموتەوكل)ەوە دەوڵەت بەرەوە بێ هێزی دەچوو بەهۆی زیادبوونی دەسەلاتی توركەكان. ئەم كۆدەتایە لەدەسەلاتی عەرەبیەوە بۆ دەسـەلاتی تـوركی، دیاردەیـەك بـوو لـەدیاردەكـانی شـۆرش كـەوا زۆربـەی بەشـەكانی خیلافـەت هەستیان پێ كردبوو، لەئەنجامدا دەسەلاتی خەلیفەی لاواز كردو دواتر نەما.([1])

خەلیفەكان لـەم سـەردەمەدا زیـاتر لاواز بوونـەوە بـەهـۆی گـەورە بـوونی مەترسـی دەوڵەتە سەربەخۆكان كەوا لە جەستەی خیلافەت جیابوونەوە. ئەوەبوو پشتی (عـەلی كوڕی بوەیە) لەفارسدا بەهێز بووەوە. (رەی و ئەسفەهان) و شاخەكانیش كەوتـە ژێـر دەستی (ئەلەحسەنی كوڕی بوەیە)ی بـرای. (حەمـدان) یـەكانیش موسـڵ و دیـاربكر و دیار رەبیعەو (مچر)یان بۆ خۆیان جیاكردەوە، (موحەمەدی كوڕی تغجی ئەخشید)یش (میـسر و شـام)ی بـۆ خـۆی جیـاكردەوە، (نەسـری كـوڕی ئەحمـەدی سـامانی)ش خۆراسانی زەوت كرد.

لەئەنجامی ئەوەش قەبارەی دەوڵـەتی خیلافـەت بـچووك بـووەوە، خەلیفـەكانیش هیچیان بەدەستەوە نەما جگە لە عێراق و چەند ناوچەیەك لەفـارس و ئـەهوازدا. بـەلام ئەم هەرێمانەی كە باسكران ئاشوب و ئاژاوەی تیا بـەرپابوو. لەكۆتاییـدا كارەكـە وای لێهـات كۆیلـەیـەكی تـوركی یـاخود دێلـمی حـوكمی بـەغـداد بكـات كـە نـاوی (مـیری میرەكان)ی لێنرا، كەوا دەسەلاتێكی تەواوەتی و رەهـا و گـشتی هـەبوو، خەلیفـە هـیچ شتێكی بەدەست نەبوو.([2]).

---

[1] Lane - Poole,s. ihstory of Egypt in the middle ages: p ٢٩

[2] الخضري : الشيخ محمد : الدولة العباسية: لا ٤٨٤.

بەلام لەماوەی نێوان دوو ساڵی (٢٥٦–٢٩٥ك) خیلافەت بەشێکی زۆری لەدەسەلاتەکەی هێنایەوە کە سەردەمی ئەم خەلیفانە دەگرێتەوە : ئەلموعتەمەد، (المعتضد)، ئەلموکتەفی، ئەم ماوەیەش ناوی (رابوونی خیلافەت)ی لێنرا.([1]).

ئەم سەردەمە، واتە سەردەمی عەباسی دووهەم، ئەم خەلیفانە نوێنەرایەتیان دەکرد : – المتوکل، المنتصر، المستعین، المعتز، المهتدی، المعتمد، المعتچد، المکتفی، المقتدر، القاهر، الراچی، المتقی و المستکفی، کەوا بنەماڵەی بووەیهی کرد بەدەسەلاتدار لەسەردەمی خۆیدا.

---

[1] الزهراني : لا ١٤

## سەردەمی عەباسی سێهەم : ٣٣٤-٤٤٧ك/ ١٠٥٥-٩٤٦ز

ئەم سەردەمە لەخیلافەتی (ئەلموستەکفی)ەوە دەستپێدەکات و لەخیلافەتی (ئەلقائم) کۆتایی دیت، ئەم سەردەمە پەیوەست بوو بە مێژووی بووەیهیەکان کەوا خاوەن دەسەلاتی ڕاستەقینە بوون لەعێراقدا. خەلیفەش هیچی دەسەلاتی بەدەستەوە نەبوو جگە لە ناوداری، بەڵکو وەکو کارمەندێکی لێهات لەلایان، بەگوێرەی بەرەکەی خۆی قاچی ڕائەکێشا، مافی نەبوو دەست لەکاروباری خیلافەتدا وەر بدات ئەگەر پرسیان نەکات ورازی نەبن لەسەری.

خەلیفە لەم سەردەمەدا دەسەلاتی لەدەست دا، فەرمانی پێ ئەکرا و ئەویش جێبەجێ دەکرد، هیچ دەسەلاتێکی دینیشی بەسەریاندا نەبوو، چونکە مەزهەبیان جیاواز بوو، ئەوان شیعەیەکی توندڕەو بوون، پۆستی خیلافەتیان تەنها لەبەر خزمەتکردنی ئامانجەکانیان هێشتبووەوە.

(بەیرونی) بەم دەستەواژەیە وەسفی ڕەوشی عەباسیەکان دەکات لەڕۆژانی (بنەماڵەی بوەیە)دا: ((دەوڵەت و دەسەلات لە دوارۆژەکانی (ئەلموتەقی) و ڕۆژانی یەکەمی (ئەلموستەکفی)دا لەبنەماڵەی عەباسیەوە گوازرایەوە بۆ بنەماڵەی بوەیهی، ئەوەی کە مابوو لە دەستی دەوڵەتی عەباسی بریتی بوو لە کاری ئاینی بیروباوەڕی نەك موڵکێکی دنیایی)). ([1]).

ئەم سەردەمەش ئەم خەلیفانە نوێنەرایەتیان دەکرد: المستکفی – المطیع – الطائع – القادر و القائم.

---

[1] البیرونی، ابوالریحان : الاثار الباقیة عن القرون الخالیة :لا ١٣٦

## سەردەمی عەباسی چوارەم : ٤٤٧- ٦٥٦ك/١٠٥٥-١٢٥٨ز

ئەم سەردەمە لەخیلافەتی (ئەلقائم)ەوە دەسپێدەکات و بەمردنی (ئەلموستعصیم) کۆتایی پێ دێت، لەم سەردەمەدا دەسەلآتی راستەقینە کەوتە دەستی سەلجوقیە تورکەکان کەوا لە ولآتە شاخاوییەکان نیشتەجێ بوو بوون. ڕەوشی خیلافەت لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا باشتر بوو بەراورد بە ڕەوشیان لەکاتی دەسەلآتی بنەماڵەی بوەیهدا، ئەوان ڕێزی خەلیفەکانیان دەگرت وەکو هەستێکی دینی چونکە سونی مەزهەب بوون، گەورە رایان ئەگرتن لەبەر پۆستە دینیەکەیان، خەلیفەکان لەم سەردەمەدا لەسەر یەك شێواز نەبوون لەتوانا و هەڵسوکەوت کردنیان، ئەوان لەسەردەمی (ئەلموستەرشد)دا دەستیانکرد بە هێنانەوەی هەندێ دەسەلآتی راستەقینەی خۆیان، لەسەردەمی (ئەلموقتەفی)یشدا سەربەخۆیانە حوکمڕانی بەغدادو شوێنەکانی دەوروبەری کرد، لەسەردەمی (ئەلناصر)دا دەسەلآتی خۆیان گەڕانەوەو سەربەستانە حوکمڕانی عێراقیان کردو شەست و شەش ساڵ مانەوە و ملکەچ نەبوون بۆ هیچ دەسەلآتێك، تا ئەوکاتەی کە مەغۆلەکان دەستیانکردە جموجۆڵێکی بەرفراوان بەرەو ڕۆژئاوا و شانشینەکانیان داگیر کرد و شارەکانیان وێران کردو گەیشتنە بەغداد، ئەوە بوو داگیریان کردو خیلافەتی عەباسییان روخاند.

ئە م سەردەمەش ئەم خەلیفانە نوێنەرایەتیان دەکرد : القائم، المقتدی، المستظهر، المسترشد، الراشد، المقتفی، المستنجد، المستضیء، الناصر، الظاهر، المستنصر، المستعصم.

ڕوونترین جیاوازی لەنێوان سەردەمی یەکەم و سەردەمەکانیتر لەژیانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا، دەرکەوتنی رەگەزێکی نوێ بوو کە بریتیە لەرەگەزی تورکی، گۆڕینی خیلافەت لەمەرکەزیەت بۆ نامەرکەزیەت لە سیستەمی حوکمڕانیدا، لەئەنجامی دامەزراندنی کۆمەڵێ دەوڵەتی سەربەخۆ، چ سەربەخۆییەکی تەواوەتی بێ یاخود ( حکم زاتی) بێ لەگەڵ دانپێنان بەدەسەلآتی خەلیفە.

فارسەکانیش جموجوڵ و چالاکیان بۆ ڕۆژهەلآت گواستبووەوە لەپاش ئەوەی دەسەلآتی تورکەکان سەرکەوتن و توانیان کۆمەڵێ دەوڵەتی سەربەخۆ لەهەندێ

لەهەرێمەكانی دەوڵەتی عەباسی دامەزرێنن. جا دەوڵەتی (تاهیر)یەكان لەخۆراساندا دامەزرێنرا (٢٠٥-٢٥٩ك/٨٢٠-٨٧٢ن)، (یعقوب بن اللیپ الصفار) یش لەپاشماوەی دەوڵەتی تاهیری دەوڵەتی (سەفاری) دامەزراند (٢٦١-٣٨٩ك/٨٦٧-٩١١ن)، (سامان)یەكانیش لەپاشماوەی دەوڵەتی (سەفاری) دەوڵەتی خۆیان دامەزراند ( ٢٦١-٣٨٩ك/٨٧٤-٩٩٩ن)، لە كۆتاییەكانی سەدەی چوارەمی كۆچی روخان، واتە دەیەمی زایینی، (غەزنەوی) یەكانیش جێگەیان گرتەوەو دەوڵەتی (غەزنەوی)یان دامەزراند (٢٥١-٥٨٢ك/٩٦٢-١١٣٦ن)، (بوەیهی)یەكانیش زاڵ بوون بەسەر فارس عێراق و ئەهواز و كرماندا و دەوڵەتی (بوەیهی)یان دامەزراند.

(٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٦-١٠٥٥ن)، توركە سەلجوقیەكانیش دەوڵەتی (بویهی)یان لەناوبرد لەعێراقداو (گغرلبك)ی سەلجوقی چووە ناو بەغدادەوە و جیای كردەوە و دەسەڵاتی خۆی دامەزراند لەپاشماوەی دەسەڵاتی بویهیەكاندا.

## بەندی دووهەم

# ئەبو لعەباسی خوێنرێژ – ئەبو جەعفەری مەنصور

## ١٣٢–١٣٦ك/ ٧٥٠–٧٥٤ز

### ناساندنی ئەبو لعەباس

عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی عەباسی، ئەبو لعەباس نازناوەکەیەتی.([1]). لەساڵی (١٠٥ك/٧٢٣ز) لە (حەمیمە) لە دایکبووە لەخاکی (الشراه) لە (بلقاء) لەشامدا، لەوێش پەروەردە بووە.([2]). ڕۆژی هەینی دوانزەی (مانگی – ربیع الاخر – ساڵی ١٣٢ك / مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ٧٤٩ز) بەیعەتی یان پێدا و خیلافەتی پێ سپێردا لەکوفە. ([3])

تێبینی ئەوەش دەکرێ کە لەیەکچوونێك هەیە لەنێوان ناوی ئەبو لعەباسی خوێنرێژ و ناوی ئەبو جەعفەری مەنسور (عەبدوڵڵای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەلی عەباسی)، بۆیە، مێژوونووسان نازناوی عەبدوڵڵای (الاصغر)یان بۆ خەلیفەی خوێنرێژ دانا (واتە بچووك). ([4])، چونکە تەمەنی لە مەنسوری برای بچووکتر بوو.

وەکو نەریتێکی پەیرەوکراو لەلایەن خەلیفەکانەوە لەکاتی هەڵبژاردنیاندا، ئەبو لعەباس لەمزگەوتی کوفە وتارێکی خوێندەوە، تێیدا ئامانجی هەڵگیرساندنی شۆڕشی عەباسی ڕوونکردەوە، ناتەواوی و کەموکوڕی ئەمەویەکانی دەرخست و بەزەوتکەرانی خیلافەت وەسفی کردن، پەیمانیشی بەکوفیەکان دا کەوا پاڵپشتی شۆڕشەکەیان کرد، مووچەکانیان زیاد بکات و بیری خستنەوە کە ئەو : ((خوێنرێژە و شۆڕشگێڕە)). ([5])

---

[1] الیعقوبی :ب ٢ لا ٣٦٢

[2] البغدادي، الخطیب : تاریخ بغداد ب ١٠ لا٤٦–٤٧. ابن کثیر: ب ١٠ لا ٥٢.

[3] بگەڕێوە بۆ لا : ٢٥.

[4] العبادی : لا ٤١.

[5] بگەڕێوە بۆ دەقی وتارەکە لەلای – الطبري – : بەشی ٧ لاپەڕە ٤٢٥–٤٢٦. وادیارە لێرەدا مەبەست لە (السفاح – خوێنرێژ) دەستبڵاوە کەهەیانە بە بەڵگەی ئەوەی ئەم وشەیە لە نێو وەسفکردنی خەڵکی کوفە و زیاد کردنی مووچەکانیان هات. ئەمەش لەگەڵ مانای دەستبڵاوی و بەخشیندا. واتە : ئەو دەستبڵاو و بەخشەرە لەگەڵ هاوڕێکانی و شۆڕشگێڕێکی نازایە لەگەڵ دوژمنەکانی. شایانی باسە وشەی (السفاح) لەڕووی زمانەوانیەوە کۆمەڵی مانا لە خۆ دەگرێ لەوانەش : خوێنرێژ

ئەبو لعەباسی خەلیفە لەکوفە نشتەجێ بوو، واش دیارە ئەو بۆی دەرکەوت کە کوفە بارودۆخێکی دەگمەن و جیاوازی هەیە ئەوەش بەهۆی پشتگیری نەکردنی زۆربەی دانیشتووانەکەی لەشۆڕشی عەباسی، جا لەشوێنکەوتووانی ئیمام عەلی بوون، بۆیە خەلیفە بۆ شوێنێکی نزیکتر باری کرد ناسراو بوو بە (هاشمیە الکوفە)، بەلام زۆری نەخایاند لەوێش باری کرد بۆ ئەنبار کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی کوفە لەسەر رووباری فورات لەسالی (١٣٤ك/٧٥١ن)، لەتەنیشتیدا شارێکی بۆ خۆی دروست کرد ناسرا بە (هاشمیە الانبار) کەوا تیایدا نشتەجێ بوو تا مردنی لەسالی (١٣٦ك/٧٥٤ن).[1]

ئەبو لعەباس زۆربەی ماوەی خیلافەتی بەجێگرکردنی دەسەلاتەکەی بەسەر برد، ئەوە بوو ڕوبەڕوی ئەو سەرکردە عەرەبانە بووەوە کەوا پشتیوانی ئەمەویەکانیان دەکرد، پاشان هەندێ لەو سەرکردانەی لەناوبرد کەوا پالپشتیان کرد بۆ گەیشتن بەدەسەلات پاش ئەوەی کە نیازیان هەبوو جیاببنەوە، وەکو (ئەبو سەلەمەلخەلال).

ئەبو لعەباس کەسێکی دەستبلاو بووە، بەڕێز، ژیر، زۆر شەرمن، ڕەوشت جوان، ئەو بەخشندەترین کەس بووە، هەرگیز بەلێنی نەداوە ودوای بخات، وە لە کوڕەکەی هەلنەساوە تا تەواو نەبێت. لەسەر ئەنگوستیلەکەی نەخشاندبووی: ((الله ثقه عبدالله و به یومن)) واتە خوا جێی متمانەی عەبدوللایەو باوەڕیشی پێی هەیە و دەگێڕنەوە کەوا وتوویەتی : ((نزمترینی خەلك و ریسواترینیان ئەو کەسەیە ڕەزیلی بەدەست پارێزی بزانێ، وە نەرم ونیانی بە سەرشۆڕی بزانێ)) هەروەها وتوویەتی (( ئەگەر نەرمو نیانی خراپە بێ، ئەوا لێبوردەن موعجیزەیە، خۆڕاگری ئاکارێکی جوانە تەنها ئەوکاتە نەبێ کە دین سووك دەبێت و سولتان لاواز دەبێت، پەلە نەکردن ستایشکراوە تەنها لەکاتی دەرفەتدا نەبێ)).

ئەبولعەباس زۆر حەزی لە دەمەتەقێی پیاوان و دانیشتنی زانایان هەبووە، هانی ئەدەب و گۆرانی داوە، خەلاتی شاعیران و گۆرانی بێژانی کردوە.[2]

---

[1] الطبري : هەمان سەرچاوە لاپەرە ٤٦٤. الدینوری:لا ٢٦٣.

[2] ابن الطقطقا : لا ١٢٤. السیوطي :تاریخ الخلفاء [illegible] ٢٥٨.

## ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی ئەبو لعەباسدا

ئـەبو لعـەباس کاتێـك بەیعـەتی پێـدرا بـۆ خیلافـەت هـەر هێنـدەی سـەربازەکانی دەسەڵاتی هـەبوو، جا سـوپاکەی خـۆی ئامـادە دەکـرد بـۆ پـەلاماری کۆتـایی لەگـەڵ ئەمەویەکانداو هێشتا کاروبارەکان هەمووی بەدەستی سـەرکردەو بانگخوازەکـان بـوو، بۆیە ئەرکی زۆر قورس و گران بوو. چونکە پێویست بـوو لـەسـەری پێـی عەباسیەکان لەدەسەڵاتدا جێگیر بکات و کۆڵەکەکەیان بچەسپێنێ. بۆیە وای بینی پشت بەبـراو مـام و برازاکـانی ببەسـتێ و بـەشـداریان پـێ بکـات لـەم کـارەدا بـۆ ئـەوەی سـەرکردە و بانگخوازکان دەسەڵات بۆ خۆیان قۆرخ نەکەن، ئەمە لەلایەکەوە، لـەلایـەکی تریـشەوە ویستی وردە وردە دەسەڵات بۆ دەستی تاکەکانی بنەماڵەی عەباسی بگەڕێنێتەوە.

ئەوە بوو مامی (سولەیمانی کوڕی عەلی) کرد بەوالی لەسـەر بەسـرەو دەوروبـەری، مامی (ئیسماعیلی کوڕی عەلی) لەسەر (کور و ئـەهوان)، مـامی (داوودی کـوڕی عـەلی) لەسەر حیجاز و یەمەن پاش ئەوەی کە لەسەر کوفە لایـبرد و مـامی (عوبـدڵڵای کـوڕی عەلی) کرد بە بەرپرسـی جـەنگ دژی مـەروانی دووهـەم، (ئـەبو جەعفـەری مەنـسور)ی برای بۆ جەنگاندنی (یەزیدی کوڕی هوبەیرە) دانا.([1]).

وادیارە جۆرە بێزارییەك دروست بوو لەلای هەندێ لەو سەرکردانەی کـەوا شـۆڕش لەسەر شانیان هەستا، ترسان کەسانی تر بەرهەمی هەوڵ و کۆششەکەیان بچنێ، بۆیـە خەلیفە دڵنیای کردنەوە و قەناعەتی پێکردن کە بەشداربوونی کەسوکاری لەدەسەڵاتدا تەنها بۆ شانازییە، ئەوە بوو نووسراوێکی بۆ (حەسەنی کوڕی قوحتوبە)ی نـارد کاتێـك ئەبو جەعفەری برای کردە هاوەڵی: (( دڵنیابە سـەرباز سـەربازی خـۆتن، سـەرکردەش سەرکردەی خۆتن، بەڵام حەزم کرد براکەم ئامادەبێ و سەرپەرشتی کارەکـە بکـات)). ([2])

ئەبولعەباس دوای ئەوە دەستی کرد بە پاکژکردنەوەی چـڵ و چـێوی ئەمەویـەکان.

---

[1] الطبري : ج ٧ ل ٤٥٩، ٤٥٨، ٤٥٠، ٤٣٢.

[2] الدينوري : ل ٢٦٠.

جا لەپاش ئەوەی هێزەکانی بە سەرکردایەتی مامی (عەبدوڵڵای کوڕی عەلی) هێزەکانی مەروانی دووهەمی لەسەر زێی (زاب) بەزاند و ڕاوی نا تا میسر و لەوێ کوشتنی، ئاشوب و ئاژاوەی ناوخۆیی لەناوچە عەرەبیەکاندا دژی دەسەڵاتەکەی بەرپا بوو، لە فەلەستین و شام و جەزیرە کەوا ناوەندی هێزو توانای ئەمەویەکان بوو، پاشان زۆری نەخایاند ئەم هێزو توانایەی لەدەستدا و لەخۆراسان خۆی بینیەوە. ([1]).

ئەوجا سەرکردەکانی مەروانی دووهەم هەندێکیان ترسان لەبنەماڵەی عەباس کەوا توندوتێژییەکی زۆریان نواند لەمامەڵە کردن لەگەڵ دوژمنەکانیانداو هەروەها هەندێکیان تەماحی ئەوەیان هەبوو دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی بگەڕێننەوە ([2]).

لەو بزوتنەوانەش باسی ئەمانە دەکەین، سەرهەڵدانی (حەبیبی کوڕی مورەی موری) لەهەرێمی (بپینە) لەفەلستین و بەلقا و حوراندا، سەرهەڵدانی (ئەبو لوەرد) لە قنسرین، بزوتنەوەی (ئوسامەی کوڕی موسلیم) لەجەزیرە ([3]). جێی باسە سەرکردەی ئەم بزوتنەوانە ئاڵای سپیان بەرز دەکردەوە و ناوی خۆیان نابوو بە (المبیچە) واتە سپی گەرەکان، وەکو نیشانەیەك لەسەر یاخی بوونیان لەدەسەڵاتی عەباسی کەوا ڕەنگی ڕەشی کردبوو بەدروشمی خۆی و شوێنکەوتووانی ناو نرابوون بە (المسودە- ڕەشگەرەکان).

ئەمەو (عەبدوڵڵای کوڕی عەلی) چەندین مانگی لەکاری سەربازی بەردەوام بەسەربرد، پێش ئەوەی ئەم بزوتنەوانە لەناو ببردرێ و شارەکانی ڕەقە و حەران و ڕەها وماردین و دیمەشق و بەیت لمەقدیس بێنە ژێر ڕکێفی.

ئەوجا ئەبو لعەباس ئاوڕی دایەوە بۆ لای دۆزی یاخی بوونی (یەزیدی کوڕی هوبەیرە) کەوا لە (واست) خۆی حەشار دابوو، ئەوەبوو (ئەبو سەلەمە) سوپایەکی نارد بە سەرکردایەتی (حەسەنی کوڕی قوحتوبە) و گەمارۆیدا، وردە شەڕێك کرا لە نێوان هەردوولا بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی لێبکەوێتەوە، ئەمەش وای لە (ئەبو

---

[1] العبادي : لا ٤٤

[2] الطبري : ب ٧ لا ٤٤٦.

[3] الطبري : ب ٧ لا ٤٤٣- ٤٤٧.

لەعباس) کرد (ئەبو جەعفەر)ی برای بنێرێ بۆ ئەوەی خۆی سەرکردایەتی گەمارۆدانی (واست) بکات. جا کاتێك هەواڵی کوشتنی مەروانی دووهەم گەیشتە (یەزیدی کوڕی هوبەیرە)، داوای ئاشتبوونەوەی کرد، دانوستانێك لەنێوان هەردوولا کرا لەئەنجامدا بەڵێن بە (کوڕی هوبەیرە) و لایەنگرەکانی درا کە دڵنیا بن. (ئەبو جەعفەر)یش نوسراوێکی بۆ خەلیفە نارد سەرەبارت بەم پرسە، خەلیفەش ڕاوێژی بە (ئەبو موسلیم) کرد. لە سەر ڕێنمایی ئەبو موسلیم، (ئەبو لعەباس) فەرمانی دا بە (ئەبو جەعفەر)ی برای (کوڕی هوبەیرە) و ژمارەیەك لەهاوەڵانی بکوژرێن ([1]). بەکوشتنی (کوڕی هوبەیرە)ش ئەمەوییەکان دواییان هات.

هەروەها (ئەبو لعەباس) ڕکابەرە سیاسیەکەی لەناوبرد، (ئەبو سەلەمە لخەللال) وەزیری (ال محمد)، ئەوەبوو بوختانی ئەوەی پێکرد کە دەیەوێ خیلافەت لەبنەماڵەی عەباسەوە بۆ بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بگوازێتەوە، بەنیاز بوو لە ناوی بدات کاتێك بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت بەلام بارودۆخی دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو ڕێگەی پێ نەئەدا ئەو کارە بکات، بۆیە هێشتیەوە لەسەر پۆست و نازناوەکەی.

لەپاش ئەوەی کۆتایی بەو بزوتنەوانەی هێنا کە بەرهەڵستکاری دەسەڵاتەکەیان دەکرد و پێی لە دەسەڵاتدا جێگیر بوو ئەبو لعەباسی خوێنرێژ دەرفەتی بۆ رەخسا تا وەزیرەکەی خۆی لەناو بەرێ. بەلام (داوودی کوڕی عەلی) ئامۆژگاری کرد نووسراوێك بۆ ئەبو موسلیم بنێرێ تێدا پرسی (ئەبو سەلەمە) ڕوون بکاتەوە بۆ ئەوەی پێی ناخۆش نەبێ. (ئەبو موسلیم) هەستا بەناردنی (مەراری کوڕی ئەنەسی – چبی) بۆ کوشتنی، ناوبراویش لەگەڵ (ئوسەیدی کوڕی عەبدوڵلا) بۆسەیان بۆ دانا و کوشتیان لە (مانگی رەجەب ساڵی ١٣٢ ك / مانگی شوبات ساڵی ٧٥٠ ز ([2]).

---

[1] الطبري : ٧ ل ٤٥٠ – ٤٥٧.

[2] الجهشياري، محمد بن عبدوس : الوزرا و الكتاب : ل ٩٠

## ڕەوشی دەرەکی لەسەردەمی ئەبو لعەباسدا

## بەرەی رۆژهەلآت

لەو کاتەی کە ئەم ڕووداوانە لەعێراق و شام و جەزیرە ڕووی دەدا، ئەبو موسلیمی خۆراسانی، کە سەرکردەی یەکەمی شۆڕشی عەباسی بوو، دەسەلآتی ڕادەست کرابوو و ئیشی بۆ خەلیفە دەکرد لەخۆراسان و شاخەکاندا، دەستی کرد بە جێگیر کردنی پێی عەباسیەکان لەم ناوچانەدا، کۆتایی بەو شۆڕشانەی هێنا کەبەر هەلَستکاری حکومەتی ناوەندییان دەکرد ([1]).

لەهەمان کاتدا ولآتی دوای ڕووبار دوچاری مەترسیەکی گەورە بوو لەلایەن چینیەکانەوە. چونکە ئەمان شلۆقی بارودۆخی موسلمانان و ئەو بۆشاییەی کە ڕوخانی دەولەتی ڕۆژئاوای تورکەکان هێنایە کایەوە، بە هەلزانی بۆ فراوانکردنی دەسەلآتەکەیان لەولآتی دوای ڕووبار کەوا فەرمانڕەوا پێشووەکانیان هەر لە دێر زەمانەوە ڕاهاتبوون لە سەر ئەوەی نێردە ڕەوانەی چین بکەن بەمەبەستی نواندنی پشتگیری خۆیان بۆ ئیمپراتۆری چینی، جا ئەمانیش دەستیان کرد بە هاوکاری کردن و درێژ کردنەوەی دەستی یارمەتی بۆ ئەو فەرمانڕەوا خۆمالیانەی کەدژی دەسەلآتی ئیسلامی بوون. لەڕاستیدا ململانێی نێوان لایەنی ئیسلامی و لایەنی چینی، کۆمەلێ هۆکاری شارستانی و بازرگانی دەیجولآند، ئەو پرسیارەی کە لە کاتی خۆیدا دەکرا ئەمە بوو : ئاخ کامەیان زالّ دەبێ بەسەر ئەو ناوچانە، شارستانیەتی ئیسلامی ؟ یان شارستانیەتی چینی ؟ ([2]).

لە ڕووی هۆکاری بازرگانیەوە، ئەوا موسلمانەکان حەزیان لێ بوو زالّ بن بەسەر ڕێگاو بانەکانی بازرگانی جیهانی لەگەلّ ڕۆژهەلآتدا، واتە هند و چین، کەمکردنەوەی ڕۆلّی چینی لەبازرگانی جیهانی.

لەسالّی (١٣٢ک/٧٥٠ز) سوپای چینی شاری (سۆیاب)ی داگیر و وێرانکرد. لەسالّی داهاتوودا چینەکان ململانێی نێوان (ئەخشید فرغانە) –کە داوای یارمەتی چینیەکانی

---

[1] ابن الاثیر : ب ٤ لا ٣٤١. بارتولد : سەرچاوەی پێشوو لا ٣١٤ – ٣١٥.

[2] بار تولد : لا ٣١٦.

کرد – و نێوان پاشای (شاش) بەهەڵ زانی، خێرا دەستیانگرت بەسەر ئەو ناوچانە و لە بەردەم (فرغانە) دەرکەوتن و هێرشیان کردە سەر شاری (شاش) و پاشاکەیان گەمارۆدا و بەزۆر هاتە ژێر فەرمانیان. ([1])

سەرکردەی موسڵمانیش، (زیادی کوڕی ساڵح) کە تازە شۆڕشی (شەریکی کوڕی شێخ مەهری) کپ کردبووەوە لە (بوخارا)دا، توانی سوپای چینی بشکێنی لەسەر ڕوباری (گران) لەمانگی (زی الحجە– ساڵی ١٣٣ك / مانگی ئاب ساڵی ٧٥١ ز) ([2]).

ئەمەو (ئەبو داوود) – خالدی کوڕی ئیبراهیم –، کەوا ئەبو موسلیم وەکو فەرمانڕەوایەك لەسەر (بلخ) دایمەزراند، سەرکەوتوو بوو لەو کارە سەربازیانەی کە لەناوچەکانی (ختل و کش) ئەنجامی دا، ئەوە بوو فەرمانڕەوای (ختل) بۆ چین هەڵهات، سەرۆکی (کش)یش کوژرا و براکەی شۆینی گرتەوە([3]) ئەوجا چین دوچاری کێشەی ناوخۆ بوو و شەڕی ناوخۆی تیا هەڵگیرسا بەهۆی ململانێ لەسەر تەختی دەسەڵات، لە ئەنجامدا چینەکانی سەرقاڵ کرد و دووری خستنەوە لە دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتی دووای ڕووبار. شەڕی (گران) بەدوا دەستێوەردانی چینی دەژمێردرێت لەم ناوچەیەدا کەوا دواتر لەسایەی دەسەڵاتی عەباسیدا ماوەیەکی دوور و درێژ لە خۆشگوزەرانیدا بوو.

---

[1] ابن الاثیر : ب ٤ لا ٣٤٢.

[2] ابن الاثیر :ب ٤ لا ٣٤٢.

[3] هەمان سەرچاوە لا ٣٤٣.

## بەرەی بێزەنتی

دەوڵەتی بێزەنتی سوودی لەو پەشێوییە وەرگرت کەوا باڵی کێشابوو بەسەر دەوڵەتی ئیسلامیدا بەهۆی گوێزانەوەی خیلافەت لە ئەمەوییەکانەوە بۆ عەباسیەکان و گواستنەوەی پایتەخت بۆ دیمەشق، بۆیە، هێرشی کردە سەر ناوچەکانی باکوری دەوڵەتی ئیسلامی، جا ئیمپراتۆر (قسطنطین)ی پێنجەم سەرکەوت لەفراوانکردنی سنوری وڵاتەکەی بەرەو ڕۆژهەڵات، ئەوەش کاتێك هێرشی کردە سەر ناوچە سنوریەکانی شام و جەزیرە، شارو قەڵاکانیانی داگیر کرد ([1]).

لەساڵی (١٣٣ ك/ ٧٥١ز) ئیمپراتۆری ناوبراو هەڵمەتێکی برد بۆ سەر ناوچەی سەر سنور لەگەل ئەرمینیا و قەڵای (پیود و سیبولیس – واتە ئەرزرۆم)ی داگیر کردو سوپای عەباسی کەوا (موخەلەدی کوڕی موقاتلی کوڕی حەکیم) سەرکردایەتی دەکرد نەیتوانی بەرگە بگرێ ([2]).

ئیمپراتۆر بەردەوام بوو لە داماڵینی ناوچەکەو، زاڵ بوو بەسەر قەڵای (کماخ) لەسەر ڕووباری فورات لەپاش بەرگری کردنێکی زۆردا، هێرشی کردە سەر ناوچەکانی جەزیرەدا وە قەڵاکانی فوراتی ڕماند و (حدث وملطیة و قلوذیة)ی داگیرکردو قەڵای (سمیساط)ی وێرانکرد ([3])

وادیارە (قسطنطین)ی پێنجەم مەبەستی لەم داماڵینەدا ئەوە بوو بنکەی کۆمەکی کردن و یارمەتیدانی سوپای ئیسلامی بروخێنێ بۆ ئەوەی هاتنی موسڵمانان بەرەو ناو سنورەکانی بێزەنتی کەم بکاتەوە، چونکە ئەو بۆی دەرکەوت ئەگەر هاتوو بێزەنتیەکان لەم ناوچانە جێگیریش بن ئەوا ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن. ئەوەش بەهۆی دوور بوونی لەپایتەخت. بۆیە فەرمانی دا بە روخاندن و وێرانکردنی، بەوەش سوپای ئیسلامی لەسەر سنوور خستەبەر هەڕەشەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ بێزەنتیە دڵنیابوو لەجموجوڵی ئیسلامی، سەرەڕای زۆربوونیشی،

---

[1] تاریخ خلیفة بن خیاط : ب ٢ لا ٤٣٥- ٤٣٦. البلاذري فتوح البلدان : لا ٢٦٢ – ٢٦٣.

[2] تاریخ خلیفة بن خیاط : هەمان سەرچاوە لا ٤٢٦.

[3] البلاذري : لا ٢٦٢-٢٦٣. ابن الاثیر: لا ٣٤١.

کە کاریگەری نیە لەسەر ئاسایشی ئەو وەکو سەردەمی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمێکی بەرگریکردنی بەهێزو پتەوی لەو ناوچە سنورییانە دانا کە روبەڕوی موسڵمانەکانە و کردی بەناوچەیەکی سەربازی و هێزی سەربازی تێدا جێگیر بوو.[1]

لەسەرەتاوە کاردانەوەی ئیسلامی سنوردار بوو، بەڵام وردە وردە بەهێز بووەوە، جا لەگەڵ سەقامگیربوونی بارودۆخی خیلافەت، بزوتنەوەیەك سەری هەڵدا بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی بێزەنتیەکان و دەستپێکردنەوەی جموجوڵی هاوین و زستانان.[2]

لەساڵی (١٣٤ك/٧٥٢ز) ئەبو لعەباس دوو گروپی هاوینانی بۆ (ملطية) رەوانە کرد، یەکەمیان بەسەرکردایەتی هەر دوو مامی (ساڵح و عیسای کوڕی عەلی)، توانیان پەرژینی شارەکە وێران بکەن، دووهەمیان بەسەرکردایەتی (موحەمەدی کوڕی نەسری کوڕی بریمی حەمیری) کەوا چووە ناو قەڵای (طوانة)، [3]، هەروەها لەکۆتایی ئەم ساڵەدا هێرشێکی دەریایی ئاراستەی (صقلیه و سردینیا) کرد بەسەرکردایەتی (عەبدوڵڵای کوڕی حەبیبی فهری). [4]

دیارە ئامانجی ئەبو لعەباس ئەوە بوو هێزەکانی بێزەنتیە پەرش و بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی فشاری سەربازییان کەم بێتەوە لەبەرە سەربازیەکاندا.

خەلیفە سوور بوو لەسەر گەڕانەوەی ئەو ناوچانەی کە بێزەنتیەکان داگیریان کردبوو وەکو (ئەرزڕۆم) و نۆژەن کردنەوەی ناوچە وێرانکراوەکان وەکو (ملطية)، هەروەها گەیشتنی هێزی دەریایی ئیسلامی بۆ دوورگەکان سەلماندی کە چالاکیان بەردەوام دەبێ، لە ساڵی (١٣٦ك/٧٥٢ز) ئەرکی ئامادەکردنی هەڵمەتێك بۆ ئاسیای بچوکی بە مامی خۆی (عەبدوڵڵای کوڕی عەلی) سپارد، کەوا فەرمانڕەوای شام بوو،

---

[1] عبدالله، وديع فتحي : العلاقات السياسية بين بيزنطة والشرق الادنى الاسلامي لا ١٤٥

[2] علي، محمد كرد : خطط الشام. ب ٥ لا ١٦.

[3] تاريخ خليفة بن خياط : لا ٤٢٦.

[4] ابن الاثير، ب ٤ لا ٢٤٥.

هەڵمەتەکە لە (دابق) باکوری حەلەب کۆمەڵەی بەستبوو بۆ ئەوەی لەوێوە بکەونە ڕێ، بەڵام مردنی خەلیفە لەو ساڵەدا وای لە (عەبدوڵلای کوڕی عەلی) کرد سەرکرایەتی بۆ خۆی قۆرخ بکات و تەماحی هەبوو دەست بگرێ بەسەر خیلافەتدا. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین پێکدادنی سەربازی نێوان هەردوولا لەو کاتەدا بە شەڕی سەرسنوور ناوزەند بکەین ([1]).

## وەزارەت لەسەردەمی ئەبو لعەباسدا

پۆستی وەزیر ڕاستەوخۆ لەپاش سەرکەوتنی سوپای عەباسی بەسەر سوپای ئەمەوییدا و پێش بەیعە تدان بە ئەبو لعەباسی خوێنرێژ بۆ خیلافەت، داهێنرا، ئەم پۆستەش سیستەمێکی دێرینی فارسە ([2]).وادیارە ئەبو لعەباس کاتێك سیستەمی وەزارەتی پەسەندکرد، پێشکەوتنی دەوڵەت و بەرەو مەرکەزیەت چوون و دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی لەبەرچاوگرت. ئەمەش بە هاندانی فارسەکان و کاریگەری خۆراسانیەکان هاتە ئەنجام. چونکە (ئەبو سەلەمەلخەللال)یان کرد بە (( وەزیری ئال موحەمەد))، ئەبو لعەباسیش لاری نەبوو.

بەڵام لەسەردەمی (ئەبو سەلەمە) دەسەڵاتی وەزیر بەشێوەکی روون و ئاشکرا، دیاری نەکرابوو، هەرچەندە ناوی وەزیری لێ نرابوو بەڵام دەسەڵاتێکی تەواوی نەبوو لەهەموو دیوانەکاندا، بۆ نموونە دیوانی (خراج – دارایی) و دیوانی سەربازەکان لە دەسەڵاتی ئەودا نەبوون. زۆرجار بەریەککەوتن دروست دەبوو لە نێوان دەسەڵاتی خەلیفە و دەسەڵاتی وەزیر، بەهۆی دیاری نەکردنی دەسەڵاتی ئەمەی دووهەم، لەکاتێکدا دەسەڵاتی ئەوەی یەکەم بە روونی دیاری کرابوو. جا وەزیر حەزی لێبوو پۆستی ئیداری هەمووی بگرێتە دەست و هەموو کاروبارەکانی خۆی جێبەجێی بکات. بەڵام دەسەڵاتی خەلیفە ڕێگر بوو لەبەردەم ئەم هەوڵانەی وەزیردا ([3]).

---

[1] Ostrogorsky : cp – cit p ١٦٧

[2] أمين، أحمد : ضحي الاسلام ب ١ لا ١٦٥. الصالح، صبحي : النظم الاسلامية لا ٢٩٦.

[3] الصالح : هەمان سەرچاوە لا ٢٩٦–٢٩٧.

ئەوجا ئەم سیستەمە گەشەی کرد و لە سەردەمی عەباسی یەکەمدا جێگیر بوو و دەسەڵاتی وەزیر دیاری کرا، ئەوە بوو بۆ وەزارەت کۆمەڵێ ئیش وکاری دیاریکراو و یاساو ڕێسای نەگۆڕیان دانا، گرنگترینیان سەرپەرشتی کردنی دیوانی (خراج – دارایی) و دیوانی (نفقات – خەرجکردن) بوو، هەروەها سەرپەرشتی کردنی باج وەرگرتن، وە کۆکردنەوەی هەردوو دەسەڵاتی مەدەنی و سەربازی لە خودی وەزیردا، سەرەڕای ئەو ئەرکە گشتیانەی کە خەلیفە پێی دەسپێرێت، وە جێی خەلیفە دەگەرێتەوە لە حوکمڕانی وڵاتدا، واتە دەستە ڕاستی خەلیفە بوو ([1]).

وەزارەت لەسەردەمی عەباسیەکاندا دوو جۆر بووە:

- وەزارەتی جێبەجێ کردن (تنفیذ).
- وەزارەتی دەسەڵات پیدان (تفویض).

جا وەزارەتی جێبەجێکردن، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خەلیفە دانرابوو، وەزیر بۆی نەبوو هەر لەخۆیەوە ڕەفتاری پێ بکات، وەزیریش لەم حاڵەتەدا وەکو ئەڵقەی گەیاندن بوو لە نێوان ئیمام و گەل ([2]).

بەڵام وەزارەتی دەسەڵاتپێدان بە تەواوەتی بەدەستی وەزیر بوو و بۆی هەبوو بەکاروباری دەوڵەت هەڵسوکەوت بکات، ئەمە پاش ئەوەی خەلیفە ئەو دەسەڵاتەی پێ دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا خەلیفە مافی هەیە لەدانانی هەر کەسێك بۆ جێنیشینێتی و لابردنی ئەوانەی کە وەزیر هەندێ کار و باریان رادەست ئەکات، ئەگەرهاتوو ڕازی نەبوو لەسەریان.([3]) کاتێك دەسەڵاتی خەلیفە عەباسیەکان لاواز بووەوە، دەسەڵات کەوتە دەستی وەزارەت و پلەوپایەی وەزیر بەرز بووەوە. بەڵام لەکاتی بەهێزبوونی دەوڵەتدا خەلیفەکان کاروباری دەوڵەت بەوەزیرەکانیان راسپاردووە، ناودارترین وەزیرانی دەسەڵاتپێدان لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا (بنەماڵەی بەرمەك) بوون.

---

[1] سەبارەت بە ئەرکەکانی وەزیری عەباسی بگەڕێوە بۆ : ابن خلدون، المقدمة: ب ٢ لا ٧٧٦-٧٧٨.

[2] الماوردي : الاحكام السطانية و الولايات الدينية، لاثەرە ٢٥.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو :لا ١٥-١٦. ماوەردی مەرج ■ سیفەتەکانی هەریەك لە وەزیری جێبەجێکردن وە وەزیری دەسەڵات پێدان

پۆستی وەزارەت کە لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا دەرکەوت گرنگی و مەترسیەکی گەورەی هەبوو لەهەمان کاتدا. لەرووی گرنگیەوە ئەوا گرنگترین پۆستە لە دەوڵەتی عەباسیدا لەدوای پۆستی خیلافەت، لە ڕووی مەترسیەوە ئەوا وەزیرکان شوێن پەنجەی خۆیان لە هەموو بوارەکانی ژیان سیاسی و ئابوری و ئیداری و هزری بەجێهێشت، هەندێکیان ئەم پۆستە بۆ خزمەتی مەبەست گەلێکی سیاسی و هەرێمی دژ بە سیاسەتی دەوڵەتی عەباسی قۆستەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئاشنابین بەوەی کە زۆرینەی ئەو وەزیرانەی پۆستی وەزارەتیان گرتە دەست لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا لەفارسەکان بوون.

ئەبو لعەباس لەدوای ئەبو سەلەمە، (خالدی کوڕی بەرمەکی) کرد بە وەزیر، وێڕای ئەوەی لەپۆستەکەیدا جێی گرتەوە، کاری تریشی پێ سپێردرا وەکو سەرپەرشتی کردنی دیوانی دارایی و دیوانی سەربازەکان، سەرەڕای (الغنائم –دەستکەوتەکان ([1]).

## جێنشینێتی – مەرگی خوێنرێژ

لە ساڵی (١٣٦ك/٧٥٤ز) خوێنرێژ لە دوای خۆی خیلافەتی بە ئەبو جەعفەری برای راسپارد، پاشان بە عیسای کوڕی موسای کوڕی موحەمەد، پەیماننامەیەکی بەوە نووسی ورادەستی عیسای کوڕی موسای کرد. خوێنرێژ تووشی نەخۆشی (ئاوڵە) بوو لەشاری ئەنبار، وە لە سیانزەی (مانگی – زی الحجە – ساڵی ١٣٦ك/ مانگی حوزەیران ساڵی ٧٥٤ز) کۆچی دوایی کرد و لەناو کۆشکەکەی لە ئەنبادا نێژرا ([2]).

---

[1] ابن الطقطقا:لا ١٥٦

[2] الطبري : ب ٧ لا ٤٧٠-٤٧١

# عەبدوڵلا ئەبو جەعفەری مەنسور١٣٦ –١٥٨ك/٧٥٤–٧٧٥ز

## ناساندنی ئەبو جەعفەر

عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی عەباسی، ئەبو جەعفەری مەنسور. لە (حەمیمە) لە ساڵی ٩٥ ك لەدایك بووە و دایکی ناوی (سەلامە) یە. لە ناو کۆمەڵگەی هاشمیدا پێگەییوە.

هەر لەسەردەمی لاوێتیدا زانستخواز بووە و لە دین تێگەیشتووە، وە بەشێك لە (علم الحدیث – فەرمودەکانی پێغەمبەر)یش فێر بوو، بۆیە کەسێکی ئەدیب و زمانپاراو و ئاشنا بە ژیاننامەی پاشاکانی لێ دەرچوو ([1]).

ئەبو جەعفەر لەگەڵ براکەی و کەسوکاریدا لە (حەمیمە)وە کۆچیان کرد بۆ (کوفە). کاتێك ئەبو لعەباسی برایشی خیلافەتی گرتە دەست، ئەم دەستی ڕاستی بوو لەبەڕێوەبردنی کاروباری خیلافەتدا. ئەویش جەزیرەو ئەرمینیاو ئازەربایجانی خستەژێر دەسەڵاتی، ئاراستەی کرد بۆ خۆراسان بۆ ئەوەی لەوێ بەیعەتی بۆ بسێنێ، هەروەها کردی بە جێنشینی خۆی.

کە (خوێنڕێژ) مرد، ئەبو جەعفەر لەحیجاز ئەمیری حەج بوو، بۆیە عیسای کوڕی موسا، کەبرازایەتی، لەئەنبار بەیعەتی بۆ وەرگرت و بەنوسراوێك ئاگاداری کردەوە.

مەنسور ناسراو بوو بە زەبر وزەنگی و وریایی و چاکسازی و بایەخدان بە بەرژەوەندی هاوڵاتیان. ڕقی لە خوێنڕشتن بوو تەنها بەحەق نەبێ، خۆڕاگر بوو لەکاتی تەنگانەدا، بێ گومان ئەم سیفەتەش یەکێك بوو لەو سیفەتانەی کە سەرکەوتنی بۆ مسۆگەر کرد.

---

[1] ابن کثیر : ب ١٠ ل ١٢١–١٢٢

٢ الطبري: ب٧ ل ٤٧٣

## یاخی بوونی عەبدوڵڵای کوڕی عەلی

کاتێك ئەبو جەعفەری مەنسور خیلافەتی گرتە دەست، هێشتا کۆڵەکەکانی جێگیرو دامەزراو نەبوو. لەرکابەری عەبدوڵڵای کوڕی عەلی – مامی – کەوا داوای خیلافەتی دەکرد، دەترسا، هەروەها ترسی زیادبوونی دەسەڵاتی ئەبو موسلیمی خۆراسانی و یاخی بوونی ئامۆزاکانی خۆی واتە (بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ی لێ نیشتەوە. ئایا مەنسور چۆن ڕووبەڕووی ئەم گرفتانە بووەوە ؟

وادیارە ئەم خەلیفەیە، بوێری و وورەبەرزی و فێڵبازی و زیرەکی تێدا کۆبۆتەوە. جا بڕیاریدا دوژمنەکانی بەگژیەك بدات، بۆ ئەوەی گۆڕەپانی سیاسی بۆی چۆڵ بێت.

جا عەبدوڵڵای کوڕی عەلی تێڕوانینێکی تایبەتی هەبوو بۆ کێشەی حوکم، ئەو سەرەڕای ئەوەی تەماحی هەبوو لە خیلافەت، ئەوا لە هەردوو برازاکەشی – ئەبو لعەباس و ئەبو جەعفەر – پەست بوو بوو، بەهۆی لایەنگریان بۆ فارسەکان.

(ئەبو جەعفەر)یش لەسەر حەق بوو کاتێك لەتەماحی مامی دەترسا. کەوا بە سوپایەکەوە کە عەرەبی زۆری لەخۆگرتبوو لەسەردەمی ئەبو لعەباس دەرچوو بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر بێزەنتیەکان. ئەو بوو کاتێك گەیشتە (دلوك)، لەدەووبەری حەلەب، هەواڵی مردنی خوێنڕێژ و بەیعەتدان بە مەنسوری پێگەیشت، بۆیە هێرشەکە ڕاگیرا، وە ڕووی کردە (حەڕان) و لەوێ لەگەڵ سەرانی سوپاکەی کۆبووەوە، سەرئەنجام بڕیاردرا خۆی بۆ خیلافەت کاندید بکات. جا سەربازەکان بەیعەتیان پێداو پاشان هێرشەکەی ئاراستەی جەزیرە کرد (٢)

ئا بەم شێوەیە ئەو سوپایەی کە تایبەت بۆ هێرش کردنە سەر بێزەنتیەکان ئامادە کرابوو، عەبدوڵڵا بۆ هێنانەدی مەبەستەکانی خۆی لەخیلافەتدا بەکاری هێنا،

بە بیانووی ئەوەی ئەبو لعەباس کاتێك ناردی بۆ شەڕکردن لەگەڵ مەڕوانی دووهەمدا، کردبووی بە جێنشینی خۆی ([1]).

مەنسور رەفتارێکی ژیرانەی نواند بەرامبەر ئەم مەتەرسیەدا، سەلماندی کە لە دۆزە گرنگ و سەرەکیەکاندا ڕێگە نادا بە هەست و سۆز زاڵ بێ بەسەریدا، بۆیە ناردی بەدوای ئەبو موسلیم، هەر چەندە ڕقیشی لێ بوو، بۆ ئەوەی بجەنگێ لەگەڵیدا، بەوەش لێهاتوویی سیاسی خۆی دەرخست لەلێدانی دوژمنەکانی بەیەکدا، سەرەڕای ئەوەی کە بە تەمابوو خۆراسانیەکانی ناو سوپای مامی رابکێشێتە لای خۆی، ئەوەش لەرێگەی حاکمی خۆراسانەوە کەوا ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ بەرەنگاربونەوەی یاخی بووەکان ([2]).

ئەبو موسلیم بە توانای سیاسی و سەربازی خۆی سەرکەوت بەسەر عەبدوڵلا، لە شەڕێکدا کە لەنزیکی (نصیبین) لە ناوچەی جەزیرەدا روویدا([3]). عەبدوڵلاش لەپاش دۆڕاندنی، بۆ بەسرە هەڵهات و پەنای بردەبەر (سولەیمانی کوڕی عەلی)ی برای، خۆی لەلای ئەو شاردەوە، تا ئەو کاتەی مەنسور پێی زانی، ئەوەبوو ناردی بەدوایدا و دڵنیای کردەوە کە هیچی لێ ناکات، کەهات بۆلای دەستگیری کرد و خستیە زیندانەوە، ئەمەش لەساڵی (١٣٩ك/٧٥٧ز) روویدا، و هەر بە زیندان کراوی مایەوە تا ساڵی (١٤٧ك/٧٦١ز) ئەو کاتەی کە مەنسور کوشتی ([4]).

---

[1] المسعودي : ب ٣ ل ٢٨٩.

[2] الطبري : به ٧ ل ٤٧٥.

[3] هەمان سەرچاوە : ل ٤٧٥-٤٧٨.

[4] سەرچاوەی پێشوو : ب ٨ ل ٧-٩. اليعقوبي : ب ٢ ل ٣٠٢

## کۆتایی ئەبو موسلیمی خۆراسانی

فارسەکانی خۆراسان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لەدامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، ئەبو موسلیمی خۆراسانیش لەسەرووی هەموویانەوە بوو، بە ئومێدی ئەوەی هیوا و ئاواتەکانیان بهێننە دی، کەوا دەکرێ لەم خاڵانە خوارەوە کورت بکرێنەوە :

أ- دەسەڵاتی تازە بەچاوی بەزەییەوە سەیری دۆزەکەیان بکات لەپاش ئەو زوڵم و زۆرەی کە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەمەویدا پێیان گەیشت.

ب- ئارەزووکردنی ڕزگاربوون لەدەسەڵاتی ناو براو کەوا بایەخیەکی زۆرتری بە ڕەگەزی عەرەبی دەدا، کە بەڕوونی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دیاربوو.

ج - گەڕانەوەی شکۆمەندیی دێرینیان، زیندوو کردنەوەی شانشینی فارسی لەناوچوویان (کیسرا ئەنەوشێروان).([1]).

عەباسیەکان لەڕووی سیاسی و سەربازیەوە سیاسەتیان بەرامبەر سەرکردە باڵادەستە ئێرانیەکان، دەستنیشان کرد.

یەکەم: بەشداریکردن و هاوسەرنگێتی لەچوارچێوەی دەسەڵاتی بنەماڵەی عەباسی.([2]).

دووهەم: سەرکوت کردنیان، ئەگەرهاتوو لەم چوارچێوەیە دەرچوون.

جا ئەم سیاسەتە دواتر بووە هۆی ڕووداوی گەورە گەورە لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا.

کاتێک دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی باڵادەست بوو و سیاسەتی ڕوون بووەوە، خۆراسانیەکان ئەوەیان ڕەچاو کرد کە ئەم دەوڵەتە تازەیە هیواو ئاواتەکانیان ناهێنێتەدی بەو شێوەیەی کە دەیانەوی، ئەوەشیان بەدی کرد کە عەباسیەکان لەبەجێهێنانی ئەو پەیمانانەی کە لەسەرەتای شۆڕشدا دایان ساردبوونەتەوە، ئەمەش

---

[1] العمرو :ل ٣٠٧.

[2] محمود و الشريف :ل ١٠١.

جێی گومانە، سەرەڕای ئەمە خۆراسانیەکان بروایان نەبوو بەو ڕێبازەی کە عەباسیەکان بۆ خۆیان دانابوون کەوا لەسەر بنەمای ئیسلام و عەرەبیێتی دامەزرابوو، چونکە ئامانجی دوورترو قووڵترو بەرژەوەندی گەورەتریان هەبوو، وەکو زیندووکردنەوەی کەلتوری دێرینی فارس و دەرفەتدان بەسەرهەڵدانی بیروباوەڕی ئاگرپەرستی(مجوسی).([1]).

بۆیە هەڵوێستیان بەرامبەر بەم ڕژێمە نوێیە گۆڕاو دەستیانکرد بەجموجوڵی ناڕاسایی و یاخی بوون بەمەبەستی ڕوخاندنی دەوڵەت. بزوتنەوەی ئەبو موسلیمی خۆراسانی–ش سەرەتای ئەم بزوتنەوە ناحەزانە بوو، وێنەیەکی ڕاستەقینە بوو بۆ بەرەنگاری نێوان هێزی خۆراسانی بەتەمای دەسەڵات و نێوان دەسەڵاتی ناوەندیی خیلافەت ([2]).

وە لەمیانەی بزوتنەوەی ئەبو موسلیم، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم پیاوە وامەستی دەکرد کە ئەو دامەزرێنەری ڕاستەقینەی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسییە. کاتێك فارسەکانی بینی لە دەوروبەریدان و پشتگیری لێ دەکەن و لەژێر فەرمانیدان و وەکو ڕابەرێکی نەتەوەیی تەماشای دەکەن، هەستی بە شانازی کردو کۆمەڵێ خەون و تەماحی کەسی لەلا پەیدا بوو، وەکو تاکڕەوی لەحوکمڕانی خۆراسان و هەموو شارەکانی ئێران، هەوەسی جیابوونەوە یا خود جێبەجێکردنی نامەرکەزیەتی لەکارە سیاسی و ئیداریەکاندا. جا شێوەی ڕەفتارەکانی لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی عەباسی و پەیوەندیی بە خیلافەت هەر لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمەوە، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە ئەو وەهایە.

هەروەها فشاری قورس بووەوە لەسەر ئەبو لعەباس و سەرپێچی و بێ فەرمانی کردنی زیادی کرد ([3]). ئەبو جەعفەریش زۆر هەستیار بوو بەرامبەر بە تەماحەکانی، بۆیە هانی براکەیدا بیکوژێ، بەڵام خوێنڕێژ ئەم کارەی پێ باش نەبوو، ئەوەش چونکە

---

[1] عمرو :لا ٩٠.
[2] محمود و الشريف :لا ١٠٢.
[3] الجهشياري : لا ٩٣

خزمـــەتی زۆری بـــە بانگەشـــەی عەباســـی کردبـــوو، ســـەرەڕای ئـــەوەی کـــە شوێنەکەوتووانێکی زۆری هەبوو کە ئامادەبوون گیانی خۆیـانی بـۆ پێشکەش بکـەن و لەوانەیە ببنە جێی نیگەرانی و نائارامی بۆ دەوڵەت ([1]).

سەبارەت بەپەیوەندی ئەبو موسلیم بـە ئـەبو جەعفـەر، ئـەوا زۆر خـراپ بـوو، چـونکە هەندێ شت ڕوویدا بووە هۆی دوورکەوتنی ئەم دوو پیاوە لەیەکتری :

- لە ساڵی ١٣٦ك ئەبو موسلیم ویستی حەج بکات و بەتەمای ئەوە بوو ببێ بـە مـیری حەج، بەڵام خەلیفە (ئەبو لعەباسی خوێنڕێژ) ئەم کـارەی بـە ئـەبو جەعفـەر ڕاسـپارد. ئەمەش ئەبو موسلیمی تووڕە کرد ([2]).

- وادیارە ئەبو موسلیم سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەبو جەعفەر نرخ و بایـەخـی بزانـێ، ئەوە بوو لەبەهای خەلیفەی کەم کردەوە، ئەوەش بە خەرجکردنی پـارەیـەکی زۆر بـۆ چاککردنی کردنی ڕێگاو بان و خۆشگوزەرانی بۆ عەرەبە بیابان نشینەکان، لـە ڕێگـەدا پێش ئەو دەکەوت.

- کاتێك خوێنڕێژ مرد و ئەبو جەعفەر خیلافـەتی گرتـە دەسـت، ئـەبو موسـلیم خـاوە خاوی کرد لەبەیعەت پێدان. جا تازە لـە حـەج هـاتبووەوە، نوسـراوێکی بـۆ نـارد تێـدا پرس و ماتەمینی خۆی بۆ دەربڕی بەهـۆی مردنـی براکـەی بـێ ئـەوەی پیرۆزبـایی لـێ بکات بەبۆنەی خیلافەت یا خود بەیعەتی خۆیی بۆ بنێری یاخود لەڕێگەی هاتنەوەیـان لەحەج چاوەڕوانی بکات بۆ ئەوەی پێکەوە بێنەوە، ئەمەش تـرس و نیگـەرانی خـستە دڵیەوە ([3]).

کاتێکیش مەنسور خیلافەتی گرتە دەسـت، بڕیاریـدا لـە نـاوی بـەرێ، بۆیـە جـۆرە سیاسەتێکی لەگەڵیدا پەیڕەوکرد لەسەر ئەم بنەمایانە هەستابوو :

- دوورخـستنەوەی لـە خۆراسـان چـونکە دەسـتی ئـەڕوا لـەو ناوچـەیە و لـەوانەیـە خەڵکەکەی لێ هەڵگەڕێنێتەوە و سەربەخۆیانە حوکمی بکات.

---

[1] ابن الاثیر: ب ٧ لا ٤٦٩-٤٧٠.

[2] الطبري : ب ٧ لا ٤٦٩-٤٧٠.

[3] سەرچاوەی پێشوو :ب ٧ لا ٤٦٩-٤٧٠.

- دەسەلاتی لێ بسێنێتەوە و بەبێ کەسی بیهێڵێتەوە.
- خۆشکردنی پەیوەندیەکانی نێوانیان بۆ ئەوەی گومان لە دڵی نەمێنێ.
- نزیکردنەوەی لە ناوەندی خیلافەت تا چاودێری کردنی ئاسان بێ.

جا تەنگەشەکە لەنێوان ئەم دوو پیاوە، لەپاش سەرکەوتنی ئەبو موسلیم بەسەر (عەبدوڵلای کوڕی عەلی) تەقیەوە، ئەوە بوو دەستی گرت بەسەر هەموو سەروەت و سامانەکانیدا، مەنسوریش بۆ ئەوەی تێبگەیەنی کە ئەو یەکێکە لەکار بەدەستەکانی، نێردراوێکی بۆ نارد تا ئەو دەستکەوتانە سەرژمێر بکات، ئەمەش ئەبو موسلیمی توڕە و بێزار کردو وتی: ((ئەمینداره لەسەر خوێنی خەڵکی، خائینە لەسەروەت و ساماندا))، پاشان مەنسور پەیامێکی بۆ نارد کە ئەو دەستکەوتانە با بۆ خۆت بێ. ئەمەش بارێکی قورس بوو بەسەر ئەبو موسلیمدا ([1]).

ئەبو موسلیم دوای ئەوە زیاتر خۆی بەزلزانی، بەشێوەیەك نوسراوی خەلیفەی بۆ دەهات، دەیخوێندەوە و لاشەویلگەکانی لار دەکردەوە (وەکو سوکایەتی پێ کردنێك). ([2])

نوسراوێکی بۆ نارد تێدا پیرۆزبایی لێ دەکرد بەو سەرکەوتنە و شام و میسریش خستە ژێر دەسەلاتی، بەلام ئەبو موسلیم ئەوەندە زۆرزان بوو بەم فێڵە سیاسیە هەڵنەخەڵەتا، کەوا مەبەست لێی جیا کردنەوەیەتی لەسەربازەکانی کە خەڵکی خۆراسانن، یەکسەر لە مەبەستی مەنسور تێگەیشت، بە توورەییەوە وتی : ((ئەو دەمکاتە فەرمانڕەوای شام و میسر، خۆراسانیش هی خۆمە))، بۆیە بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ خۆراسان، بەوەش بێ فەرمانی خەلیفەی کرد ([3]).

خەلیفەش لەگەڕانەوەی ئەبو موسلیم ترسا، نەوەکو بە پشتیوانی شوێنکەوتووان و لایەنگرانی بتوانێ ڕووبەڕوی دەسەلاتی ناوەندی ببێتەوە، ئەو کاتەش مەحاڵە ملکەچی بکات یان زاڵ بێ بە سەریدا.

---

[1] اليعقوبي : ب٢ ل ٣٠٣. ابن الاثير: ب٤ ل٢٥٠.

[2] الطبري :ب ٧ ل٤٧١.

[3] الطبري : ب ٧ ل ٤٨٢

لەئەنجامی ئەم گۆڕانکاریە لە ڕووداوەکاندا، مەنسور پەنای بردەبەر شێوازێکی زیرەکانە بۆ ئەوەی دوژمنەکەی بکەوێنێتە داو، بەرەو مەدائن ڕۆیشت و لەوێ داوای لێکرد سەردانی بکات بۆ کارێکی گرنگ، هاوکات ئەبو موسلیم بەرەو خۆراسان ڕۆیشت. بەڵام ئەبو موسلیم بە ڕازو نیازی خەلیفە زانی و نامەیەکی بۆ نارد تێدا ورپایی و کینەیی خۆی بۆ دەربڕی ([1]).

ئەبو جەعفەر نائومێد نەبوو لەخستنی دوژمنەکەی. ئەمجار پەنای بردەبەر شێوازی ئارەزووپێکردن و هەڕەشە لێکردن (ترغيب وتهديد). نێردراوەکەی خەلیفە (ئەبو حەمید مروەزی) توانی کاریگەری هەبێ لەسەری و ڕازی بکات بێ بۆلای، هەرچەندە سەرانی سوپای ئەبو موسلیم ناڕازی بوون ([2]).

ئابەم شێوەیە ملکەچبوونی ئەبو موسلیم لەبەردەم مەنسوردا، هاتەدی، لەپاش هەوڵێکی زۆر لە خەلیفەوە کە سیاسەتی بە هەڕەشەکردن ئاوێتە کرد.

وە لە نێوان ئەم دوو پیاوەدا گفتوگۆیەکی خوش کرا کەشێوەی لە لێپرسینەوە دەچوو، وە کومەڵێ شتی تیا باس کرا، وەکو شانازی کردنی ئەبو موسلیم بەخۆی و ئەو هەوڵ و تێکوشانەی کە لەپێناوی خزمەتکردنی بنەماڵەی عەباس پێشکەشی کرد، ئەمەش نیشانەی زیرەکی مەنسور و ترسێتی لە جیابونەوەی هێزە خۆراسانیەکانی فارس لەدەسەڵاتی ناوەندی، چونکە ئەم پیاوە مەترسیەکە هەڕەشە لەئاسایشی وڵات و یەکگرتوویی دەکات، هەروەها گفتوگۆکە ئاماژە بەدوژمنایەتیەکی کۆن دەکات لەنێوانیاندا، بەڵام لە هەمان کاتدا تۆمەتێکی ترسناک لەخۆ دەگرێ بۆ ئەبو موسلیم کەوا هەوڵ دەدات بگاتە خیلافەت لەڕێگای ([3]):

– بەزاندنی سنووری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، کاتێک پوری خەلیفە (ئامینەی کچی عەلی) بۆ خۆی مارە کرد.([4])

---

[1] بکەڕێنوە بو دەقی نامەکە لە لای – طبري- ب٧ لا ٤٨٢.

[2] الطبري: ب٧ لا ٤٨٤– ٤٨٥. اليعقوبي : ب٢ لا ٣٠٢.

[3] العمرو:لا ٣٢٢

[4] اليعقوبي : ب٢ لا ٣٠٤. ئاشكرایە كە بنەماڵەی عەباسی پلەیەكی بەرزیان هەبووە و تەنانەت لەبنەماڵە

- خۆی لەپلەی یەکەم دانا لەدەوڵەتدا، چونکە کاتێك نوسراوەێکی بۆ ئەبو جەعفەر نارد، بەناوی خۆیەوە دەستپێکرد([1]).

- ڕەچەڵەکی خۆی گەڕانەوە بۆ عەباسیەکان، کاتێك وتی من (کوڕی -سلیگ- ی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس)م ([2])، واتە پلەو پایەیەکی بۆ خوی دانا هاوشێوەی پلەو پایەی باوکی مەنسور (موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس).

سەبارەت بەو تۆمەتانەی تر کە ئاڕاستەی کران بریتیە لە :

- کوشتنی (سولەیمانی کوڕی کەسیر) نەقیبی نەقیبەکان لە خۆراسان.

- کوشتنی زۆر لەسەرۆك هۆزەکانی یەمەن، وەکو (عەلی کوڕی جەدیعی کرمانی و عوسمانی) برای.

- بڕیاری دا بەرەو خۆراسان بچیٚ بیٚ ئەوەی پرس بە خەلیفە بکات.

پاش ئەوەی مەنسور لەئاڕاستەکردنی تۆمەتەکان بۆ دوژمنەکەی تەواو بوو، ئەبو موسلیم هیچ وەڵامێکی نەبوو بۆی، جگە لەوەی بیری بخاتەوە بە خزمەتگوزاریەکانی لەپێناوی بانگەشەی عەباسی. بەر لەوەی شمشێر لێی بدا، کەوتە هاوار هاوار و داوای لێبوردنی لەخەلیفە کرد لەوەی کە لێی وەشاوەتەوە، بەڵام بیٚ سوود بوو و لە کوشتن ڕزگاری نەکرد لە ڕۆژی بیست و پێنج لە ( مانگی شەعبان ساڵی ١٣٧ ك/ مانگی شوبات ساڵی ٧٥٥ ز)([3]).

ئابەم شێوەیە مەنسور لەم ڕکابەرە ترسناکە ڕزگاری بوو، کەوا هەمیشە خەوی لیٚ حەرام کردبوو و بووبوو بەجێی نیگەرانی بۆی بەهۆی هۆکاری سیاسی و کەسیەوە، کاتێك (عیسای کوڕی موسا)ی برازای ناڕەزایی خۆی لەشێوەی کوشتنەکی دەربڕی، مەنسور پێی وت: ((سوێند بە خوا یەکێکی تر نیە لە سەر زەوی ئەوەندەی ئەم

---

عەرەبیەکانی تریش جیاواز بوونە. جا عەباسیەکان بۆ چوونیان وا بووە [illegible] شوو کردنی کچە عەباسی بە غەیری عەباسی شوو کردنێکی هاو چەشن نیە، بۆیە سور بوون لە سەر ئەوەی کچەکانیان نەدەن بە کوڕێك لە بنەماڵەی عەباسی نە بیٚ.

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] المسعودي :مروج الذهب :ب٣ ل٢٩١- ٢٩٢. ابن الاثير:ب ٤ ل ٣٥٤.

[3] الطبري: ب٧ ل ٤٩٠-٤٩١.

دوژمنت بێ، ئایا ئێوه هیچ قازانجێکتان هەبوو لە ژیانیدا ؟.)) ([1]).

کاتێك (جەعفەری کوڕی –حنظلە–) بەکوشتنی ئەبو موسلیمی زانی، بە خەلیفەی وت:

((ئەی میری باوڕداران لەم ڕۆژەوە بەرواری خیلافەتەکەت تۆمار بکە)).([2]).

ئەمەش نیشانەی پلەبەرزی و بەهێزی دەسەلاتی ئەبو موسلیمە.

---

[1] ابن الطقطقا: لا ١٧١.

[2] الطبري: ب٧ لا ٤٩٢.

## پاشماوەکانی کوشتنی ئەبو موسلیم

### بزوتنەوەی (سنباذ).

ئەبو جەعفەری مەنسور سەرکەوت لە لەناوبردنی ئەبو موسلیم، بەلام یادی لەلای فارسەکانی خۆراسان و تورکەکانی ولاتی دوای رووبار، هەر مایەوە. ئەوە بوو لەپاش کوشتنی چەندین بزوتنەوەی ئاینی و سیاسی و نەتەوەیی دوور لە ئیسلام سەریان هەلدا، خاوەنی ئەم بزوتنەوانە ئیسلامەتیان دەنواند بەلام ئامانجی ئاینی ئاگرپەرستی [illegible] سیاسی روخێنەر و رەگەزپەرەستی فارسیان دەشاردەوە، ئەبو موسلیم-یشیان کردبوو بە هێماو هۆکارێك بۆ دەربڕینی بەرهەڵستیان دژی دەسەلاتی عەباسی، بە رزگارپیخوازێکی چاوەڕوانکراو بۆ بەدیهێنانی ئاوات و ئامانجەکانیان تەماشایان دەکرد کەوا عەباسیەکان نەیان هێنایە دی ([1]).

بزوتنەوەی (سنباذ).([2])، یەکەم کاردانەوە بوو لەسەر کوشتنی رابەری فارسی، ئەوە بوو (سنباذ) تورە بوو لەکوشتنی ئەبو موسلیم و داوای تۆڵەسەندنەوەی دەکرد. لایەنگرانیشی دوای کەوتن و زاڵ بوون بە سەر (نیسابور و قومس و رەی)دا و ناوی (فەیروز -أصبهذ-)ی لەخۆی ناو دەستی گرت بەسەر گەنجینەکانی ئەبو موسلیمدا و رایگەیاند کە بەرەو (مەککە) دەچێت و (کەعبە، واتە ماڵی خوا) ئەڕوخێنێ، وەکو تۆڵە سەندنەوەیەك ([3])

لەراستیدا ئەم بزوتنەوەیە سێ پاڵنەری هەبووە: سیاسی، بیروباوەری و رەگەزپەرەستی.

لەرووی پاڵنەری سیاسیەوە، ئەوا ئەم پیاوە بڕیاریدا تۆڵەی ئەبو موسلیم بسێنێتەوە لەبکوژەکەی واتە - مەنسور خەلیفەی عەباسی -، جا راپەرینەکەی دژی ئەم خەلیفەیە و دژی ڕژێمی عەباسی و هەر رەوتێکی سیاسی بیەوێت دەسەلاتی

---

[1] عمر: لا ٢٢١.

[2] ئەم بزوتنەوەیە ناوی (سنباذ) ی لە خۆی نا، ئەو پیاوەی کە رابەری [illegible] ئەم پیاوەش ئاگر پەرەست [illegible] خەلکی یەکێکە [illegible] گوندەکانی نیسابور پێی دەوترێ (ئاروانە). بگەڕێوە بۆ ابن الاثیر : ب٤ لا ٣٥٧.

[3] الطبري : ب٧ لا ٤٩٥.

خۆراسانی کەم بکاتەوە، ئاڕاستە کرابوو.

لەڕووی پاڵنەری بیروباوەڕییەوە، ئەم بزوتنەوەیە بنەماکانی لەخوڕەمی و مەزدەکی کۆن وەرگرتەوە. بیروباوەڕی شوێنکەوتوانی وابوو کە ئەبو موسلیم رابەری هەمیشەییانە و ئەو نەمردووە([1]). بەڵام ئەوەی ڕاست بێ ئەمە بزوتنەوەیەکی ئاگرپەرەست بوو دژی موسڵمانان ئاڕاستە کرابوو بە بەڵگەی ئەوەی ناوێکی فارسی لەخوی نا (فەیروز –أصبهذ–) ([2])، نیازی خۆی ئاشکرا کرد لە روخاندنی (کەعبە).

سەبارەت بە پاڵنەری رەگەزپەرستی، ئەوا (سنباذ) بە تەمابوو دەوڵەتی فارسی زیندوو بکاتەوە و ڕەگەزی فارسی بەهێز بکات دژی دەوڵەتی عەرەبی، هەرچەندە عەباسیەکان سیاسەتیان بەرامبەر مەوالیکان وەکو ئەمەویەکان نەبوو، بەڵام فارسەکان دەوڵەتی ئەمانیش بە تەواوکەری دەوڵەتی ئەمەوی دانا، چونکە هەردووکیان ڕەگەزیان عەرەبە.

جا کاتێک پرسی (سنباذ) لەڕادە دەرچوو، ئەبو جەعفەر بە سەرکردایەتی (جەهوری کوڕی مراری عەجلی) سوپایەکی بۆ نارد و لە نێوان هەمەدان و ڕەی بەریەک کەوتن و لەناوی برد. ئا بەم شێوەیە ئەم بزوتنەوەیە دوایی هات لەساڵی (١٣٧ك/٧٥٥ز) لەپاش حەفتا رۆژ لە دامەزراندنیەوە ([3]).

---

[1] هەمان سەرچاوە. المسعودي: ب ٣ لا ٢٩٢- ٢٩٤. ابن الاثير: ب ٤ لا ٣٥٧.

[2] (فیروز) ناوێکە لەو ناوانەی کە بە زۆر لە پیاوە ناودارەکان ئەوترا لە مێژووی ئیمبراتۆریەتی فارسی. وە (اصبهذ)، ئەو نازناوەویە [illegible] ئەدرا بە فەرمانڕەوای هەندێ ناوچە لەم ئیمپراتۆرییەتەدا.
بگەڕێوە بۆ : العمرو. سەرچاوەی پێشوو ٣٢٩.

[3] الطبري :ب ٧ لا٤٩٥. ابن الاثير : ب ٤ لا٣٥٧.

## چەند بزوتنەوەیەکی تر

لایەنگرانی ئەبو موسلیم بە تەواوەتی لەناو نەچوون لەپاش لەناوبردنی بزوتنەوەی (سنباژ). لەڕاستیدا هەرچەندە خەلیفەی عەباسی توانی ئەم بزوتنەوەیە لەناوبەرێ، بەڵام سەرنەکەوت لە لەناوبردنی ئەو بیرۆکانەی کە هانی (سنباذ)یدا بۆ راپەرین.

بۆیە، وڵاتی فارس و وڵاتی ئەوبەری ڕووبار سەرهەڵدانی چەندین بزوتنەوەی دژ بەدەسەڵاتی عەباسی بە خۆوە بینی، هەمووشیان بە ناوی ئەبو موسلیمەوە یا خود نزیك لەناوی ئەو، ڕاپەڕین و بەهەمان ئامانج پابەندبوون، نیشانەی ڕوون و جیاوازی لایەنگرەکانیان لەکاتی دەرچوونیان بریتی بوو لەپۆشینی جلی سپی، هەڵگرتنی ئاڵای سپی، بۆیە ناوی (سپی گەرەکان – المبیضة) یان لێ نرا.[1]

لەو بزوتنەوانەش :

بزوتنەوەی ڕەواندی کە لەساڵی (١٤١ك/٧٥٨ز) ڕاپەڕی.

بزوتنەوەی (أستاذ سیس) کەوا لەساڵی (١٥٠ك/٧٦٧ز) لەخۆراسانەوە دەستی پێکرد.

ئەوە بوو (مەنسور) هەوڵی زۆریدا بۆ لەناوبردنیان، بە توندی ڕوبەڕویان بووەوە و سەرکەوت بەسەریاندا.

---

[1] بارتولد : سەرچاوەی پێشوو ل٢١٧.

## پەیوەندی لەگەڵ -طالبي- یەکاندا.

## سەرهەڵدانی موحەممەدی (النفس الزکیە):

لەو ڕۆژەی حوسەین لەکەربەلا کوژراوە، (طالبي) یەکان مافی خۆیان لەخیلافەتدا لەبیر نەچووە. ئەوان لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیاندا پەلپیان بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان دەگرت، جا ئەگەر هەلیان بۆ بڕەخسایە سوودیان لێ وەردەگرت، کە بشیانزانیبایە لاوازن کپ دەبوونەوە. کاتێکیش بانگەشەی عەباسی دەستی پێکرد هەندێ لەشیعەکان بەشداریان تێدا کرد، چونکە پێیان وابوو بانگەشەکە بانگەشەیەکی (طالبي)یە، هاوکات هەندێکی تریان بەشداریان نەکرد، چونکە چاوەڕێ بوون کارەکان جێی خۆی بگرێ، هەر چەندە پشتگیریشیان لەبیرۆکەی شۆڕشکردن دژی ئەمەوییەکاندا، دەکرد.

وادیارە پەیوەندی نێوان عەباسیەکان و (طالبي)یەکان لەکاتی بانگەشەی عەباسیدا باش بووە، کاتێکیش شۆڕش کۆتایی هات و خیلافەت کەوتە دەستی بنەماڵەی عەباس، (طالبي)یەکان، بەتایبەتی (لقی حەسەنی)، پێیان وابوو کە عەباسیەکان هەڵیانخەڵەتاندون و خیلافەتیان بۆ خۆیان زەوت کردووە هەرچەندە مافی ئەمانە. خۆڕاگرتن بەرامبەر تەنگ پێهەڵچنینی ئەمەویەکان ئاسان نەبووە، ئەگەرچی بانگەشەکە بە ناوی ئەمانەوە دەستی پێکرد ومافیشیان پێشیل دەکات، بۆیە کەوتنە دژایەتی کردنیان.

عەباسیەکان لەسەرەتای ژیانی سیاسیاندا لەلایەن خۆیانەوە هەوڵیان دا هاوکار بن لەگەڵ (طالبي)یەکاندا بۆ ئەوەی دەرفەتێك بدەنە دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەیان جێگیربێت، پاشان وردە وردە ئەم دوو کۆمەڵە لەیەکتری دوورکەوتنەوە، ئەوەش کاتێك خوێنڕێژ لە وتارێکیدا لەکوفە ڕایگەیاند کە خیلافەت عەباسییەو بەعەباسی-یش دەمێنێتەوە، کەسیش مافی تێدا نیە، مەبەستی لەم قسەیەش (طالبي)یەکان بوو ([1]).

بەڵام پەیوەندی نێوان هەردوولا هێمنی و ئاشتیخوازی پێوە دیار بوو، پاشان

---

[1] بگەڕێوە بۆ دەقی وتارەکە لەلای - الطبري - : ب ٧ ل ٤٢٤-٤٢٦.

لەسەردەمی مەنسوردا ئەم پەیوەندییە بەرەو گرژی و ئاڵۆزی دەچوو و دواتر بووە پێکدادان. ئەم خەلیفەش کە هەستی کرد بەرهەڵستی (طالبي) بۆتە مەترسیەکی گەورە و دوژمنێکی سەرسەخت. کەوتە هەڕەشەکردن لە هەر کەسێك لە دەوڵەت یاخی بێ.

یەکەم کەس لە ناو (طالبي)یەکاندا لەعەباسیەکان یاخی بوو، (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەن) بوو، ناسراو بە (النفس الزکیە)، ئیبراهیمی برای، ئەم دووانەش سەربە (لقی حەسەنی)ن، لە کاتێکدا ئیمام (جەعفەر –الصادق–) کە سەر بە (لقی حوسەینی) یە پەنای برد بۆ شەڕ ڕاگرتن و ڕێکەوتن، توانی قەناعەت بە شوێنکەوتووانی بکات کە باروتۆخەکە گونجاو نیە بۆ دامەزراندنی خیلافەتی (طالبي).

وادیارە ئەم (موحەممەد)ە بانگەشەی بۆ خۆی دەکرد، بەتەمابوو پێش ئەوەی عەباسیەکان بگەنە دەسەڵات، خیلافەت بگرێتە دەست، جا لایەنگرانیشی بۆ پەیدا بوو و لەحیجاز و عێراق و خۆراسان بانگەشەیان بۆ دەکرد، کەوتە خۆئامادە کردن بۆ ڕۆژی چاوەڕوانکراو. بەڵام ئەو هەڵەی کرد کاتێك وایزانی ئەو بانگەشەی کە لەخۆراسان بڵاوبۆتەوە و دروشمی رازیبوون لە (ال بیت)ی بەرزکردۆتەوە، بانگەشەکردنە بۆ (طالبي)یەکان و خۆی پاڵێوراویانە بۆ خیلافەت ([1]).

جا کاتێك عەباسیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، ناڕازی بوو و بەیعەتی بە خەلیفە خوێنڕێژ نەدا، ویستی لە دەسەڵاتەکەی یاخی بێ، بەڵام باوکی ڕێگەی پێ نەدا، چونکە خەلیفە خاوەن چاکە بوو بەسەریدا ([2]).

کاتێك ئەبو جەعفەری مەنسور خیلافەتی گرتە دەست، دیسانەوە هەردوو برا موحەممەد و ئیبراهیم بەیعەتیان پێ نەدا و لەحیجاز لەشوێنێکی نهێنیدا خۆیان

---

[1] وادیارە موحەممەد پشتی بە بڕیار لەسەر دراوەکانی ئەو کۆنگرەیە قایم کرد بوو کە لە – ئەبواو – سازکرا بوو لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئەمەویدا، کەوا عەبدوڵڵای کوڕی حەسەنی باوکی، بانگەشەی بۆ کرد و پیاو ماقوڵانی – طالبي – و عەباسی –ش تێدا ئامادە بوون، ئامانجی ئەو کۆنگرەیە دەست نیشانکردنی (النفس الزکیە) بوو بۆ خیلافەت، دەربارەی ئەو کۆنگرەیە بگەڕێوە بۆ : ابن الاثیر، ب٤ لا٣٧٠. ابن الطقطقا : لا١٦٤–١٦٥.

[2] الاصفهاني :مقاتل الطالبین لا١٦٥.

حەشاردا بوو ([1]). ئەمەش خەلیفەی نیگەران کردبوو. بۆیە زور گەڕا بەدوایاندا تا دۆزینیەوە. ئەو کاتەش بڕوای موحەممەدی (النفس الزكيه) وابوو کە بارودۆخی دەرچوونی کاتی خۆی هاتووە، ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێك ڕەنگە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوە بن :

- عەباسیەکان تەنگیان پێ هەڵچنی.
- مەنسور خەشم و توورەیی خۆی ڕشت بەسەر کەسوکاریدا بۆ ئەوەی فشار بخاتە سەریان تا خۆی و براکەی ڕادەست بکەن.
- هەروەها چەندین نامەی پشتگیری بۆ هات لەفەرمانڕەوای هەرێمەکان و سەرکردە گەورەکانی مەنسور، هانیان دەدا ڕاپەڕێ ([2]).
- خەڵکێکی زۆر دانیان بە ئیمام بوونی دەنا، بەتایبەتی خەڵکی حیجاز.
- پێداگری هاوڕێکانی لەسەر دەرچوونی پاش ئەوەی کە بێزار بوون لە چاوەڕوانی.
- باوکی پشتگیری لێ دەکرد و لە دەرچوونە کەشی.
- ئیمام مالك فەتوایەکی دا، ڕێیدا بەیعەتی پێ بدرێ و بەیعەتی مەنسور ڕەت بکرێتەوە.
- بڕوای وابوو کە ئەو لە مەنسور بەهێزتر بۆتەوە ([3]).

بۆیە بانگەشەکەی ڕاگەیاند و لە سەرەتای (مانگی ڕەجەب ساڵی ١٤٥ك/مانگی ئاب ساڵی ٧٦٢ن) لە (مەدینە) دەرکەوت و نازناوی (أمير المومنين)ی ([4]) لەخۆی نا، لەکاتێکدا ئیبراهیمی برای ڕۆیشت بۆ بەسرە تا لەوێ ئاڵای ڕاپەڕین بەرزبکاتەوە([5])، لایەنگرانی (طالبي) یەکانیش دەستیانکرد بە پۆشینی جلی سپی.

---

[1] ابن الاثير : ب ٤- ل٣٧٠.

[2] جێی باسە کە نامەی سەرکردەکانی مەنسور بە مەبەستی چەواشکردنی ناردەیانە و بە فەرمانی مەنسور خۆی بۆ ئەوەی پەلە بکات لە دەرچونی.بگەڕێوە بۆ : هەمان سەرچاوە : ب٣ ل٢٥٣.

[3] المسعودي : ب٣ ل٢٥٣. ابن الاثير: ب ٥ ل٣.

[4] اليعقوبي : ب ٢ ل ٣١٥.

[5] هەمان سەرچاوە.

ئەوەی کە لە مەنسور شاراوە بوو، ئاشکرابوو، زانی کەوا مەدینە بنچینەی موحەممەدی (النفس الزکیە) یەی و شوێنی دەرچوونێتی، بۆیە جەختی کردەوە سەر حیجاز تا ڕێ نەدا بانگەشەکەی بڵاوبێتەوە، پاشان پەنای بردە بەر فرت و فێڵی سیاسی و بانگهێشتی کرد بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانیان بە شێوەیەکی ئاشتیانە، هەر لەبەر ئەم مەبەستەش زنجیرە نامەیەکی لەگەڵیدا ئاڵوگۆڕ کرد ([1])، هاوکات پلانی پێویستی دانا بۆ جیا کردنەوەی حیجاز لەشارەکانی تر، بۆ ئەوەی کۆمەکی نەکرێ وخەڵکی لەبانگەشەکەی دووربخاتەوە، پاشان کەوتە ڕێ بۆ کوفە، کە لانەی شیعەکانە، وە مشتی خۆی توند کرد لەسەری ([2])، هەروەها سەرکەوت لە دوورخستنەوەی خۆراسانیەکان لەپاڵپشتی کردنی ([3]).

جا هەنگاوی یەکلایی کەرەوە هات بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەکەی لەسەر دەستی تیپە سەربازییەکاندا، موحەممەدیش خێرا بە خۆی زانی کەوا ڕووبەڕووی گەلێ کێشە بۆتەوە، بەهۆی چەندین هۆکار گرنگترینیان :

- واز هێنانی زۆریەی خەڵکی مەدینە لەیارمەتی دانی ([4]).

- هەڵەی کرد لەهەڵبژاردنی کاتی دەرچوونی، چونکە ئەو لەگەڵ ئیبراهیمی برای وا ڕێککەوتبوو کە لەیەك ڕۆژدا دەرچن ئەو لەبەسرە و ئەمیش لە مەدینە، بەڵام براکەی لە ڕۆژی دیاریکراودا دەرنەچوو، بەهۆی فشار خستنە سەری پێش ڕۆژی دیاریکراو دەرچوو، لەئەنجامدا هەماهەنگیان لەدەستدا کە زۆر پێویستە بۆ سەرکەوتن، دەرفەتێکی باشیشی بە مەنسور دا کە سوودی لێ وەرگرت بۆ لێدانی هەردوو برا بەجیا.

- دوو دڵ بوو لە ڕووبەڕووبوونەوە دوژمنەکەی.

ئەوە بوو لەبەیانیەکی دوانزە شەوەی مانگی ڕەمەزاندا، شەڕی کۆتایی لە نێوان

---

[1] دەقی نامە ئاڵو گۆڕ کراوەکان لەلای – الطبري – دەبینیتەوە:ب٧ ٥٦٦٧-٥٧٢.

[2] هەمان سەرچاوە :٧ ٥٦٥

[3] هەمان سەرچاوە :٥٤٧٧

[4] هەمان سەرچاوە :٥٨٢-٥٨٣.

هەردوولا روویدا، بە سەرکەوتنی سوپای عەباسی و کوشتنی موحەممەد (النفس الزکیە) کۆتایی هات لەپاش نیوەڕۆی دووشەممە لەچواردەی مانگی ناوبراودا. (عیسای کوڕی موسا)ش کە سەرکردەی سوپای عەباسی بوو، خەڵکی مەدینەی دڵنیا کردەوە، بەڵام دەستی گرت بەسەر سەروەت و سامانی بنەماڵی (حەسەنی کوڕی عەلی)دا ([1]).

ئابەم شێوەیە یەکەم بەش لەبەشەکانی ئەم تراژیدیایە کۆتایی هات، مەنسووریش هیچی لەبەردەم نەما جگە لەوەی بزوتنەوەی ئیبراهیم لەبەسرە لەناوبەرێ.

---

[1] الطبري : ب ٧ ل٥٩٦.الاصفهاني :ل٢٣٦ –٢٣٧.

## یاخی بوونی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵلا

لەپاش ئەوەی حیجازی بە جێهێشت، ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵلا لەبەسرە نیشتەجێ بوو، چونکە زەمینەیەکی لەباری تێدا بینی بۆ گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی ئەو بیرۆکانەی کە پشتگیری لە (طالبي) یەکان دەکەن. ئەوە بوو (زەیدی و موعتەزیلە)کان چوونە ژێر ئاڵاکەی، هەروەها لاوازەکان و چینی هەژارو نەدارەکان پاڵپشتیان کرد، بەئومێدی ئەوەی ڕزگاریان بکات لەنەداری، ئەمەویەکانیش پشتگیریان لێ کرد و عوسمانیەکانیش پاڵپشتیان کرد، بەهۆی ئەوپەیوەندیە خزمایەتیەی کە لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففاندا هەیبوو، فەقێکانی بەسرەش پشتیان قایم کرد.[1]

بە هۆی ئەم هۆکارانەوە بەئاسانی توانی زاڵ بێ بەسەر بەسرەدا، ئەهوازو فارس و مەدائین- یش[2] هاتنە ژێر فەرمانی، سەبارەت بەکوفەی پەرۆش و ئامادە بۆ ڕزگار بوون لە دەسەڵاتی عەباسی، ئەوا مەنسور مشتی توند کردبوو لەسەری، بۆیە بێ بەشی کرد لە کۆمەکی ڕۆڵەکانی[3]

بزوتنەوەکەی ئیبراهیم گەشەی کرد، خەڵکی پۆل پۆل ڕوویان لێدەکرد بۆ ئەوەی بەیعەتی پێ بدەن، بۆیە پشتی قایم بوو و هەستی کرد کە کاتی ئەوە هاتووە ڕووبەڕووی خەلیفە ببێتەوە. کاتێك هەواڵی کوشتنی براکەی پێگەیشت، بانگەشەکە خیلافەتی بۆ خۆی کرد و ناوی (أمیرالمومنین)ی لەخۆینا و شوێنکەوتووانی بەیعەتیان پێدا لەسەر ئەوە.[4].

ئەوەی ڕاست بێ ئەم بزوتنەوەیە بەهێزترین بزوتنەوە بوو کە ڕووبەڕووی مەنسور ببێتەوە، چەنکە زاڵبوونی ئیبراهیم بەسەر ناوچە گەلێکی بەرفراوان و دەوڵەمەندا کاریگەریەکی نەرێنی هەبوو لەسەر تواناکانی دەوڵەت، بۆیە خەلیفە لێی ترسا و

---

[1] المسند، عبدالله بن علي :الطلويون في الحجاز لا ١٧٠- ١٧١

[2] ابن كثير: ب١٠ لا ٩٢.

[3] الطبري :ب ٧ لا٦٤١.

[4] ابن كثير :ب١٠ لا٩١. ابن الطقطقا: لا١٦٧.

ویستی لە کوفە هەڵبێت و بگاتە مەهدی کوڕی لە (ڕەی)، هەروەها ویستی نامە بۆ ئیبراهیم بنێرێ بە مەبەستی ئاشتبوویەوە.[1]

سەرئەنجام هەردوولا بەچەك ڕوبەڕوی یەکتر بوونەوە لە (باخمرا) گوندێکی نزیکە لە کوفە، لە (مانگی – زی القعدە ساڵی ١٤٥ك/مانگی کانونی دووهەم ساڵی ٧٦٣ز)، خەریك بوو سوپای عەباسی، کە (عیسای کوڕی موسا) سەرکردایەتی دەکرد، تیکشکێ و عەلەویەکان لەسەرکەوتن زۆر نزیك بوون، بەڵام لە ناکاوە ئاراستەی شەڕەکە گۆڕدرا، کاتێك تیرێك گەردنی ئیبراهیمی پێکا و کوشتی، لەبەر ئەوەش شیرازەی سوپاکەی تێکچوو، سوپای عەباسیش هێرشی کردە سەریان و لەئەنجامدا سەرکەوتن[2]

## ڕەوشی ناو مەغریب

عەبدولڕەحمانی کوڕی حەبیب، کە یەکێکە لەڕابەرە ناودارەکانی عەرەب، توانی دەست بگرێ بەسەر ئەفریقیا (مەغریبی نزیك)، بە هۆی ئەو ئاژاوە و بێ یاساییەی کە جیهانی ئیسلامی گرتبووەوە لەکاتی ململانێی نێوان ئەمەوی و عەباسیەکان لەسەر دەسەڵات، چووە ناو ( قەیرەوان)ەوە بەئومێدی ئەوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنێ [3].

وادیارە ئەم (عەبدولڕەحمان)ە لە چۆنێتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت شارەزا نەبووە، لەمیانەی هەڵسوکەوتە سیاسیەکانی دەرکەوت کە هونەری حوکمڕانی نازانێ، بۆیە بووە قوربانی خۆویستی و چڵێسی خۆی، ئەوە بوو لە ساڵی (١٣٧ك/٧٥٤ز) لە سایەی ئاژاوەی ململانێ لەسەر دەسەڵات، تیرۆر کرا[4].

ئا لەم کاتەدا، (خەواریجەکان) لەسەر شانۆی سیاسی لە ئەفریقیا دەرکەوتن، خۆیان

---

[1] المسند :ل١٧٢.

[2] الطبري :ب ٧ ل٦٤٦-٦٤٧.

[3] ابن عذاري :ب ل٦٥.مؤنس، حسين:تاريخ المغرب وحضارتة من قبيل الفتح الاسلامي الي الغزو الفرنسي :ب١ل١٦٤.

[4] مؤنس: هەمان سەرچاوە.ل١٦٦.

مات دابوو بۆ ئەوەی وڵات زەوت بکەن، سەرکەوتن لەڕاکێشانی هۆزەکانی بەربەر[1] کەوا کاریگەربوون بە بیرو بۆچوونەکانیان و چەند دەوڵەتێکیان بۆ دروست کردن لە ناوی.

مەغریب، لەو کاتەدا، دەرکەوتنی دوو میرنشینی خەواریجی بەخۆوە بینی کە لەسەر شانی بەربەرەکان هەستا بە سەرۆکایەتی ڕابەرانی عەرەب، تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆبوون.

سەبارەت بە میرنشینی یەکەم، ئەوا میرنشینی (سجلماسە) بوو. کە بریتیە لە دەوڵەتی بنەماڵەی (مدرار) یاخود بنەماڵەی (واصول)ی سەفەری (❁) وە مەزهەبی (سەفەری) یان لەخۆگرتووە. لەساڵی (١٤٠ك/٧٥٧ز) لەباشوری مەغریبی دوور دامەزرا، لەو ناوچە نیمچە بیابانەی کەوا زەویی تەخت و مێرگ لەخۆ دەگرێ لەباشوری چیاکانی ئەتڵەس و لە سەرووی بیابان لەلای باکوورەوە.

ئەم میرنشینە ناودارترین میرنشینی سەربەخۆی خەواریجەکانە کەوا لەسەردەمی خەلیفە مەنسوردا دامەزرا، سەدو چل ساڵ بەردەوام بوو. ناسراو بوو بەدەوڵەمەنی و شوێنە بازرگانیە(٥)گرنگەکەی، هەروەها بازاڕێکی گەورەبوو بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەو شمەکانەی کە لەباشوور و ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتنە ناوی بۆ ئەوەی بگوازرێتەوە بۆ حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست، یاخود لەم حەوزەوە بۆ ناو جەرگەی ئەفریقیا.

سەبارەت بە میرنشینی دووهەم، ئەوا میرنشینی (إباضیة) بوو، ئەم ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ (عەبدوڵلای کوڕی –إباض– ی مری)، لەمەغریبی ناوەڕاست دامەزرا لەساڵی (١٤٤ك/٧٦١ز). کابرایەکی فارسی دایمەزراند، وادیارە (عەبدولڕەحمانی کوڕی ڕۆستەم) بووە، نازناوی ئیمامی هەلگرت. پایتەختی ئەم میر نشینە (تاهرت) بووە

---

[1] تێبینی دەکرێ کە زۆربەی بەربەرەکان، کەوا بەشداریان کرد لە بزوتنەوەی خواریجەکان، – زەناتی – بوون واتە دەشتەکیکانی زیاتر.مۆنس:ب١ ل١٦٥.

❁ ئەم میرنشینە کابرایەکی سودانی دایمەزراند، ناوی (عیسای کوڕی یەزیدی مکناسی حەفەری یە. سەبارەت بە ناونانی بە بنەماڵەی (مدرار) یاخود بنەماڵەی (واصول) ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ناوی سێهەم میرەکەی (ئەبو لقاسمی سەرمەونی کوڕی واصول- ) کە نازناوی (مدرار)ی لێنراوە

کەوا لەساڵی (١٥٠ك /٧٦٣ ن) خۆی دروستی کردوە، قەدەری خەلیفەکانی وابوو کە زیاتر لە سەدو سی ساڵ حوکمڕانی بکەن، ئەوان لە خەواریجە هەرە دەمارگیرەکان بوون. کۆمەڵگەی ئەم میرنشینە لەسەر بنەمای یەکسانیەکی تەواوەتی لەنێو خەڵکیدا و ژیانێکی ڕەوشت بەرزانە، هەستابوو، لەبەر ئەمەش بەربەرەکان بینیان کە مەزهەبی خەواریجەکان گونجاوە لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی-یان، بۆیە کردیانە ناونیشانێك بۆ بەرهەڵستکاریەکی دەمارگیری.

وادیارە ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوو گروپەکەی خەواریج (صفریە و إباضیة) بەهۆی جیاوازی لەبیرو بۆچوونی ئاینی.

جا ئەفریقیاش کەوتە ژێر ڕەحمەتی خەواریجەکان، هەرجارێ کۆمەڵەیەك دەسەڵاتەکەی دەگرتە دەست، ئەمەش پاڵی بە خەڵکەکەیەوە نا هانا بەرنە بەر خیلافەتی عەباسی.

مەنسوریش بەرامبەر ئەم بزوتنەوە ناحەزانە دەستەوسان نەوەستا، بەڵکو چەندین شاڵاوی سەربازیی ڕەوانەی مەغریب کرد، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی تیا بسەپێنێ.

یەکێك لەم شاڵاوانە بەسەرکردایەتی (یەزیدی کوڕی حاتەمی کوڕی- قبیصە) بەڕێوەچوو و توانی بەسەر خەواریجە (أباضیة)کاندا سەرکەوێ لەساڵی (١٥٥ك/٧٧٢ن). جا لەپاش ئەوەی سوپای عەباسی توانی قەیرەوان بگەڕێنێتەوە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە سایەی دەسەڵاتی ئەهلی سوننە لەخۆشگوزرانی و هێمنی و سەقامگیریدا بوو.

ئا بەم شێوەیە مەنسور توانی ویلایەتێکی ئەفریقی بگەڕێنێتەوە، بەڵام دەسەڵاتی نەگەیشتە ناو مەغریب.

## زیندووکردنەوەی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی لەئەندەلوسدا

ئەندەلوس زۆرترین کاریگەری لەسەر بوو کاتێك خیلافـەت لـەئەمەویکانـەوە کەوتـە دەستی عەباسیەکان. ئەوە بوو بەدەستی ئاژاوەی ململانێی رەگەزپەرستی و هـەرێمی دەینالاند لەقۆنـاغی نـەبوونی دەسـەڵاتی ناوەندیـدا کـەوا لـەنێـوان دوو سـاڵی (١٢٤-ك/٧٤٢-٧٥٦ن) بـەردەوام بـوو، شـەڕی نـاوخۆ هەڵگیرسـا لـەنێـوان قەیـسیەکان و یەمەنیەکانـدا، (مجـری)یـەکانیش لـەسـاڵی (١٣٠ك/٧٤٨ن) یەمەنیـەکانیان شـکاند لە(شقندە)، کە دەکەوێتە بەردەمی (قورگبە).([1])

تا لەم کاتەدا دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی بەدەستی عەباسیەکانەوە روخا لـەساڵی (١٣٢ك/٧٥٠ن)، جا کاربەدەستە عەباسیـەکان کـەوتنـە کوشتنی ئەمەویـەکان، بـەڵام میرێکی ئەمەوی توانی خۆی لە راونانیان رزگار بکات، ئـەویش عەبدولرەحمانی کـوڕی موعاویەی کوڕی هیشامی کوڕی عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەروان بـوو، بـەرەو مـەغریب چوو.

عەبدولرحمان ناسراو بوو بەوەی کە کەسێکی ئاوات بەرزە، بۆیە بڕیاریدا دەوڵەتێك لەمەغریب دامەزرێنێ، ئەگەرچی دوچاری بەرهەڵستی عەبدولرەحمانی کـوڕی حـەبیبی فهری - والی ئەفریقیا - بووەوە، ئـەوجا ڕووی لـە ئەنـدەلوس کـرد کـەوا بـارودۆخی تێکچوو بوو، بۆی دەرکەوت کە لەم هەرێمەدا دەرفەتێکی باشـتری هەیـە بـەراورد بـە مـەغریب، (بـەدر)ی خزمـەتکاری، کـە بـۆ ئـەوێ نـاردی بـەمەبەسـتی خوێندنـەوەی هەڵویستەکان، توانی بناغەیەك بۆ ئەمەویەکان دانێ بەپشت بـەسـتن بـە یەمەنیـەکان. ئەوەی ڕاستی بێ یەمەنیەکان، کەوا پەیوەندیەکی خزمایـەتی بـەخانـەوادەی مـەڕاونی دەیانبەستێتەوە، پێشوازیان لـەم میرە ئەمەویە کـرد تـا لـەکۆت و بـەندی قورسـی قەیسیەکان ڕزگار بن، تۆڵـەی کـوژراوەکانیـان لـەکارەسـاتی (شـقندە) بکەنـەوە. جـا لایـەنگرانی مـیری ئەمـەوی ئەوەنـدە پـشتیان قـایم بـوو بانگهێـشتیان کـرد، ئـەویش دەربەندی پەڕییەوە لـە (مـانگی رەبیعـی دووهـەم سـاڵی ١٣٨ك/مـانگی ئـەیلول سـاڵی

---

[1] مؤلف مجهول:اخبار مجموعة :٥٩٧.

٧٥٥ن)، و بە میوانی لەلای ئەبو عوسمان لە قەڵای (گرشە) ([1])، دابەزی.

فەرمانڕەوای ئەندەلوس لەو کاتـەدا (یوسـفی کـوڕی عەبـدولڕەحمانی فهـری) بـوو، بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینـە بـەدەستی ڕابـەری قەیسیەکان بـوو (الـصمیل–ی کـوڕی حاتەم). هەردووکیشیان هەستیان بەمەترسی ئەم میرە ئەمەویە کردبـوو لـەسـەریان، بەتایبەت ئەو متمانەی بەشێکی گـەورەی لـەکۆمەڵگـەی ئەندەلوسـی بـەدەستهێناوە، بۆیە بڕیاریان دا بەرەنگاری بکەن بۆ ئەوەی ناچار بێ بگەڕێتەوە یان ملکەچیان بێ.

سەبارەت بە عەبدولڕەحمان، ئەوا لەلایەن خۆیەوە ئامادە بوو ڕووبەڕوویان بێتـەوە و قەڵای (طرشة) ی بەجێهێشت و هات بۆ (أرشذونة)، کەوا پشتگیری خۆیان بـۆ دەربـڕی ([2]) پاشـان چـووە نـاو (ئەشـبیلیە)و خەڵکـەکـەشـی بەیعـەتیان پێـدا ([3])، ئـەو تیپـە سەربازییانەی کە لە دیمەشق و (حمص) و ئوردونەوە هـاتبوون چوونە پـاڵی، ئـەوجا ئەشـبیلیەی بـەجێهێـشت و بـەرەو (قرطبـة) ڕۆیـشت، لەگـەڵ هێزەکـانی (الـصمیل و الفهری) لەلای (مەسارە) بەیەك گەیشتن لە (مـانگی – ذی الحجە سـاڵی ١٣٨ك/مـانگی ئایـار سـاڵی ٧٥٦ن) وە سـەرکەوت بـەسـەریانداو چـووە نـاو (قرطبـة) و لـەمزگەوتـە گەورەکـەی نوێـژی هـەینی بـە خـەڵك کـرد، وتـاری بۆیـان خوێنـدەوە و دامەزرانـدنی دەوڵەتە تازەکەی ڕاگەیاند، هەریەك لە(الصمیل و الفهری)یش ناچار هەڵهاتن ([4]).

ئا بەم شێوەیە ئەم میرە ئەمەوییە دەرکراوە توانی سەر لەنوێ دەوڵەتی خیلافـەتی ئەمەوی کەوا لـەڕۆژهـەڵات ڕوخـا، زینـدوو بکاتـەوە، ئەندەلوسیش بکاتـە دەوڵـەتێکی سەربەخۆ و یەکەم ویلایەت کە لەدەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دابڕێ.

عەبدولڕەحمان داخل ([5])، لـەسـەرەتای حوکمڕانیی ڕووبـەڕووی دوو گرفـت بـووەوە. یەکەمیان بـریتی بـوو لـەڕاپـەڕینی کۆمـەڵێ بزوتنـەوەی بەرهەڵـستکار بەسەرپەرشتی (الصمیل والفهری)، ئەوە بوو تـوانی کپیـان بکاتـەوە، بـەکوشـتنی ئـەم دوو ڕابـەرەش

---

[1] ابن عذاري ابومحمدعبداللة محمدالمراكشي:البيان المغرب في اخبارالالس والمغرب :ب ٢لا ٤٦.

[2] اخبارمجموعة :٨٥.

[3] هەمان سەرچاوە : ٨٦لا.

[4] هەمان سەرچاوە : ٨٩–٩٠.

[5] میر عەبدولڕەحمان نازناوی (الداخل)ی لێنرا واتە هاتۆتەناو ئەندەلوسەوە

کۆتاییان هات.([1]).

دووهەمیان بریتی بوو لە هەوڵدانی خیلافەتی عەباسی بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی تازە دامەزرێنراو و گەڕانەوەی دەسەڵاتی بۆ سەر ئەندەلوس، لەپاش ئەوەی کە پێی ناخۆش بوو ئەمەویەکان بەشێك لەدەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی دابڕن.

لەڕاستیدا ئەبو جەعفەری مەنسور ئەو ڕەوشە نائارامەی بەهەلزانی کە عەبدولڕەحمان داخل بەدەستیەوە دەیناڵاند، نهێنییانە پەیوەندی بە یەکێك لە رابەرەکانی عەرەب کرد ناوی (العلاء بن المغیث الجذامي)یە، هانیدا دوژمنەکەی بکوژێ و بەڵێنی پێدا بیکا بە میری وڵاتەکەی و سوپا سالاری دەوڵەتی عەباسی و فەرمانی دامەزراندیشی لەئەندەلوس بۆ نارد.([2])

(العلاو) کەوتە بانگهێشت کردنی خەڵکی بۆ گوێرایەڵی کردنی خەلیفە مەنسور، لەساڵی (١٤٦ك/٧٦٣ز) هەڵبەزو دابەزی سیاسیی بزوتنەوە ڕەگەزپەرستەکانی بەهەلزانی و زیاتر بایەخی بە یەمەنیەکانی دا، چونکە وادیارە بێزاربوون لە دەسەڵاتی عەبدولڕەحمان داخل چونکە دەسەڵاتی بۆ خۆی قۆرغ کرد و هیواو ئاواتەکانیانی نەهێنایەدی بەرامبەر ئەو یارمەتیەی کە پێشکەشیان کرد لەململانێی لەگەڵ (مضریة)کاندا. لەلایەن خۆیەوە عەبدولڕەحمان قایل نەبوو ببێتە ئەمیرێکی گوێرایەڵ بەدەستی ئەمانە، بۆیە چووە پاڵی (قیسی)یەکاندا، ئەمەش بووە مایەی توڕەییان و وایکرد بچنە ڕیزی بزوتنەوەی (العلاو)، هەروەها (فهری) یەکانیش کە بەشێك بوون لە قەیسیەکان، بەهۆی دوژمنایەتی نێوانیان چونە ڕیزی ئەم بزوتنەوەیە.

لەپاش یەك ساڵی پڕ لەپەیوەندی کردن و ئامادەباشی، -العلاو- لەساڵی (١٤٧ك/ ٧٤٦ ز) شۆڕشی خۆی دژی ڕژێمی ئەمەوی ڕاگەیاند و ئاڵا رەشەکانی عەباسی بەرزکردەوە، بەڵام میری ئەمەوی توانی شۆڕشەکەی لەناوبەرێ و خۆی و چەند پیاوێکی بکوژێ و سەرەکانیان بۆ مەنسور بنێرێتەوە([3])، کەوا بۆی دەرکەوت ئەو

---

[1] Provencal-lcvi: histoire de lE spene musulmqne.tomi p ١٠٨

[2] ابن عذاري : ب ٢ ■ ٥٢.

[3] اخبار مجموعة : لا ١٠٢

مامەڵە لەگەڵ میرێکی بەهێز دەکات و ڕەنگە لەخۆی زۆر زیرەك و سەرکەشتر بێ.
سەرنەکەوتنی ئەم هەوڵەبەس بوو بۆ ئەوەی وازبێنێ لەپرۆژەی هێنانەوەی ئەندەلوس، دژایەتی کردنی بۆ عەبدولڕەحمان ڕێگر نەبوو لەوەی بچێتە دڵیەوە و ناز ناوی (هەڵۆی قورەیش)ی لێ بنێ([1]).

. ڕەوشی دەرەکی لەسەردەمی مەنسوردا

## پەیوەندی لە گەل – بیزەنتیەکاندا

جەنگی نێوان موسڵمانەکان و بیزەنتیەکان لەسەردەمی مەنسوردا، هێمنیەکی پێوە دیار بوو، جگە لەوردە شەڕی جاروباری سەرسنور، ئەوەش چونکە عەباسیەکان سەرقاڵی بەهێزکردنی ناوەوەی خۆیان بوون. لەبەرامبەردا، ئیمپراتۆری بیزەنتی (قسگنگین)ی پێنجەم خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ جەنگی بولغارەکان لە(بلقان)دا، ئەمە لە لایەکەوە، بۆ کێشەی پەرستنی ئایقۆنەکان لەلایەکی دیکەوە.

بەرامبەر بەم ڕاستییە، خەلیفەی عەباسی بە تەما بوو قەڵا و شوێنە سنوورییە وێرانراوەکان نۆژەن بکاتەوە، تا بارودۆخ کپەو شەڕ ڕاگیراوە.

وادیارە مەنسور سیاسەتێکی هێرش ئامێزی پەیڕەو دەکرد بەرامبەر دەوڵەتی بیزەنتی، بریتی بوو لەهەوڵدان بۆ پەکخستنی هێرشی دوژمن لەڕێگەی بەهێزکردنی شوێنە سنوریەکان و نۆژەن کردنەوەی وێرانکراوەکانی و دروستکردنەوەی ڕوخاوەکانی، ئەوجا جێگیرکردنی هۆیەکانی بەرگری کردن لەناویدا. جێی باسە کە ئەم ناوچە سنوورییانە دوو بەش بوون :

یەکەمیان : ناوچە سنوریەکانی جەزیرە، ئەمانەش بۆ بەرگری کردن لەجەزیرە تایبەت کرابوون، واتە باکوری عێراق، گرنگترین قەڵاکانی بریتیی بوو لە (ملطیة – المصیصە و مرعش).

دووهەمیان : ناوچە سنوریەکانی شام، دەکەوێتە ڕۆژئاوای ناوچە سنوریەکانی

---

[1] ابن الخطیب، لسان الدین :اعمال الاعلام فیمن بویع قبل الاسلام من ملوك الاسلام.لا ٩–١٠.

جەزیرە، بۆ بەرگریکردن لەولاتی شام تایبەت کرا بوون، گرنگترین قەلاکانی بریتی بوو (طرسوس و أذنة و عین زربة).

مەنسور ئەم ناوچانەی قایم کردو بەدەسەلاتێکی ئیداری سەربەخۆ تایبەتی کرد، پڕی کرد لە هەزاران جەنگاوەر و پاسەوان، پارەو زەوی و زاریان پێ بەخشی، خانوو و تەویلەیان بۆ دروست کرد، سیستەمێکی سەربازی بۆ دانان لە سەری برۆن.

ئەمەو ئەو شالاوانەی کە لەناوچە سنوریەکانی شامدا دەرئەچوون، وشکانی و دەریاییش بوون لەهەمان کاتدا ([1]). کەشتیە جەنگیەکانی میسر و شام رۆلێکی هاوبەشی گرنگیان لەم ناوچەیەدا دەگێڕا.

بەم سیستەمە سەر سنوریەش، مەنسور توانی سنورێك بۆ تەماحی بێزەنتیەکان دانێ.

ناوچەکانی سەرسنور لەسەردەمی مەنسوردا وردە شەڕێکی تیا دەکرا، هەر جارێك لایەنێکیان هێرشی دەکرد و هەلئەهات، جاروبار کپ ئەبووەوە و جاروباریش دەستی پێ ئەکردەوە، ئەمەش بەپێی رەوشی ناوخۆی هەردوو لایان بوو.

لەسالی (١٣٣ك/٧٥٠ز) (ملطیة) دوچاری هێرشێکی توندی بێزەنتی بوو بەسەرکردایەتی ئیمپراتۆر خۆی، توانی بچێتە ناوی و خەلکەکەی ناچار بکات و پەرژینەکەی بروخێنێ.([2]). لەبەرئەوەی ئەم شارە گرنگیەکی ستراتیجی هەیە، خەلیفە هێنایەوە و نۆژەنی کردەوە و پڕی کرد لە جەنگاوەر([3])، هەروەها (قلوذیة)ی نۆژەن کردەوە وپڕی کرد لەپاسەوان، (المصیصە)ی بینا کردو (مرعش)یشی نۆژەن کردەوە. ([4])

بێزەنتیەکان زوو زوو و درەنگ درەنگ هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی سەرسنوور، موسلمانەکانیش بەرپەچیان دەدانەوە بەناردنی (صوائف-

---

[1] البلاذري: ل٢٦٢.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە : ل ٢٦٣- ٢٦٤. تاریخ خلیفة بن خیاط: ب٢ ل ٤٤٥

[4] هەمان سەرچاوە:ل ٢٢٧، ٢٦٥.الیعقوبی : ب ٢ ■ ٣٨٢.

جەنگاوەرەکانی هاوین یاخود هێزی هاوینان)، ئەمەش بەدرێژایی سەردەمی مەنسور بەردەوام بوو، دواین (صائفە) لەساڵی (١٥٨ك/٧٧٥ز) بەسەرکردایەتی (مەعیوف کوڕی یەحیا) لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان (الحدپ) و رووباری جیحان، بەر سوپای سوپای بیزەنتی کەوت ([1])

## دروستکردنی شاری بەغداد

یەکێك لەو کارە گرنگانەی کە خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسور ڕاییەڕاندو کاریگەری هەبوو لەسەر ئایندەی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، بریتی بوو لە دروستکردنی شاری بەغداد. لەڕاستیشدا مێژووی ئەم شارە، بەوەی کە بنچینەیەکە لەبنچینەکانی ئیسلام، شان بە شان لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا دەڕوا تاوەکو ڕوخاندنی. عەباسیەکان پێش ئەمە سیانزە ساڵ، واتە لەو ڕۆژەی دەسەلاتیان گرتە دەست، بەبێ پایتەخت مابوونەوە تا ئەو کاتەی بەغدادیان دروست کرد.

مەنسور هەستی کردبوو بەو مەترسیانەی کە گەمارۆی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەی دەدات و ئامانجی ئەوەیە دەسەلاتی خانەوادەی عەباسی هەڵوەشێنێتەوە. بۆیە کەوتە گەڕان بۆ شوێنێکی گونجاو ببێتە پایتەختی نوێ و سەروەریی خانەوادەکەی بنوێنێ، بۆیە شوێنێکی هەڵبژارد لەلای گەیشتنی رووباری (الطراة) بە رووباری دیجلە، کە بەغدادی ئێستای تێدایە، دەروازەی مێژوو و ڕێگایەك بۆ ولاتانی رۆژهەلات. ئەمەو مەنسور کۆمەڵێ پاڵنەری سیاسی و سەربازی و ئابوری و کەشی هەبوو وای لێکرد دەست بەدروستکردنی بکات.

لەڕووی پاڵنەری سیاسیەوە، ئەوا زەحمەت بوو عەباسیەکان دیمەشق بکەنە پایتەختی خۆیان، بەهۆی دڵسۆزی خەڵکەکەی بۆ بنەماڵەی ئومەیە. هەروەها مۆرکی عەرەبێتی پێوە دیار بوو، دوور بوو لەولاتی فارس سەرچاوەی هێزی عەباسیەکان، بۆیە لە گواستنەوەی شارنشینی خۆیان بۆ لای ڕۆژهەلات، بەرژەوەندیەکی تایبەتیان

---

[1] تاریخ خلیفة بن خیاط:ب ٢لا ٤٥٨.الطبري: ب٨ لا ٥٧.

هەبوو. هەروەها، عەباسیەکان لە کوفە یاخود بەسرەش جێگیر نەبوون، کە دوو شاری گەورەن و هەر لەکاتی هاتنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی ئیسلامی بۆ عێراق، بوونیان هەیە. بێ گومان ئەم کارە هەر لەخۆیەوە ئەنجام نەدراوە، چونکە خەڵکی کوفە حەز بە شۆڕش بوون و شیعەگەرێتی و لایەنگری عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوڕەکانی زاڵ بوو بە سەریاندا، سەبارەت بە بەسرە ئەوا نەدەگونجا ببێتە شارنشینی دەوڵەت بە هۆی ئەو شوێنە دوورەی کە هەیبوو لەباشووردا.

بەڵام بەغداد دەزگایەکی نوێ و تایبەت بوو بۆ عەباسیەکان، نزیکیش بوو لە وڵاتی فارس، وە دروستکردنی، رێك لەگەڵ حەز و خواستی عەباسیەکاندا هات لەپاراستنی دەسەڵات و قوتاربوون لە (طالبي)یەکان و چوونە ناو قوناغێکی نوێ بۆ دەسەڵاتێکی عەباسی پوخت ([1])، پەیڕەوکردنی سیاسەتێك ئامانجەکەی دروستکردنی هاوپەیمانێتیەکی نوێ بێت لەناو کۆمەڵگەیەکی پڕ لەگروپی دەمارگیرو نەتەوە پەرست و بیرو بۆچوونی جیاواز، لەکاتێکدا کە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەقۆناغی گۆڕاندا تێپەڕ دەبوو، لەسیستەمی هۆزایەتیەوە بۆ سیستەمی شارستانی و بەرەو دامەزرانی کۆمەڵگەیەکی یەکگرتوو کە مەرجەکانی سرەوتنی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێدا بەدی بکرێ ([2]).

لە ڕووی پاڵنەری سەربازییەوە، ئەوا دیمەشق لەرۆژئاواوە نزیك بوو، بۆیە، نەدەگونجا بیکەی بە پایتەختی دەوڵەتێك لە دەریای سپیی ناوەڕاست درێژ بۆتەوە تا ڕووباری سند. نەدەکرا عەباسیەکان پایتەختی دەوڵەتەکەیان لە دواوەوەی چیاکانی فارس دانێن، چونکە لەهەموو شارەکانی تر دوور دەکەوێتەوە. ویڕای ئەمە هەرێمی عێراق ئەڵقەی گەیاندن بووە لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا. بەوەش بووە هۆی گرێدانی دوو رەگەزی سەرەکی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەیەکەوە([3]).

شوێنی بەغداد، لەرووی سەربازییەوە قایم و پارێزراو بوو، چونکە دوژمن نایگاتێ

---

[1] مؤلف مجهول: اخبار الدولة العباسية.ل١٦٥.

[2] فاروق عمر : طبيعة الدعوة العباسية. ل ٢٧.

[3] دائرة المعارف الاسلامية : ب٤ ل ٦.

تەنها لەسەر پرد یاخود ئاویارە نەبێ، جا ئەگەر پردەکان ببچڕێن و ئاویارەکان تێك بدرێن ئەوا دەستی پێ ناگا. رووباری دیجلە و فورات دوو پەرژین و کەندری سروشتی بوون بۆی، هەروەها ئەم شوێنە دوورە لە سنوری بێزەنتیەوە، ئەمەش وای لێدەکات ئارام بێ و دوور بێ لە هێرش و پەلاماری بێزەنتیەکان.

ئەمەو ئەرکی سەربازیی شارە ئیسلامیەکان گەشەی کرد، چونکە بوونە سەربازگەیەك شالآوە سەربازیەکانی تیا ئەکەوتە رێ بۆ فراوان کردنی خاکی ئیسلام، بەتایبەت موسڵمانەکان لەسەرەتای فتوحاتی ئیسلامیدا لەسەربازگەکانی دەرەوەی شار نشتەجێ بوو بوون، ئێستا کە ئەو سەربازگانە کران بە شار و ئاوەدان بوونەوە، بەرگری کردن لێی ئاسانتر بوو بەراورد بە بەرگری کردن لە سەربازگەیەکی دیار و نەشاردراو ([1])

دیمەنی سەربازی بە روونی لە شێوازی دروستکردنی بەغداد و قایم کردنی دەبینرێ. دوو پەرژین و چەندین کەندر دەوری داوە، ئەوجا کەندرێکی دەرەکی دەوری داوە پانیەکەی شەش مەترە ئاوی تیا ئەڕوا بۆ ئەوەی چواردەوری شارەکە بە ئاو بگرن تا وەکو دوورگەی لێبێت. هەر چوار دەروازەی شارەکەش ئامادەکراوە بە ڕێڕەوی گەورە کە لەدەرگا دەرەکیەکانەوە لادەدات. بەم شێوازە ئەندازیاریە پێشکەوتووە شارەکە توانایەکی بەرگری ئامێزی وەرگرت.

جا کە دوژمن بیەوێ بچێتە ناوی، ناچار دەبێ بۆ لای چەپ لابدات تا لە ڕێڕەوێکی تردا بچێتە ناوی، ئەمەش وایان لێ دەکات دەوروبەریان دیار و نەپارێزراو بێ و

---

[1] ئیمپراتۆری بێزەنتی – زەسکیس – لە ساڵی ٩٧٤ ز، هەوڵی دا بگاتە بەغداد بۆ روخاندنی خیلافەتی عەباسی. ئەوەش لاواز بوونی دەسەڵاتی ئیسلامی لە سایە خەلیفەی عەباسی – المطیع – هانی دا لەسەر ئەوە.جا هێرشی کردە سەر ناوچەی جەزیرە و دەستی گرت بە سەریا و گەیشتە دەوروبەری مێنشینی موسڵ، ئەوەندی نەما بوو بگاتە بەغداد، سوپای بێزەنتی دەیتوانی لە – ئامد – هوە بە درێژایی روباری دیجلە بێتە خوارەوە بۆ بەغداد. بەڵام ئەمە بەجێ نەهات لە بەر چەند هۆکارێك کە تائێستا نەزانراوە. لەوانەیە بە هۆی ئەو برسێتی و وشکە ساڵی و ڕنگە لەە دوور و درێژە بێت کە لەکاتی هاتنیاندا تووشی بوون، بۆیە گەڕایەوە و ئامانجەکەی نەهاتەدی.

دەربارەی ئەم شالآوە بگەرێوە بۆ :

Sehlumbereer : L Epopee Byzantine a la fin du Dixieme si cle.Tom ipp ٢٥٨-٢٦٠

(١)طاهر العميد : الة – ظاهر العسكرية في بناء بغداد المدورة. مجلة كلية الاداب، بغداد.١٩٦٩، العدد١٢، ل٣٠٢-٣١١

تووشی ئەو تیرانە بن کەئاراستەیان دەکرێ (١). هەروەها ئەرکی سەربازی پەیوەندە بەقەبارەی شارەکەوە، بۆیە دەبێ هاوسەرنگی نێوان رووبەری شارەکەو ژمارەی بەرگریکارەکان بپارێزرێ، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە بەغداد بە شێوەیەکی بازنەیی دروستکراوە، چونکە رووبەری شێوەی بازنەیی کەمترە لە رووبەری شێوەی چوارگۆشەیی لەهەمان زەویدا ([1])، هەروەها دووری بنکەی شارەکە لەبەشەکانی بازنەکە یەکسان دەکات. ئەمەش نیشانەی جەختکردنەوەی مەنسورە لەسەر یەکسانی لەگەڵ کارمەندەکانیدا([2])، هەروەها هەموو بەشەکانیشی بەر خۆر و هەوا دەکەون.

لەرووی پاڵنەرە ئابورییەکانەوە، ئەوا عەباسیەکان لە (مەککە) یاخود (مەدینە) جێگیر نەبوون، چونکە حیجاز هەرێمێکی هەژارە و لەگەڵ پلەوپایەی ئەم دەوڵەتە ئیسلامیە گەورەیەدا ناگونجێ، کە بەرەوە بەرفراوانی و گەشەکردن دەچێت.

شوێنی بەغداد، کەوا لە (وادی الرافدین – دۆڵی دوو زێ)یە لەسەر کەناری رووباری (الصراه)، ئەڵقەی گەیاندنە لە نێوان ولاتی شام و ولاتی فارسدا، هەروەها گرنگیەکی ئابوری هەیە وەکو ناوەندێکی بازرگانی، چونکە دەکەوێتە سەر رێگاوبان و رێرەوە ئاویی و وشکانی و دەریاییەکاندا، کە پەیوەندە بەبەشەکانی تری دەوڵەتەوە، لەرێگەی دیجلە و فورات و لقەکانیەوە، لە شام و جەزیرە و میسر و هند و سند و بەسرە و واست و ئەرمینیا و ئازەربایجان، ئازووخەی بۆ دێت، پەیداکردنی بژێوی تێدا ئاسانە، هەوای پاکە و خۆراکی ئایابی تیا بەدی دەکرێ، هەروەها ناوچەیەکی گەشە کردووە لە رووی کشتوکاڵیەوە و لکاوبوو بە چەندین جۆگەی ئاودێری کە بەوردی رێکخرا بوون.

لەرووی کەش وهەواوەوە، ئەوا مەنسور کۆمەڵێ دیدەوانی نارد بۆ ئەوەی شوێنێکی گونجاوی بۆ بدۆزنەوە شارنشینەکەی تیا دروست بکات، ئەوە بوو شوێنێکیان هەڵبژارد نزیکی (بارمما) لەباشووری موسڵ. مەنسوریش خۆی و پیاوەکانی چوون بۆ ئەو شوێنە و شەوەکەشی لەوێ مانەوە. کە رۆژ هەڵهات راپرسی

---

[1] سامح، كمال الدين : العمارة في صدر الاسلام. لا ٥٦– ٥٧.

[2] الخطيب: ب١ لا ٧٢.

پیاوەکانی کرد دەربارەی ئەو شوێنە، ئەوانیش وەسفی هەوا خۆشەکەی و خۆراکە نایابەکەیان بۆ کرد. بەڵام خەلیفە سەرنجی ئەوەی دا ئەم شوێنە بواری کارکردن و رزق و رۆزی پەیداکردنی تیا نیە بۆ هاوڵاتیان، شوێنێکی تری بۆ باسکردن لەکاتی هاتنی بۆ ئەملا، بینی بووی، لەگەڵ پیاوەکانیدا گەڕانەوە و شەو و رۆژێك تیا مانەوە، وەرزی هاوینیش بوو، کەش و هەواکەی بەدڵ بوو، و بینی ئەمە ئەو شوێنەیە کە حەزو ئاواتەکانی دەهێنێتەدی([1])، مەنسور پێی خۆش بوو بۆچوونی خەڵکی ئەو دەڤەرە بزانێ، بانگی کردن و پرسیاری شوێنەکەی لێکردن، ئایا لەکاتی گەرما و سەرما و باراندا چۆنە، ئەوانیش هەرکەسێك بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی کە هەیبوو وەڵامیان دایەوە، هەروەها لە یەکێك لە ئاغاکانیشی پرسی، کە خاوەن کێڵگە بوو لەوێ، ئەمیش پێی وت کە شوێنێکی گونجاوە چونکە دەکەوێتە نێوان چوارلا و لە هەرێمەکانی دراوسێی ئازووخەی بۆ دێ، هەروەها لەبۆچوونی قەشەی ئەو دێر و کەنیسانەی کە لە وێدابوون بۆی دەرکەوت شوێنەکە بەگشتی پلەی گەرمی تێدا مامناوەندە ([2]).

شوێنی بەغداد کەش و هەواکەی چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، لەوانەش هەرچەندە وشکە و پلەی گەرمی تیا بەرزە، بەڵام شێی کەمە، ئەمەش وای لێدەکات کەش و هەواکەی لەکەش و هەوای شارەکانی کەناری دەریای ئەو ناوچانە باشتر بێ، چونکە پلەی گەرمی تێدا مامناوەندە بەڵام شێی زۆرە.

شوێنی بەغداد، لەپێش ئیسلامدا، بریتی بوو لەکۆشکێکی ساسانی و پردێك لەپاپۆرە دروستکراو لەسەر رووباری دیجلە([3]) وە کۆمەڵێ گوندی بچوکی گاورنشین لە کەناری رۆژئاوای رووبارەکە بڵاو بووبونەوە و لەدەوروبەریدا دێری گاورە نەستوریەکان هەبووە ([4]). وادیارە گەڕەکێکیشی تیابووە وەرزانە بازاڕی تیا گەرم کراوە و بازرگانەکان تێدا کۆبوونەتەوە ([5]) چونکە گەلێ نەخشەی ئاشوری تیا دۆزراوەتەوە

---

[1] احموي، ياقوت : معجم البلدان : ب ١ ■ ٤٥٨.

[2] الطبري: ب٧ لا ٦١٦– ٦١٧.

[3] الخازن، وليم: الحضارة العباسية.لا ٤١

[4] الطبري: ب ٧ لا ٦١٦ – ٦١٧.

[5] الخطيب البغدادي: ب١ لا ٢٥– ٢٦.

ئەوە دەسەلمێنی ([1])، هەروەها چەند پارچەیەکی خشتی سوور دۆزراوەتەوە ناوی (بختنصر)ی دووەمی لەسەر نەخشەکراوە ([2]).

کتێب دانەرەکان ([3]) دەگێڕنەوە کە مەنسور شارەکەی لە ناوچەیەکی چۆڵ و بێ خەڵکدا دروست نەکردوە، بەڵکو بەغداد لە ناوچەیەکی پڕ لە گوند دروستکراوە، وە باسی ناوی کۆمەڵێ گوندی گاورنشین دەکەن کە بۆ سەردەمی ساسانیەکان دەگەڕێنەوە و بەرە بەرە ئاوێتەی ئەو شوێنانە بوون کە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عەباسیدا بوو، جا بە غداد گرنگترینی ئەم گوندانە بووە. واش دیارە ئەو شارە بازنەییە کە مەنسوور دروستی کردو دواتر بوویە کرۆکی دەوڵەتی نوێی عەباسی، پێی دەوترا بەغداد، ئەم ناوە باو و بلاوەی بەغداد لەو شارە بازنەییە وەر گیراوە ([4]).

ناوی بەغداد، زیاتر، لە وشەیەکی فارسی، داتاشراوە، کە لە دوو وشە پێکهاتووە : باغ و داد، واتە : بەخشینی خودا. مێژوونوسان و جوگرافی ناسانی عەرەبیش چەند بۆچوونێکیان بۆ ئەم ناوە هەیە ([5])، مەنسوریش ناوی شاری (السلام)ی لێنا لەسەر ناوی بەهەشتی هەمیشەیی یاخود لەبەر ئەوەی دۆڵی دیجلە پێی دەوترا دۆڵی (السلام) ([6])، ئەمەش ئەو ناوە فەرمیە بوو کە لەبەڵگەنامەکان و لەسەر دراو و پێوانەکاندا ([7]). دەنوسرا.

لەساڵی (١٤٥ک/٧٦٢ز) مەنسور کەوتە دروستکردنی پایتەختەکەی، بە هەزاران کرێکاری بەکارهێنا سەرەرای چەندین پسپۆر لەبیناساز و دارتاش و ئاسنگەر و

---

[1] العبادي: سەرچاوەی پێشوو : ل ٥٥

[2] Encyc ١ Britanica llp ٢٣

[3] جگە لە - الاصطخري - کە دەگێڕێتەوە کە بەغداد شارێکی نوێیە وئاوەدانی تیانە بووە. بگەرێوە بۆ: مسالك الممالك : ل ٥٨.

[4] دائره المعارف الاسلاميه : ب ٤ ل ٥.

[5] الحموی : ب ١ ل٤٥٦–٤٥٧.

[6] الخطيب البغدادي :ب ١ ل ٥٨–٦٢.

[7] دائرة المعارف الاسلامية : ب ٤ ل٣٦.

العبادي : ٥٦

سعد، فهمي: العامة في بغداد, ل ٢٧

هەڵکەن کە لە شارەکاندا هێنایانی، سەرپەرشتی کردنی بیناکەش لەلایەن ژمارەیەك لە ئەندازیاران بەڕێوە دەچوو ([1])، دروستکردنی ئەم شارە نزیکەی چوار ساڵی خایاند، لەساڵی (١٤٩ك / ٧٦٦ز) تەواو بوو.

ئەو نەخشەیەی کەوا مەنسور لەدروستکردنی بەغداد بەکاری هێنا شتێکی نوێ و داهێنراو بوو، وای لەم شارە بازنەییەی کرد پەرژینی دوولایەنی کە دوو ئەڵقەی بەدوای یەك دەوروبەری بگرێ، ئەمەش ئاراستەیەکی نوێیە لەهونەری بیناکردنی شارە ئیسلامیەکان(❀)، وادیارە کاریگەری شێوەی هەندێ لەشارە دێرینەکانی فارسی لەسەر بووە وەکو شاری هەمەدان.

شاری بەغداد لەسەر شێوەی قەڵایەکی گەورە دروستکراوە، لە سێ کۆڵەکەی بیناسازی پێکهاتووە: قەڵاکان، پەرژینە دەرەکیەکان، پاشان ناوچەی نیشتەجێبوونی ناوەوە. ناوەڕاستی شاریش کۆشکی خەلیفەو مزگەوتێك و کۆشکی کوڕەکانی و دەزگاکانی حکومەتی لەخۆدەگرت(❀).لەناوەڕاستی شارەکە کەس بۆی نەبوو سواری ئەسپ ومایِن یاخود هەر وڵاخێکی تر ببێ جگە لەخەلیفە، هەرکەسێکیش کۆشکی خەلیفەی مەبەست بێ، پێویستە لەسەری لەلای شوێنی چوونە ژوورەوەی شارەکەوە دابەزێ و بەپێ بڕوا، جگە لە (ئەلمەهدی) و (داوودی کوڕی عەلی) مامی مەنسور، کەوا رێگەی پێدرا لەسەر دەستەبەرە هەڵگیرێ بەهۆی نەخۆشیەکەی([2]).

مەنسور کە لەدروستکردنی بەغداد تەواو بوو، کەوتە دابەشکردنی پارچە زەوی بەسەر بنەماڵەکەی و پیاو ماقوڵانی دەوڵەتەکەی لەتەنیشتی دەرگا دەرکیەکانی شارەکەیەوە، پارچە زەوییەکانی دەوروبەری شاری بە سەربازەکانی بەخشی بۆ ئەوەی خانوی لەسەر دروست بکەن ([3])، ئەوەش تا قەرەباڵغی دروست نەبێ ناوشار، ئەمە لەلایەکەوە، وەکو خەڵاتێك لەسەر ئەو خزمەتە مەزنانەی کە پێشکەشیان کرد لەلایەکی دیکەوە. خێرا پارچە زەوییەکان ئاوەدانکرانەوە و پڕ بوو لە دانیشتوان، وای لێهات هەر کەرتێك بە ناوی ئەو کەسە یاخود ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە تێدا نشتەجێ

[1] الخطيب البغدادي : ب ١ لا ٦٦-٦٧.

[2] الخطيب البغدادي : ب ١، لا ٧٧.

[3] لبلاذري : لا ٤١٤ – ٤١٥.

بوونە، دەناسرا.

کاریگەری فارسیش بەنەخشەی شارەکەوە دیارە، چونکە خەلیفە لەهاولاتیان جیاکرابووەوە و شوێنێکی بەرزی بۆ دانرابوو کە زەحمەت بوو پێی بگەی، هەروەها گەورەیی کۆشك و هەیوان سامی پاشا دەردەخات، ئەوجا بیرۆکەی بازنەیی و تەسککردنەوەی خانوی هاولاتیان لە گەڕەکی جیاجیادا، کە شەوانە بتوانرێ بەشێوەیەکی ورد پاسەوانی بکرێ، ئامارژە بەدەسەلاتێکی رەها دەکات کە لەفارسەکانەوە وەرگیراوە و ناگونجێ لەگەڵ لێبوردەیی ئیسلام و دابونەریتی ئەمەویەکاندا([1])

لەساڵی (١٥١ك/٧٦٨ن)، مەنسور شاری (رەسافە) یاخود (بەغدادی رۆژهەلاتی) بۆ مەهدی کوڕی دروست کرد لەلای ڕۆژهەلاتی دیجلەوە بەرامبەر شاری بەغدادی رۆژئاوا و بەناوی (عسکر المهدی – سەربازگەی مەهدی) ناسرا([2]). هۆکارە ستراتیەجیەکان جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە و دەبنە هۆی دروستکردنی ئەم شارە ئەوەبوو (مەهدی) سەربازەکانی خۆی خستە ناوی بۆ ئەوەی لەدەرەوەی شاری مەنسورە بێت و ببێتە فریادڕەس و یارمەتیدەرێك بۆ کپکردنەوەی ئەو ئاژاوانەی کە لەوانەیە لە ناوەوەی رووبدات([3]).

وادیارە خەلیفە هەستی بەوە کردبوو کە بەتەواوەتی بێ ترس و دڵنەوا نابێ لەسەر خۆی بەدانیشتنی لەبەغداد. رەسافە، پەرژینێك و گۆڕەپانێك و بێستانێکی بۆ ئامادەکرا و ئاویشی بۆ راکێشرا، نێوانی هەردوو شارەکەش بەدروستکردنی سێ پرد لەسەر رووباری دیجلە، گەینرا بە یەك، سەرکردەکان پارچە زەویان پێ درا ([4]). خێرا رەسافە ئاوەدان کرایەوە و زۆری نەما ئەوەندەی بەغدادی لێبێ، لەساڵی (١٥٩ك/٧٧٦ن) لە سەردەمی مەهدیدا دروستکردنی رەسافە تەواو بوو.

---

[1] الدوری، عبدالعزیز : العصرالعباسی الاول : لا ٧٧.

[2] البلاذري : لا ٤١٤.

[3] سعد:سەرچاوەیەکی پێشوو :لا ٣١.

[4] الخطیب البغدادي :ب ١ لا ٨٢.

## جێنشینێتی – مەرگی مەنسور

یەکێك لەو ڕووداوە کاریگەرانەی کە لەسەردەمی مەنسوردا ڕوویدا بریتی بوو لە لابردنی (عیسای کوڕی موسا)ی برازای لە جێنشینێتی و وەرگرتنی بەیعەت بۆ مەهدی کوڕی، هەرچەندە ئەوەی یەکەم زیاتر لەیەکجار دەسەڵاتەکەی لەفەوتاندا بۆ ڕزگار کرد.

وادیارە خەلیفە هەر لەسەرەتای دەسەڵات گرتنیەوە بیری لە لابردنی برازاکەی کردبووە. (الطبري) دەگێڕێتەوە کە خەلیفە، (عیسای کوڕی موسا)ی بۆ جەنگاندنی عەلەویەکان نارد بەنیازی ئەوەی یان مافی لەجێنشێتی بفەوتێ، تا خیلافەت لەدوای خوی بدرێ بەمەهدی کوڕی، یان موحەممەدی (النفس الزکیه) و ئیبراهیمی برای لەناو بەرێ. وتی ((...... گوێم لێ نیە کامەیان ئەوەیتریان بکوژێ)).([1]).

بەڵام گەورە پیاوانی دەوڵەت لەسەردەمی خوێنڕێژدا سوێندیان لەسەر ئەوە خواردبوو کە بەیعەت بدەن بە (عیسای کوڕی موسا)، ئاسان نەبوو بەلایانەوە ئەو سوێندە بشکێنن، هیچ ڕێگە چارەیەکیش نەبوو بۆئەوەی سوێندەکەیان نەکەوێ جگە لەوەی داوا لە (عیسای کوڕی موسا) بکەن بە ڕەزامەندی خۆی واز لەجێنیشینێتی بێنی، وادیارە ناوبراو ئارەزوی ئەم کارەی نەدەکرد ئەمەش وای لە مەنسور کرد شێوازی ئارەزوو پێکردن و هەڕەشە لێکردن لەبەرامبەریدا بەکاربێنێ کاتێك ناچاری کرد واز لەمافی خۆی بێنێ و بەیعەت بدا مەهدی لەساڵی (١٤٧ ك/٧٤٦ ز)([2]). ئاوەها جێنیشینێتی بووە مافی مەهدی، ئەوجا هی عیسای کوڕی موسا لەدوایدا.

خێرا مەنسور هانی خەڵکی دا بۆ ئەوەی بەیعەت بە مەهدی بدەن، جا ئامۆژگاریەکی کوڕەکەی کرد نیشانەی سیاسەتێکی ژیرانەیە کەوا دەبێ بەرامبەر هاوڵاتیان پەیڕەو بکرێ، هانیدا لەسەر ئەوەی بە سۆزو بە بەزەیی بێ لەگەڵیاندا و شەو نەخەوێ لە پێناوی حەوانەوەیان، دادپەروەری لە نێوانیاندا بڵاو بکاتەوە، بەکردەوەی چاك لەخوا نزیك بێتەوە، ڕێز لەئەهلی زانست و دین بگرێ، سەر زەوی

---

[1] الطبري: ب ٧ لا ٥٧٧.

[2] ابن الطقطقا: لا ١٧٢ -١٧٣.

ئاوەدان بکاتەوە تا سەروەت وسامانی دیوانی دارایی کەم بێتەوە، وە ئیسلام و جیهاد بڵاو بکاتەوە لەپێناوی بەرزکردنەوەی حەق. ([1])

شەوی شەممە: لە (زی الحجە – ساڵی١٥٨ ك / مانگی تشرینی یەکەم ساڵی٧٧٥ ز) مەنسور کۆچی دوایی کرد، ئەو بەدەستی (بەد هەرسی) یەوە دەیناڵاند، جا بۆ بەجێهێنانی ئەرکی حەج دەرچوو، لەرێگە بەدەستی ئێش وئازارەوە گیرۆدەبوو بوو، هێشتا نەگەیشتبووە (بیری مەیمون)، کە شەش ڕۆژ لە(مەککە)وە دوورە، لەبەرەبەیاندا لە ناو دەوارەکەیدا کۆچی دوایی کرد ([2]).

---

[1] بگەرێوە بۆ دەقی ئامۆژگاریەکە لە لای – طبري– : ب٨ ل ١٠٢ – ١٠٧.
[2] هەمان سەرچاوە :ل ٦٠

## موحەممەدی مەهدی – موسای هادی

## ئەبو عەبدوڵڵای موحەممەدی مەهدی ١٥٨–١٦٩ك /٧٧٥–٧٨٥ز

### ناساندنی مەهدی

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، ئەبو عەبدوڵڵای مەهدی. لە (حەمیمە) لەخاکی (الشراه) لەساڵی (١٢٦ك/٧٤٤ن) لە دایک بووە، دایکیشی ناوی (ئەڕوای کچی مەنسوری حیمیەرەی)یە.[1]

لەماڵی خیلافەتدا پێگەییوە، مەنسور خۆی خەریکی ڕۆشنبیرکردنی بوو، ئەوجا رادەستی (المفضل الضبی)ی کرد، حەزی لە زانست و ئەدەب بوو. کاتێک گەیشتە تەمەنی پانزە ساڵی، مەنسور کەوتە ئامادەکردنی بۆ پۆستی خیلافەت ئەوەش بەمەشق پێکردنی لەسەر جەنگ و چۆنێتی بەڕێوەبردنی، بۆ چەند ئەرکێکی سەربازی ناردی، هەروەها لەچەند پۆستێکی ئیداریدا دایمەزراند، وە لە ساڵی (١٤٧ك/٧٦٤ن) کردی بەجێنشینی خۆی.

مەهدی (ریگە)ی کچی خوێنرێژی کرد بەهاوسەری خۆی. ئەو کەسێکی دەستبڵاو و نەرم و نیان و هۆشیار بوو، ((لە شوێنی مەترسیداردا هەرگیز بێ ئاگا نابێ، پشت بەکەسانی متمانە پێ نەکراو نابەستێ، لەگەڵ خزمەکانیدا باش بوو. بەرامبەر بەخێزانی نەرم و نیان بوو، توندوتیژ لەگەڵ گومڕاو زەندیقەکاندا، بۆ گوێگرتن لەسکاڵاو ناڕەزایی هاوڵاتیانیش دادەنیشت([2]).

لە پاش مردنی مەنسور بەیعەتی پێ درا بۆ خیلافەت، جا ئەو کاتە لەتەمەنی سی وسێ ساڵاندا بوو ([3]).

---

[1] ابن كثير : ب ١٠ لا ١٥١.

[2] المسعودي : التنبيه و الاشراف :لا ٢٩٧. ابن الطقطقا : ■ ١٧٩

[3] الطبري: ب ٨ لا ١١٠– ١١٤.

## ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی (مەهدی)دا

## چاکسازیەکانی مەهدی

خیلافەتی مەهدی، کەوا نزیکەی دە ساڵ بەردەوام بوو، بە سەردەمی گواستنەوە دادەنرێ، لەتوندوتیژی و سەرکوت کردنەوە کە لەسەردەمی خەلیفەکانی بنەماڵی عەباس لەپێش خۆی باو بوو، بۆ سەردەمی میانڕەوی و نەرمونیانی کە لە ڕۆژانی خۆی و ئەوانەی دوای خۆی باو بوو. خەڵکی وەکو مەنسور لە ئامۆژگاریکردنی کوڕەکەی باسیان دەکات، سێ جۆرن : ((هەژارێك چاوەڕێی دەوڵەمەنی تۆیە، ترساوێك چاوەڕوانی دڵنەوایی تۆیە، زیندانیەك تەنها چاوەڕوانی ئازاد بوونە لەتۆ، جا کە دەسەڵات دەگریتە دەست تامی خۆشگوزرانیان پێ ببەخشەو زیادەڕەوی نەکەی) ([1]). بۆیە پێویست بوو سیاسەتێکی نەرمونیان پەیڕەو بکات تا برینی دڵ و دەروونەکان سارێژ بکات و گەل کۆبکاتەوە. سەردەمی ئەم ناسراو بوو بە هێمنی ڕەوشی ناوخۆ، ئەمەش ڕێگەی والآکرد بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە گەلێکی چاکسازی.

مەهدی خیلافەتەکەی بەرازی کردنی خەڵك دەستپێکرد، ئەو سەروەت و سامانەی کە لەسەردەمی باوکی زەوتکرابوو گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکانی، پاشان فەرمانیدا زیندانە سیاسیەکان بەر بدرێن، بەتایبەتی عەلەویەکان، بژێوی و تایبەتمەندییەکانیانی بۆ گەڕاندنەوە، هەروەها کردنی (یەعقوبی کوڕی داوود) بەوەزیری خۆی یارمەتیدەرێك بوو بۆ زیاتر تێگەیشتن لەگەڵیاندا ([2]).

لەساڵی (١٦٠ك/٧٧٧ز) کاتێك حەجی کرد هەوڵی دا خەڵکی حیجاز ڕازی بکات، چونکە مەنسور بە توندی مامەڵەی لەگەڵ کردوون بەهۆی پاڵپشتی کردنیان لە بزوتنەوەی موحەممەدی (النفس الزكيه)، بۆیە هەستا بەدابەشکردنی پارەو پوولێکی زۆر بەسەریاندا، ڕێیدا بە گەڕانەوەی ئەو خەلەوخەرمان و دانەوێڵانەی کە لەشام و میسرەوە بۆیان دەهات، پاش ئەوەی کە مەنسور ڕێگەی لێگرت بەهۆی بزوتنەوەکەی موحەمەدی (النفس الزكيه)، ژمارەیەك لەسەربازەکانی حیجازی خستەپاڵ پاسەوانە تایبەتەکانی خۆی، هەروەها مزگەوتی حەرام – کەعبەی پیرۆز – و مزگەوتی پێغەمبەریشی لە مەدینە بەرفراوان کرد ([3])

---

[1] اليعقوبي : ب ٢ ل ٢٣٧.

[2] الطبري : ب ٨ ل ١١٨ – ١١٩، ١٥٦.

[3] ابن الاثير : ب ٥ ل ٦٠.

کاری کرد بۆ بەدەستهێنانی دڵسۆزی و خۆشەویستی خەڵکی شام، بۆیە سەردانی قودسی کرد و هەوڵیدا ناکۆکی هۆزایەتی لەبیابانی شامدا چارەسەر بکات، پارەوپوولی بەسەر دابەشکردن، ڕێزی لە شاندی کوڕەکانی (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیک)ی گرت. لە خوێنڕێژ زیاتر بینای دروست کرد، ئەو خانووانەی کە مەنسور بینای کرد بەبێ دەستکاری بە جێی هێشت، هەروەها لەو حەوزانەی دروستکرد کە لەناوی بیرەکان پڕ دەکرێن بۆ ئاودێری کاروانەکان و پاسەوانیشی لەسەر دانا، گەڕوگول و زیندانکراوەکانی بەسەرکردەوە تا پێداویستیان نەهێڵی و ڕێ نەدا نەخۆشی لەناویاندا بڵاوبێتەوە، خوێندنگەو نەخۆشخانەی دروست کرد ([1])، (پۆستە)شی لەنێوان مەککەو مەدینەو یەمەندا دروست کرد، گرنگی بەکاروباری بازرگانیدا، بۆیە تۆڕێك لەرێگاوبانی بازرگانی دروست کرد کە بەغدادی کرد بە ناوەندێکی بازرگانی جیهانی، وای لێهات ئەم سەردەمە بە مۆسیقا و شیعر و ژیریێژی و ئەدەب ناسرا. ڕێبازێکی دانا تا ئەمڕۆ پەیرەوی دەکرێ ئەوەش لەبەرگرتنەوە کەعبە بە بەرگێکی نوێ هەموو ساڵێك، شارەکانی قایم و پتەو کرد و بەتایبەتی شاری ڕەسافە، ئەمینداری لە ویلایەتەکان دانا بۆ ئەوەی هەواڵی کاربەدەستەکانی بۆ بێنن. بۆ سکاڵاو نارەزایی و داد و بێدادی هاوڵاتیان دادەنیشت و گوێبیستیان دەبوو، ئەو یەکەم خەلیفەی عەباسیە بۆ سکاڵای خەڵکی دانیشی، سوور بوو لەسەر ئەوەی دادپەروەری لەنێوانیاندا دامەزرێنێ، پرسی بە دادوەرەکانی خۆی دەکرد لەکاتی ڕووانین بۆ سکاڵانامەکاندا([2]) وە ئەوەندە بایەخی بەدامەزراندنی دادپەروەریدا خانەیەکی بۆ ئەم مەبەستە تایبەت کرد کە پەنجەرەیەکی ئاسنینی هەبوو، چیرۆك — سکاڵانامەکان — ی تێدا دەخرایەڕوو و کۆ دەکرایەوە بۆ ئەوەی پێش و دوا نەخرێ ([3]).

جێی باسە کە مەهدی لە میانەی چاکسازیەکانیدا وادەرکەوت دەیەوێ کۆتایی بەو زۆر و ستەمە و توند وتیژیە بهێنێ کە لە هەردوو سەردەمی خوێنڕێژ و مەنسوردا دژی ئەمەویەکان و عەلەویەکان دەکرا، هەرچەندە دڵی شنەی دەکرد بۆ ژیانی کەیف و خۆشی، بەڵام شایتی بەرز و پیرۆز ڕائەگرت و حەزی لە پەیرەو کردنی سوننەتی پێغەمبەر بوو و سەرپێچی نەدەکرد.

---

[1] ابن الاثير : ب ٥ لا ٦٠.

[2] ابن الطقطقا: لا ١٧٩.

[3] الخضري: الدولة العباسية : لا ٨٨.

## ئەو بزوتنەوانەی کە دژ بە عەباسیەکان بوون لەسەردەمی مەهدیدا

### بزوتنەوەی زەندیقەکان:

دیاردەی زەندیقی هەر لەسەردەمی ئەمەویەوە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە، لەراستیدا وشەی زەندیق بە شوێنکەوتووانی ئاینی ئاگرپەرستی دەوترا، وەکو (زەردەشتی و مانەوی)، ئەوجا بەرە بەرە بێباوەڕکان و ئەوانەی بەگومان بوون لەدین لەشوێنکەوتووانی (کوڕی –دیصان) و (مرقیون) و (مانی)یشی گرتەوە ([1])، پاشان ئەم واژەیە بەرفراوانتر بووەوە تا (الشعوبیه – نەتەوەپەرستی) یش بکرێتەوە، پاشان زاراوەکە واتا گەلێکی ئاینی – سیاسی گشتی بۆ پەیدا بوو، ئەمەش کاتێك دەسەڵاتی عەباسی بۆ لێدانی ناحەزە سیاسی و ئاینیەکانی بەکاری هێنا، سەرئەنجام بە هەندێ بێ ئابڕوو و مێباز دەوترا.(٥)

وئەوەی راستی بێ زەندیقگەری بزوتنەوەیەکی سیاسییە، بەڵام بەرگێکی هزری ئاینی رێکخراوی تێگراوە، شوێنکەوتووانی، بانگەشە بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی (مانەوی) دەکەن، بە هەموو ئەو شتانەی کە بەخۆیەوە دەیگرێ لەبیروباوەڕی ئاینی و کەلتوری و هزری، وەکو بریتێك بۆ کەلتوری ئیسلامی – عەرەبی. رەنگە سیاسەت لەپشت پەردەی بانگەوازی فەیلەسوفەکانیشدا شار درابێتەوە، وەکو چۆن لەپشتی زەوتکردنی دەوڵەت بۆ سەروەت و ساماندا بوو، چونکە (زەندیقگەری)، کەوا لەپشت پەردەی فەلسەفەوە شاردرا بووەوە، لایەنێك لەلایەنەکانی، شۆرشێکی ئاگرپەرستی یە، ئامانجەکەی روخاندنی دەوڵەتی ئیسلامیە لەبناغەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی فارسی لەباتی([2]). وادیارە زەندیقگەری، کە جێی باس کردنمانە، بزوتنەوەیەکی (مانەوی)یە لەپاش فەتحی ئیسلامی لە عێراق و هەرێمە فارسیەکاندا بوژایەوە، هۆی

---

[1] لەبارەی ئەم بزوتنەوانە بگەڕێوە بۆ : النشار، علي سامي : نشأة الفكر الفلسفي في الاسلام :ب ١ لا ١٧٦-١٩٧.
عمر: التاريخ الاسلامي وفكر القرن العشرين: لا ١١٣ – ١١٤.

[2] العقاد، عباس محمود : التفكير فريضة اسلامية. لا ٦٧.

بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە سەردەمی عەباسیدا، ئەو ئازادییە ئاینییە بە کە خاوەن ئاینەکانی دیکە لەپاش فەتحی ئیسلامی هەیانبوو. سەرئەنجام جۆرێك لەململانێی هزری لەناو کۆمەڵگەدا پەیدا بوو، ئەوەش بەدەرکەوتنی کۆمەڵی بیرمەندی فارس کە بڕوایان بە شارستانیەتی ساسانی و بنەماکانی دەدا و بانگەوازیان بۆ جێبەجێ کردنی سیستەم و بەهاکانی دەکرد لە کۆمەڵگە و بەڕێوەبردن و وڵاتدا، وەکو بریتێك لە شارستانیەتی ئیسلامی و سیستەمە ئیسلامیەکان ([1])، بەتایبەتی ئەمانە هەستیان بەوە دەکرد کە گواستنەوەی خیلافەت لە ئەمەویەکانەوە بۆ عەباسیەکان ئامانجەکانیانی نەهێنایەدی لەدامەزراندنی حکومەتێکی فارسی بەرووکەش و ناوەڕۆکەوە، لە دەسەڵات و زمان و بیروباوەڕە ئاینیەکەشی، جا بۆیان دەرکەوت، تا ئیسلام دەسەڵاتدار بێ ئەو ئامانجە نایەتەدی، بۆیە کەوتنە کارکردن لەسەر بڵاوکردنەوەی ئاینی مانەوی لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و زیندووکردنەوەی کەلتووری دێرینی مانەوی - فارسی لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی پەرتووکە کۆنەکان و کردنی بەعەرەبی لە زمانی فارسیەوە، بە ئومێدی ئەوەی ڕۆشنبیریەت و هزری مانەوی جێی ڕۆشنبریەت و هزری ئیسلامی بگرێتەوە ([2]).

خەلیفە عەباسیەکان هەستیان بەو مەترسیە کرد بوو کە دەوری دین و دەوڵەتەکەیان دەدات بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیرۆکەو بنەماکانی زەندیقی، بۆیە هەڵمەتێکیان برد بۆ لەناوبردنی ئەم بانگەشە لادەرە، مەنسوریش تەمێی مەهدی کوڕی کرد بە جەنگاندنیان.

ئەوە بوو خەلیفە مەهدی، پرسی زەندیقەکانی گرتە ئەستۆ و بەشاڵاوێکی ڕێکخراو لەهەموو شارەکاندا ڕاوی نان و هێنایانی وهەموویانی کوشت، (❁). دیوانێکی تایبەتی بۆ دروست کردن بە ناوی ((دیوانی زەندیقەکان)) و کارمەندێکی تایبەتیشی

---

[1] عمر:١١٩ل.

[2] عمر: ل١١٨-١١٩.

❁ ابن کثیرب ١٠ ل ١٤٩

لەسەر دانا ((بەرپرسی زەندیقەکان)) ([1]) هەروەها فەرمانی بە نووسەرەکان دا کتێب دانێن بۆ وەڵامدانەوەیان لە پلانێکی هزریدا بۆ ئاشکراکردنی بیرۆکەکانیان([2]).

زەبرو زەنگی مەهدی و سووربوونی و کۆڵنەدانی لە راونانیان لەراسپاردەکەی بۆ هادی کوڕی دەرئەکەوێ ([3]).ئەوەی گومانی تێدا نیە مەهدی لە راونانی زەندیقەکاندا، بەدوو هۆکار پاڵنراوبوو:

یەکەم : ئاینی، کەوا بنەماکانیان لەسەر (هەڵگێڕانەوە) هەستاوە، ئەمەش ئەرکە شەرعیەکانی ئیسلام هەڵدەوشێنێتەوە، راڤەکردنیان بۆ دەقەکانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر پێچەوانەی مانای ئاسایی خۆیەتی و نەگونجاوە لەگەڵ بنچینەکانی بیروباوەردا، ئەمەش مەترسیەکی راستەقینەیە لەسەر بیروباوەری ئیسلامی.

دووەم: سیاسی، بەهۆی گەشەکردنی پەیوەندی نێوان عەباسیەکان و نێوان پێکهاتە توندڕەوەکانی فارس بەرەو گرژی دەچوو.

---

[1] الجهشیاري : ل ١٦٥.

[2] عمر : ل ١١٩– ١٢٢.

[3] بگەڕێوە بۆ دەقی راسپاردەکە لەلای – الطبري : ب ٨ ل ٢٢٠.

## بزوتنەوەی (المقنع – رووپۆشراو) ([1]) : ١٥٩–١٦١ك/٧٧٦–٧٧٨ز

شەپۆلی گومڕایی درێژەی ئەکێشا و لەسەردەمی مەهدیدا گورج و گۆلتر بووەوە. ئەوە بوو لەپاش ئەو بزوتنەوانەی کە دژی مەنسور راپەڕین، چەندین بزوتنەوەی دیکە لەسەردەمی مەهدیدا دەرکەوتن کە ئامانجەکانیان جیاواز نەبوو لەوانەی پێشوو، وەکو بزوتنەوە (المقنع)ی خۆراسانی کەوا لەلای (مرو)ەوە دەرکەوت، بانگەشەی خودایەتی بۆ خۆی دەکرد و بزوتنەوەکەی لەسەر بنەمای (الحلولیە و التناسخ)([2]) هەستابوو. بزوتنەوەی (المقنع) ئامانجی سیاسی و ئاینی هەبوو. لەرووی سیاسیەوە، ئەم بزوتنەوەیە پەیوەند بوو بەخودی رابەری فارسیەوە ئەبو موسلیمی خۆراسانی، بەردەوامبوونێکە بۆ هەردوو بزوتنەوەی (سنباذ) و رەواندی ([3])، هەروەها هەستی رەگەزپەرستی زاڵ بوو بە سەریدا و ئامانجی دامەزراندی قەوارەیەکی فارسی بوو لەسەر حیسابی دەوڵەتی عەباسی.

لەبەر ئەوەش، شوێنکەوتووانی ئەبو موسلیم پشتگیریان لە(المقنع) کرد و (المبیضة – سپیگەرەکان) لەبوخارا و (صغد) هاتنە ژێر ئاڵاکەی، هەروەها هەموو رق هەلگرێك لە رژێمی عەباسیش بەشداربوو لەبزوتنەوەکەی ([4]).

لە رووی ئاینیەوە، رێنماییەکانی (المقنع) کاریگەری بنەماکانی خورەمی لەسەر بوو. ئەوە بوو رێنماییەکانی (مزدك)ی زیندووکردەوە و ئەرکە شەرعیەکانی ئیسلامی پووچەڵ کردەوە، جا بیرۆکەی (التناسخ)یش کە بانگەشەی بۆ دەکرد، هاوکات بوو لەگەڵ بانگەشەکردن بۆ روخاندنی بنەماکانی ئاینی ئیسلامدا.

خەڵکێکی زۆر شوێنی (المقنع) کەوتن، بەتایبەت لە بوخارا و (صغد)،

---

[1] رابەری بزوتنەوەکە دەمامکێکی پۆشیبوو بۆ ئەوەی شێوەی ناشرینی روخساری بشارێتەوە، بە خەڵکی دەوت : ئەو رووخساری خۆی پۆشیوە بۆ ئەوەی خودی خوا کە لە ئەودا بەرجەستە بووە لەچاوە پیسەکانیان بشارێتەوە. ابن الاثیر : ب ٥ لا ٩٢.

[2] المقنع: بۆچوونی وابوو کە خوای گەورە ئادەمی دروست کردوە و بەرجەستەی بووە، گیانی ئادەم هاتۆتە ناو جەستەی پێغەمبەران تا گەیشتووەتە ئەبو موسلیم، پاشان لە جەستەی (المقنع) جێگیر بووە.

[3] العمرو : ٢٤٢لا.

[4] ابن الاثیر:ب ٥ لا٥٢ – ٥٣. الدروي : لا ٩٣.

شوێنکەوتووانی لە دەڤەری (کش) و (زنسف)دا بڵاوبوو بوونەوە و کەوتنە هێرشکردنە سەر ناوچە ئارام و سەقامگیرەکان، ژمارەیەك لە سەرکردە عەباسیەکان بەرەنگاریان بوونەوە، لەوانەش (سەعیدلحەرشی)، کەوا توانی بیانشکێنێ و لەناویشیان بەرێ، سەبارەت بە (المقنع) ئەوە پێش گرتنی خۆی سوتاند ([1]).

## چەند بزوتنەوەیەکی جیاواز

سەردەمی مەهدی چەندین بزوتنەوەی دیکەی دژ بەدەسەڵاتی عەباسی بەخۆوە بینی، بەڵام کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو و خەلیفە توانی بەبێ ماندووبوون سەرکوتیان بکات بەبێ، لەوانەش : بزوتنەوەی (یوسف البرم) لەخۆراسان ([2])، بزوتنەوەی (عەبدوڵڵای کوڕی مەروانی کوڕی موحەممەدی ئەمەوی) لەوڵاتی شام ([3])، بزوتنەوەی (خەواریجەکان) بەسەرکردایەتی (عەبدولسەلامی کوڕی هیشامی یەشکری) ([4]).

---

[1] الطبري : ب ٨ ل ١٣٥. ابن الاثير : هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل٥٨٧.

[2] الطبري :ب ٨ ل ١٢٤.

[3] هەمان سەرچاوە : ل ١٣٥- ١٣٦.

[4] هەمان سەرچاوە : ل ١٤٢.

## پەیوەندییە دەرەکیەکان لە سەردەمی مەهدیدا

### پەیوەندی لەگەڵ ئەمەویەکاندا لە ئەندەلوس

پەیوەندی خراپی نێوان خیلافەتی ڕۆژهەڵات لەبەغداد و خیلافەتی ڕۆژئاوا لە ئەندەلوسدا هەر بەردەوام بوو، لە راستیدا مەهدی ڕێبازی مەنسوری باوکی گرتەبەر لەکارکردن بۆ گەڕانەوەی ئەندەلوس بۆ ئامێزی دەولەتی عەباسی، بەڵام دووری نێوان دوو دەوڵەتەکە ڕێگربوو لەناردنی لەشکری عەباسی بۆ هێنانە دیی ئەم ئامانجە، بەڵام مەهدی هانی هەموو بزوتنەوەیەکی دەدا ئەگەر ئامانجی لاوازکردنی دەسەڵاتی ئەمەوی بووایە لەم وڵاتەدا.

ئەندەلوسیش لەو کاتەدا چەندین بزوتنەوەی دژ بەدەسەڵاتی ئەمەوی تێدا هاتە جموجوڵ، کە جاروبار (بەربەرەکان) دەیانکرد، – بەهۆی دووڵیان لەپاڵپشتی کردنی عەرەبەکان–، وە جاروبار یەمەنیەکان، –بە هۆی پشت بەستنی میری ئەمەوی بەقەیسیەکان–.

لەساڵی (١٥٧ک/٧٧٤ن) والی بەرشەلۆنە و جیرەندە (سولەیمانی کوڕی – یقظان – ی کەلبی) کە ناسراوە بە (الاعرابی) واتە: عەرەبێکی دەشتەکی و لایەنگری یەمەنیەکانە، لەگەڵ حوسەینی کوڕی یەحیای ئەنساری والی (سرقسطة) پلانی دانا بۆ جەنگاندنی عەبدولڕەحمان و لابردنی لەسەر حوکم. (عەبدولڕەحمانی کوڕی حەبیب لفەهری)یش –والی لەوڵاتی مەغریب– کە زیاتر بە نازناوی (الصقلبی) ناسراو بوو، چووە ریزیان، جا هەموو ئەمانە لەلایەن (مەهدی)یەوە هاندراوبوون و پشتگیریان لێ دەکرا.

وادیارە سولەیمان هەستی کرد کە ناتوانێ ڕویەڕوی میری ئەمەوی بێتەوە، بۆیە داوای یارمەتی دەرەکی کرد، پیلانەکەی ڕەهەندێکی سیاسی ترسناکی وەرگرت کاتێك پەیوەندی بە (شارۆلمان کارۆلنجی) کرد لە (بادربودن) لەساڵی (١٦٠ک/٧٧٧ن)، و لەگەڵیا ڕێککەوت لەسەر هێرشکردنە سەر ولایەتەکانی باکوری ئەندەلوس و پەیمانی پێدا ئەو شارانەی رادەست بکات کە حوکمی دەکات، بەبێ ڕەچاوکردنی ئاکامی

دەست خستنەناو دەستی بێباوەڕاندا دژی ئیسلام و موسڵمانان، جا (حوسەینی کوڕی یەحیای ئەنساری)ش لەم هەنگاوەدا لەگەڵی بوو. ئەم پەیوەندیکردنە لە کاتێکدا دەکرا کە میری ئەمەوی سەرقاڵی سەرکوت کردنەوەی شۆڕشێکی تر بوو هی بەربەرەکان بەسەر کردایەتی (الفاطمي) ([1]).

لە راستیدا شارڵمان کاتێك پێشوازی لەم پڕۆژەیەی کرد کەوا خرایەڕوو بۆی، دووپاڵنەری هەبوو :

یەکەم :ئۆرپی – دیانی (مەسیحی). چونکە ئەم شاڵاوە ئەگەر هاتوو کرا، ئەوا بە یەکەم شاڵاو دادەنرێ کە کارۆلنجیەکان دژی موسڵمانەکان بیبەن، لەپاش زنجیرە شاڵاوێك کە موسڵمانەکان بۆ ناو قوڵایی خاکی ئۆرپیەکان بردیان، سەرەڕای ئەوەی کە ناوبانگیەکی ئەدەبی گەورەی پێ ئەبەخشێ لەجیهانی مەسیحیەتدا، ئەمەش دەیکاتە رکابەرێکی بەهێز لەبەرامبەر ئیمپراتۆری دەوڵەتی بێزەنتی، پاڵپشتی لەهەوڵە سیاسیەکانی دەکات بۆ زیندوو کردنەوەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژئاوا، لەپاشان زاڵبوون بەسەر ئۆرپادا.

دووهەم : رقبوونی لەئیسلام و موسڵماناندا. چونکە ئەو هیواو ئاواتێکی هەبوو لەئیسپانیا بیانکاتە دەر، بەتایبەت ئەوان دەسەڵاتیان لەباشووری فەرەنسا، لاواز بووەوە، یان بەلایەنی کەمەوە، پاراستنی سنورەکانی باشووری شانشینەکەی لە هەرەشەی ئیسلامی، ئەوەش بە پەیرەوکردنی سیاسەتی (هێرش بردن لە پێناوی بەرگری کردن).

ئەو پلانەی کە رێککەوتبوون لەسەری ئەوە بوو پاشای کارۆلنجی شاخەکانی (برینییە) بپەڕێتەوە و بەرەو شاری (سرقسطة) بچێ و (الاعرابی)ش بیداتە دەستی، هاوکات عەبدولڕەحمان لفەهری لە (مەغریب) ەوە دەربچێ و هێرش بۆ کەناری رۆژهەڵاتی ئەندەلوس بەرێت و لەشکرەکەی لە (مرسیە) دابەزێ. بەمەش چواردەوری (عەبدولڕەحمان داخل) دەگرن و لە ناوی دەبەن، پاشان ملکە چبوونی وڵات بۆ

---

[1] دەربارەی بزوتنەوەکەی – الفاطمي – بگەڕێوە بۆ : عنان، محمد عبدالله. دولة الاسلام في الاندلس القسم الاول ۱ ۱٦٤-۱٦٧.

دەسەڵاتی عەباسی ڕانەگەینن ([1]).

هەڵگیرساندنی شۆڕش لەباکووری ئیسپانیا دژی دەسەڵاتی ئەمەوی ئاماژە کردنێك بوو بەدەستکردن بە جێبەجێکردنی پلانەکە.
ئەلفەهری لە (مەغریب)ەوە دەرچوو و لەشکرەکەی لە کەناری (مرسیە) دابەزاند، بەڵام عەبدولڕەحمان لە ناکاو هێرشی کردە سەری و لەناوی برد ([2]). جا کاتێك لە شکری کارۆلنجی لەبەردەم شاری (سرقسطة) کۆمەڵەی بەست، بەپێی ئەو پلانەی کە دانرا بوو، پیلانگێڕان هاتنە هۆشی خۆیان، بۆیان دەرکەوت کە هەڵەیەکی گەورەیان کردووە، ئەوە بوو (ئەلئەنساری) رازی نەبوو لەوە زیاتر بەردەوام بێ لە جێبەجێی کردنی پیلانەکە، بۆیە دەرگاکانی شارەکە بەڕووی هێزەکانی کارۆلنجی داخست ([3]).
سەرەڕای ئەم گۆڕانکاریە لە هەڵوێستە سیاسیەکاندا، هەواڵ گەیشتە شارلمان کە (سکسۆن)یەکان شۆڕشێکی دیکەیان لە ئەڵمانیا هەڵگیرساندوە بەهۆی ئەو بۆشاییە سەربازییەی کە ئەم دروستی کردوە، بۆیە ناچار بوو واز لە پرۆسەکەی بێنێ لەئەندەلوس. لەساڵی (١٦٢ك/٧٧٩ز) ([4]) گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی. ئاوەها بارودۆخ سەر لەنوێ یارمەتی میر عەبدولڕەحمان لەداخلی دا، ئەم شاڵاوە گەورەیە کە وڵاتەکەی دوچاری بوو، شکستی هێنا، هەروەها عەباسیەکانیش شکستیان هێنا لە هێنانەوەی ئەندەلوس یاخود لاوازکردنی دەسەڵاتی ئەمەوی لەناویدا.

---

[1] العبادي : ل ٣١٢.
[2] اخبار مجموعة : ل ١١٠ -١١١.
[3] بيضون : ل ٢١٠- ٢١١.
[4] عنان : ل ١٧٥-١٧٦. دايلز كارل :شارلمان ل ١٠١

## پەیوەندی لەگەڵ بێزەنتیەکاندا

(لیوا)ی چوارەم هەر لەو ساڵە بوو بە ئیمپراتۆری بێزەنتی کە مەهدی تیدا خیلافەتی گرتە دەست، لەسەرەتای دەستپێکردنی حوکمڕانیان هەموو شتەکان ئاماژەیان بە پەیوەندیەکی باش و سەرکەوتوو دەکرد. ئەوە بوو ئیمپراتۆری بێزەنتی هەموو بەندکراوە موسڵمانەکانی ئازاد کرد، خەلیفە (مەهدی)ش هەمان کاری کرد ([1]) بەڵام هەوڵەکان بۆ چەسپاندنی ئاشتی دوچاری سروشتی پەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە دژ بەیەکە بووەوە کە بەردەوام بەگژیەکدا دەچوون. ئەوجا سەقامگیر بوونی ڕەوشی ناوخۆ و سنورەکانی دەرەوەی دەوڵەتی بێزەنتی، دەرفەتی بۆ ئیمپراتۆر رەخساند ژمارەی هێزەکانی زیاد بکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی موسڵمانەکان، هەروەها سەرکردە تێگەیشتوو و ئەزموونددار و بە تواناکانی پاراست، ئەوانەی کەوا لەژێر فەرمانی باوکی کاریان دەکرد.

ئیمپراتۆر ئەم بارودۆخەی بەهەلزانی و لەساڵی (١٥٩ك/٧٧٦ز) هێرشی کردەسەر (سمیساط) و هەندێ موسڵمانی بەدیل گرت، بەڵام (مەهدی) یەکێك لە لایەنگرانی خۆی نارد و شارەکەی رزگار کرد ([2]). ئەوەی راستی بێ ئەم شاڵاوەی کە (لیو)ی چوارەم کردی مانایەکی روون و ئاشکرای هەیە، ئەوەش بریتیە لەبەردەوامبوون لەسەر پەیرەوکردنی سیاسەتی شەڕەنگێزی بەرامبەر موسڵمانەکاندا.

هێرش کردنەسەر (سمیساط) مایەی تووڕە بوونی مەهدی بوو، بۆیە بڕیاریدا خێرا بەرپەرچی بداتەوە و سوپایەکی گەورەی نارد بە سەرکردایەتی عەباسی کوڕی موحەممەدی مامی، چووە ناو خاکی بێزەنتیەوە تا گەیشتە ئەنقەرە و قەڵای (کاسن)ی لە (کەبادۆکیا) گرت ([3]).

گرنگی ئەم شاڵاوە لەوە دەردەکەوێت کە ئامادەبوونێکی ئیسلامی بەهێزی سەلماند

---

[1] michelLe syrienne : chronique.lii p ١

[2] الیعقوبي : ب ٢ لا ٢٤٧.

[3] ئەم قەڵایە بە بنکەی ئازووخەپێدان دادەنرێ، گەنجینەی دانەوێڵەی تێدایە، بۆ ئەوەی موسڵمانەکان زیاتر بچنەناو ئاسیای بچوك پێویستیان پێی دەبێت. بگەڕێوە بۆ : – الطبري – ب ٨ لا ١١٦. کەوا تەنها ئاماژە بەوە دەکات کە عەباس شارێك و – مطمورة– پێکەوە بۆ رۆمەکان گرتووە.

لەسەر زەمین لەبەرامبەر ئامادەبوونی بێزەنتی، بەڵگەیەکە لەسەر بەهێزی خیلافەت، سەرباری ماندووبوونی بەکپکردنەوەی ئەو بزوتنەوانەی کە دژی رادەپەڕین لە ناوەوە.

لەپاش ئەوە، جموجوڵی ئیسلامی و بێزەنتی تا رادەیەك کەم بووەوە، تاوەکو لەناوەڕاستی سالّی (١٦١ك/٧٧٨ز) خەلیفە هەستا بەناردنی سەرکردەی لێهاتووی خۆی (یمامە بن الولید) لەسەرووی سوپایەکی ئیسلامی گەورە و هێرشی کردەسەر (مەرحەب) و ناوچەکانی دەوروبەری (دابق)، باکووری حەلەب ([1]).

ئیمپراتۆر بەرپەرچی ئەم هێرشەی دایەوە، سوپایەکی نارد، (مرعش)ی پێ گەمارۆدا، هێزێکی سەربازیشی تایبەت کرد بۆ رێگرتن لە هاتنە پێشەوەی (یمامە) بەرەو (الحدپ) و زاڵ بوو بەسەر چەند گوندێکی ئەو ناوچەیەش. بەلام سوپای بێزەنتی شکستی هێنا لەچونە ناوی (مرعش)، سەرکردەکانی بەباشیان زانی گەمارۆیان لەسەر هەڵگرن و بگەڕێنەوە بۆ پایتەخت.([2])

هێرش کردنەسەر (مرعش) جێی ترس و نیگەرانی خەلیفە بوو لەوەی مەترسی بێزەنتی زیاد بکات، بۆیە پێویستی کرد لەسەری بوونی خۆی بسەلمێنێ، ئەوە بوو سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد و سەرکردایەتیەکەی رادەستی (ئەلحەسەنی کوڕی قوحتەبە) کرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر ولاتی بێزەنتی – سەرکردەی ناوبراو– چووەناو (ئەنادۆل) ەوە، (دوریلیوم)یشی گەمارۆدا هێرشی کردەسەر ناوچەکانی دەوروبەر، لە (عەموریە) نزیك بووەوە، پاشان بەهۆی کۆمەکی نەکردن و کەمبوونەوەی ئازووخە، لەناوچەکە پاشەکشێی کرد، لەراستیدا شالاوەکەی هیچ ئامانجێکی ئەوتۆی نەهێنایەدی، بەلام ئامادەبوونێکی ئیسلامی بەهێزی سەلماند لەناوچەکەدا.([3])

لەسالّی (١٦٢ك/٧٧٨ز) بێزەنتیەکان جموجوڵی سەربازییان دەستپێکردەوە و

---

[1] البلاذري:ل ٢٦٧. ابن الاثیر :ب ٥ ل ٦٠.

[2] هەمان سەرچاوە : ل ٢٦٧.

[3] تاریخ خلیفة بن خیاط: ب ٢ ل٤٦٧-٤٦٨. الطبري : ب ٨ ل ١٤٢.

هێرشیان کردەسەر (الحدث) ([1])، بەرپەرچدانەوەی ئیسلامیش لەساڵی داهاتوودا هات، کاتێك هارونی کوڕی مەهدی هێرشی کردەسەر خاکی بێزەنتی و چەند قەڵایەکی گرت گرنگترینیان قەڵای (سمالو) بوو ([2])، ئەوە بوو لەساڵی (١٦٤ك/٧٨١ز) بێزەنتیە ڕوبەڕوی دوو نەهامەتی بووەوە کە بە نەرێنی کاریکردە سەر تواناکانی :

یەکەم: مردنی ئیمپراتۆر (لیو)ی چوارەم، جیا (ئیرین)ی هاوسەری بووە ئیمپراتۆر، وەکو راسپێردراوێك لەسەر (قسطنطين) کوڕە پێنەگەیشتووەکەی، لەئەنجامی ئەمەشدا جۆرە بێزارییەك لەلای سەرکردەکان دروستبوو ([3]).

دووهەم : بێزەنتییە لەو کاتەدا دووچاری شۆڕشێکی گەورە بوو لە دوورگەی (صقلیە)، بۆیە ناچاربوو هێزەکانی دابەش بکات لە نێوان ئەم دوورگەیەو بەرەی رۆژهەڵات لەگەڵ موسڵمانەکاندا.

خەلیفە مەهدی ئەم بارودۆخە نائاساییەی بە هەلزانی، بۆیە شاڵاوێکی گەورەی بۆ وڵاتی بێزەنتییەکان نارد بەسەرکردایەتی (هارون)ی کوڕی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر (قسطنطينية).

شاڵاوەکە لەکاتی چوونەناوەوەدا، هێرشی کردەسەر ناوچە ستراتیجیکانی (کیلیکیا و ئەنادۆل) بە مەبەستی زاڵبوون بەسەریدا.

هارون بۆ ئەوەی ئامانج ونیازی شاڵاوەکە بشارێتەوە، هێزێکی سەربازی نارد هێرشی کردەسەر (تراقیسیۆن) کە ناوچەیەکی سنورییە([4]). سوپای سەرەکیش بەردەوام بوو لەکشانی بەرەو پایتەخت و هەر بەرەنگاربونەوەیەك هاتە ڕێگەی سەر کوتی کرد وزاڵ بوو بەسەریدا ([5]).

لەپاش ئەم گەشەکردنە سەربازییە (ئیرین) هەستی بە ئامانجی ئەم شاڵاوە کرد،

---

[1] الطبري :ب ٨ لا ١٤٢.

[2] هەمان سەرچاوە : لا ١٤٨. اليعقوبي. ب٢ لا ٣٤٧. ابن الاثير :ب ٥ لا ٦٣.

[3] Theophanes: op. cit.p.٩٠.(١) العربي، السيدالباز : الدولة البيزنطية. لا ٢٢٢
Diehl :Lemonde Oriehtal : p ٢٧٩

[4] عبدالله، وديع فتحي :العلاقات السياسية بين بيزنطية و الشرق الادني الاسلامي لا ٢١٦– ٢١٧.

[5] هەمان سەرچاوە.

بۆیە راپەری بۆ بەرگریکردن لەپایتەخت، هێزەکانی توانیان دەورووبەری سوپای ئیسلامی بگرن کەوا تاکەکانی کەوتنە هەڵویستێکی تەنگانەوە ([1])، بەلام هارون بە زیرەکی خۆی و شارەزایی لە سەرکرادیەتی کردن توانی لەم تەنگانەیە دەربازبێت، بەردەوام بوو لەبەرەوپێش چوون تا گەیشتە کەنداوی (قسطنطينية) و هەڕەشەی لەپایتەخت کرد. (ئێرین) خۆیی لەهەڵویستێکی تەنگدا بینی کە دەرفەتی پێ نادا سازش بکات یاخود رێگە چارەیەکی هەبێ، بۆیە ناچاربوو ملکەچ بێ بۆ مەرجەکانی هارون، گرنگترینیان :

- دەبێ (ئێرین) ساڵانە سەرانە بە خیلافەتی عەباسی بدات کە لەنێوان حەفتا هەزار و نەوەد هەزار دینار بوو، بەدووجار بدرێ.
- ئاڵوگۆڕ کردنی دیلەکان لە نێوان هەردوولا.
- دەبێ بێزەنتی پابەندبێ بەکردنەوەی بازاڕەکانیان بۆ بازرگانە موسڵمانەکان لە رێگەی گەڕانەوەیاندا.
- دەبێ بێزەنتی کۆمەڵێ رێنیشاندەر بداتە سوپای ئیسلامی لە رێگەی گەڕانەوەیاندا.
- تاکەکانی سوپای ئیسلامی بۆیان هەیە هەر دەستکەوتێك هەڵگرن لەگەڵ خۆیاندا.
- دەبێ ئاشتەوایی بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بێ ([2]).

بەهۆی ئەم سەرکەوتنە کە هارون هێنایەدی، باوکی نازناوی (الرشيد) ی لێنا ([3])، واتە: هۆشیار و رێبەر.

ئەم شاڵاوە بە گرنگترین شاڵاوی خەلیفە مەهدی دادەنرێ لەسەر بەرەی (بێزەنتی) دا، هەروەها دوا شاڵاوی عەرەبی – ئیسلامی بوو لەسەر (بۆسفور).

ئاشتی و جەنگ ڕاگرتن لەنێوان هەردوولا تا ساڵی (١٦٨ك/٧٨٤ن) بەردەوام بوو. ئەوە بوو بێزەنتیەکان لەپاش تێپەڕبوونی سی ودوو مانگ، هەڵیان وەشاندەوە، بۆیە

---

[1] هەمان سەرچاوە : لا ٢١٧.

[2] تاريخ خليفة بن خياط : ب ٢ لا ٤٧٠. تەنها ئەم باسی ئاڵوگۆڕ کردنی دیلەکان دەکات. الطبري. ب ٨ لا ١٥٢-١٥٣. رستم، اسد : الروم في سياستهم و ثقافتهم و دينهم : ب ١ لا ٢٩٧.
Thwophahes : p ٩٢٠. Ramsay: p ١٥,٩

[3] الطبري : ب ٨ لا ١٥٤.

هێرشی ئیسلامی بۆ خاکی بێزەنتی سەر لەنوێ دەستی پێکردەوە، بەڵام بە بێ ئەوەی ئەنجامێکی هەبێ باس بکرێ، جا ساڵی دواتر مەهدی کۆچی دوایی کرد.
له راستیدا خەلیفە مەهدی ئەنجامێکی گەورەی هێنایەدی لە سیاسەتی جیهادکردندا، ئەوەش بەهێزی موسڵمانانی سەلماند لە ململانێکاندا.

## وەزارەت لە سەردەمی (مەهدی)دا:

شێوەی وەزارەت لە سەردەمی مەهدیدا روونتر بووەوە، چونکە خەلیفە دەسەڵاتی زۆری بەوەزیرەکاندا و بە شێوەیەکی لە رادەبەدەر پشتی پێ ئەبەستن ([1]). بۆیە دامەزراندی وەزیرەکان لەسەردەمی ئەم، بەپێی توانای بەڕێوەبردن و نووسین بوو، لەوانەیە پیلانی داودەستەش کاریگەی هەبوو بێت لەدامەزراندنی هەندێ لە وەزیرەکان و لابردنیان لەسەرکار.([2])، هەروەها رەوشی سیاسیش کاریگەری راستەوخۆی هەبوو لەسەر ئەوە، لەو وەزیرانەی (مەهدی) باسی ئەمانە دەکەین:
- ئەبو عوبەیدڵڵا، معاویەی کوڕی یەسار، مەولای ئەشعەریەکان، ناوبراو پێش ئەوەی خیلافەت بگرێتە دەست نووسەر و جێگری مەهدی بوو، لەساڵی (١٦٢ك/٧٨٠ز) بەهۆی پیلانگێرانی ئەلرەبیعی کوڕی یونس، کەوا دەرگاوان بوو، لەکار دەرکرا.([3]).
- ئەبو عەبدوڵڵا، یەعقوبی کوڕی داود، مەولای بەنی سەلیم، مەهدی لەسەر رێنمایی ئەلرەبیعی کوڕی یونس کردی بەوەزیر، شیعەش بوو. ئەوە بوو بێ فەرمانی خەلیفەی کرد، ئەمیش لەساڵی (١٦٦ك/٧٨٣ز) سزای دا ([4]).
- (الفیض)ی کوڕی ئەبو ساڵحی نەیسابوری. کەسێکی بەخشندە و چاکەکار و دەوڵەمەند بوو، بەڵام زۆردار و خۆبەزلزان بوو، تا مردنی (مەهدی)ش لە پۆستەکەی خۆی مایەوە ([5]).

---

[1] ابن الطقطقا: لا ١٨١.

[2] الصالح : سەرچاوەیەکی پێشوو: لا ٢٩٨.

[3] ابن الطقطقا: لا ١٨٢. الجهشياري : لا ١٤١.

[4] الجهشياري : هەمان سەرچاوە لا١٥٥، ١٦٣.

[5] هەمان سەرچاوە : لا ١٦٤. ابن الطقطقا: ١٨٧.

## جێنیشینێتی – مەرگی مەهدی

مەهدی، عیسای کوڕی موسای لە جێنیشینێتی لابرد، هەردوو کوڕەکەی خۆی (موسالهادی) و پاشان (هارون لرەشید) لەدوای یەك کرد بە جێنشینی خۆی.([1])، هەشت رۆژی مابوو بۆ (مانگی موحەڕەم ساڵی ١٦٩ك/مانگی ئاب ساڵی ٧٨٥ز) مەهدی لە گوندی (الروذ) کۆچی دوایی کرد، بە هۆی کێشانی بەدەرگای کەلاوەیەك لەکاتی وەرزشی راوکردنی ئاسکدا. لە ریوایەتێکی دیکە هاتووە کەوا یەکێ لە کەنیزەکەکانی ژەهری کردۆتە ناو هەندێ خواردەمەنی بۆ کەنیزەکێکی دیکە، جا (مەهدی)ش ئەوەی بزانێ لێی خواردووە بەبێ، بۆیە مرد ([2])

## ئەبو موحەممەدی موسالهادی١٦٠-١٧٠ك/٧٨٥-٧٨٦ز

### ناساندنی ئەلهادی

موسالهادی کوڕی موحەممەد المەهدی کوڕی عەبدوڵڵا لمەنسور کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس. لە (مانگی موحەڕەم ساڵی ١٦٩ك/مانگی ئاب ساڵی ٧٨٥ز) لەتەمەنی بیست وپێنج ساڵیدا خیلافەتی گرتە دەست، کەس لە خوارووی ئەم تەمەنە خیلافەتی نەگرتۆتە دەست ([3])، دایکی بەس کوڕی هەبووە، ناوی (خەیزەران)ە ([4])

لەتەمەنی شانزە ساڵیدا باوکی کردی بەجێنشینی خۆی، هەروەها کردی بەسەرکردەی سوپاکان لەرۆژهەڵات. مەهدی بیری لەوە کردەوە هارونی کوڕی بکا بە جێنشینی یەکەم، ئەوەش چونکە ئەوی بە باشتر دەزانی و (خەیزەران)یش زۆر خۆشی

---

[1] دەربارەی وردە باسی ڕووداوەکانی جێنشینێتی بگەڕێوە بۆ لای – الطبري – ب ٨ ل ١٢٤– ١٢٨ –١٥٤.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل١٦٨–١٧٠.

[3] ابن كثير :ب ١٠ ل ١٥٩

[4] هەمان سەرچاوە : ب ١٠ ل ١٥٩.

دەویست، بەڵام مەرگ پەلەی لێکرد، هەندێ لە کاربەدەستانی دەوڵەتیش، لەپاش مردنی ئەلهادی، هەمان بۆچوونیان هەبوو.

ئەلهادی لە ناو کەیف و خۆشیدا گەورە بوو، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر هەڵسوکەوت و رەفتارەکانی. ئەو لەش بەهێز بووە، بەدوو قەڵفانەوە بازی ئەدایە سەر ئەسپ. باوکی بە ((رەیحانەکەم)) بانگی دەکرد.([1]) ئەو کەسێکی مەرد بووە، شارەزا لە کاروباری دەسەڵات، بەخشندە، بەڵام کەمێك زەبر و زەنگ و دەڕندە بووە، غیرەی لە دایك و براکەی دەکرد، حەزی لە ئەدەب و مێژوو بووە، بۆیە زانیاریەکی زۆری دەربارەیان هەبوو، ناسراو بوو بە حەزکردنی لە گۆرانی، بۆیە ئیبراهیمی موسڵی گۆرانی بێژی عێراقی ناوبانگ و ئیسحاقی کوڕی لەخۆی نزیك کردەوە.([2])

## رەوشی ناوخۆ لەسەردەمی (ئەلهادی)دا

### پەیوەندی لەگەڵ (طالبي) یەکاندا

ئەو سیاسەتە ئاشتی ئامێزە، کە ئەلمەهدی لەگەڵ (طالبي) یەکاندا پەیڕەوی دەکرد، زۆری نەخایاند، چونکە بەمردنی کۆتایی پێهات، ئەوە بوو ئەلهادی تەنگی پێ هەڵچنین و بەتوندی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، مووچە و بژێوی لێی بڕین و فەرمانی بەکاربەدەستەکانی دا چاودێریان بکەن.([3])

وادیارە خەلیفە لەوە دەترسا لەژێر فەرمانی دەرچن، هەروەها سروشتی خۆی و هەستی بەرامبەریان کاریگەری هەبوو لە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دوژمنانە لەگەڵیاندا، لەبەر ئەوەش (طالبي)یەکان لەبارودۆخێکی خراپدا بوون لەحیجاز، بۆیە پەنایان بردبەر شێخ و سەرگەورەیان (ئەلحوسینی کوڕی عەلی کوڕی ئەلحەسەن کوڕی ئەلحەسەن کوڕی ئەلحەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب). ([4])، هانیان دا لەفەرمانی

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الجهشياري : لا ١٧٢. الاصفهاني :كتاب الاغاني : لا ٦. ابن كثير:هەمان سەرچاوەی پێشوو

[3] اليعقوبي : ب ٢ لا ٣٤٨- ٣٤٩.

[4] ئەلحوسەین بە تەمای خیلافەت بوو و پێی وابوو عەباسیەکان خیلافەتیان لە (طالبي)یەکان زەوت کردوە

دەرچێ بۆ ئەوەی لەم ترس و تۆقینە دەرباز بن.

وە وارێککەوت ژمارەیەکی زۆر لەشیعەی عێراق بۆ (مەدینە) هاتن بە مەبەستی حەج کردن، (ئەلحوسەین)یش پەیوەندی پێوەکردن و باروذۆخی خراپی (طالبي)یەکانی بۆ خستنە روو، ئەوانیش بەیعەتیان پێدا و بەڵێنیاندا کاتی دەرچوونیان وەرزی حەجی داهاتوو بێ، رێککەوتن دروشمیان ئەمە بێ ((کێ حوشترە سوورەکەی بینی)).([1]).

دیارە رووداوەکان خێرا تێپەڕ دەبوون، ئەمەش وایکرد لە رابەرانی (طالبي) پەلەبکەن لە دەرچوون. (ئەلحوسەینی کوڕی عەلی)ش کە هەستی کرد مەترسی زیاد بووە لەسەر گروهی (گالبی)، بەپێویستی زانی کاتی دەرچوون پێش بخرێ، بۆیە رایگەیاند کە بەرەبەیانی رۆژی (سێ شەممە لە مانگی – زی العقدە – ساڵی ١٦٩ك/پانزەی مانگی ئایار ٧٨٦ز) کاتی دەرچوونە، ئەوە بوو دەستی بەسەر (مەدینە)دا گرت و مزگەوتی پێغەمبەری کردە بنکەی دەستپێکردن، هەندێ لە خەڵکەکەی بەیعەتیان پێدا هاوکات زۆرینەیان بەدەنگیەوە نەچوون ([2]) وادیارە ئەمانە لە زەبر وزەنگی دەسەڵات ترسیان هەبوو ئەوەش بەهۆی رەقی و دڕندەیی خەلیفە، هەروەها کارەکانی (ئەلحوسەین)یان بەدڵ نەبوو، وەکو کردنی ناو مزگەوتی پێغەمبەر بە بنکەی دەستپێکردن و شوێنی خۆحەشاردان، چونکە ئەوان مزگەوتی پێغەمبەر گەورەو پیرۆز رائەگرن و ئەم کارە ناگونجێ لەگەڵ هەست وسۆزیاندا ([3]).

ئەلحوسەین بۆ ماوەی پانزە رۆژ لە مەدینە مایەوە و پاشان بەرەو (مەککە) چوو بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێ، لە دۆڵی (فەخ) کە لە دەوروبەری (مەککە)دایە کۆمەڵەی بەست ([4])، بەڵام خەلکی مەککە بەدەنگی بانگەشەکەیەو نەچوون.

لەم کاتەدا سوپای عەباسی گەیشتە ناوچەکە، لە هەشتی مانگی – زی الحجە–

---

[1] اليعقوبي : ب ٢ لا ٣٤٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو. الطبري : ب ٨ لا ١٩٥. ابن الاثير : ب ٥ لا ٧٥. المسند. لا ٢٠٢.

[3] الطبري :هەمان سەرچاوەی پێشوو. المسند:هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[4] الاصفهاني :مقاتل الطالبين.لا ٣٦٦.

هێرشی کردە سەر سەربازگەکەیان لە (فەخ) و ئەلحوسەین و شوێنەکەوتووانی لەناوبرد، ئەلحوسەین بە (کوژراوی فەخ) یاخود (کابرای فەخ) ناو زەند کرا.([1]).

ئەو هیواو ئاواتەی کە شیعەکان خستبوویانە ئەم بزوتنەوەیە، پەرش و بڵاو بووەوە. ئەوەی دەربازیش بوو لێیان لە شارەکاندا بڵاوبوونەوە و خۆیان شاردەوە، لەوانەش، ئیدریس و یەحیا هەردوو کوڕەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەلحەسەن، ئەوەی یەکەمیان ڕۆیشت بۆ (مەغریب)و دەوڵەتی (ألادارسە) دامەزراند، ئەوەی تریشیان ڕۆیشت بۆ وڵاتی (دەیلەم) لە ڕۆژهەڵات.

## بەپەندبردنی زەندیقەکان

رقبوونی ئەلهادی لە زەندیقەکان، هەستێك بوو لەباوکی بۆی مابووەوە و سیاسەتی ئەوی پەیڕەو دەکرد لەڕاونانیان و بە پەندبردنیان، جا کۆمەڵێکی لێ کوشتن لەوانەش، (یەزدانی کوڕی بادان) و (عەلی کوڕی-یقگین)، کە دەگێڕنەوە لە کاتی حەجکردنیدا سەیری کردووە خەڵکی بەدەوری مەککەدا دەسوڕێنەوە (تەواف دەکەن)، وتویەتی ((بە هیچ نایانچووێنم بەکۆمەڵی مانگا نەبن پێ بە خەرماندا دەنێن)).([2])

## جێنشینێتی - مەرگی ئەلهادی

ئەلهادی بڕیاری دا (هارون ڕشید)ی برای لە جێنیشینێتی خۆی لابەرێ وبەیعەت بۆ (جەعفەر)ی کوڕی وەرگری کە هێشتا منداڵیش بوو، هەوڵیدا قەناعەتی پێ بکات خۆی واز لەو مافەی بهێنێ، خەریك بوو رازی بێ ئەگەر (یەحیای کوڕی خالدی بەرمەکی) نەبووایە([3])، ئەوجا ئەلهادی پەنای بردەبەر بەکارهێنانی شێوازی زەبرو زەنگی و تەنگ پێهەڵچنین، ئەمەش وای کرد هارون لەپایتەخت دووورکەوێتەوە، هەر بەدووری

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الطبري: ب٨ لا ١٩٠

[3] الجهشياري :لا١٦٩ - ١٧٠

مایەوە تا ئەوکاتەی ئەلهادی کۆچی دوای کرد، ئەوجا بەیعەتی پیّ درا ([1]).

ماوەی خیلافەتی ئەلهادی زۆری نەخایاند، دوانزە شەوی مابوو لەمانگی(رەبیعی یەکەم سالّی ۱۷۰ ک/مانگی ئەیلول سالّی ۷۸٦ ز) لەبەغدادا کۆچی دوایی کرد. پاش ئەوەی کە سالّیك و دوومانگ و بیست ودوو رۆژ حوکمی کرد. وادیارە ئەو بەدەستی (برینی گەدە)وە دینالاّند، بەلاّم هەبوونی ناکۆکی لە ناو خانەوادەکەیاندا، وای لە هەندیّ میّژوونووسان کرد بلّیّن بە خنکاندن لەکاتی خەوتنیدا لەلایەن کەنیزەکانی دایکی مردووە و بەفەرمانی دایکی ([2]).

[1] هەمان سەرچاوە

[2] الیعقوبي:ب۲ لا ۲٥۱. الجهشیاري :لا ۱۷٤.الطبري:ب۸ لا۲۰٥ - ۲۰٦.

## بەندی چوارەم

## ئەبو جەعفەر (هارون ڕەشید)١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٩ز

### ناساندنی هارون ڕەشید ([1])

هارون ڕەشید، میری بڕواداران، کوڕی ئەلمەهدی، ئەبوجەعفەری قرشی هاشمی، دایکی ناوی (ئەلخەیزەران)ە، دایکی بەس کوڕی هەبووە. لەپاش مردنی (ئەلهادی)ی برای، لەسەر ڕاسپاردنی (ئەلمەهدی)ی باوکی بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت لە(مانگی ڕەبیعی یەکەم ساڵی ١٧٠ك/مانگی ئەیلول ساڵی ٧٨٦ن.

هەر لەمنداڵیەوە نیشانەکانی زرنگی و زیرەکیی لەسەر دەرکەوت، کاتێك بوو بە گەنج، باوکی ویستی ڕاستەوخۆ لەدوای خۆی بیکا بە خەلیفە، (ئەلخەیزەیران)یش هانیدا ئەو کارەبکات چونکە هارونی لە ئەلهادی زیاتر خۆش دەویست.

هارون ڕەشید بە بەناوبانگترین خەلیفەی عەباسی دادەنرێ، ناوبانگیەکەی سنوری ڕۆژهەڵاتی بەزاند و گەیشتە ڕۆژئاوا، کۆمەڵەی ڕۆژئاوا خستیانە بەرباس و شی کردنەوە وە هەندێ لە شارەکانی ئۆرپا هەوڵیاندا لێی نزیك ببنەوە و بیکەنە دۆستی خۆیان.

لە دەنگوباسی ئەودا ڕاستیەکانی مێژوو ئاوێتەی خەیاڵی چیرۆکەکان بووە، کۆمەڵێ ئاکاری زۆر لە یەك جیاوازی هەبوو، کەوا کەمجار لەیەك کەسدا کۆ دەبێتەوە. ئەو سیاسەتمەدارێکی شارەزا بوو، توندوتۆڵی مەنسور و زەبر وزەنگی و شێوازەکانی تیا بوو لەگەڵ نەرم و نیانیەکی روون و ئاشکرا و پارەبەخشین بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵکی، زۆر بایەخی بەکاروباری هاوڵاتیانی دەدا، خۆی نەناس دەکرد و لەبازارەکاندا دەگەڕا و لە کوڕەکاندا بەشدار دەبوو تا حاڵی خەڵکی بزانێ، زۆر هەستیارو توندڕەو بوو، زوو کاریگەر دەبوو، کە تووڕە بوایە بەخراپی تۆڵەی ئەسەند، کە دڵیشی نەرم

---

[1] سەبارەت بە کەسایەتی هارون ڕەشید، بگەڕێوە بۆ : الطبري : ب ٨ لا ٢٤٧-٢٥٩.ابن كثير : ب ١٠ لا ٢١٣-٢٢٢.

بوایە و سۆزی بجولاّیە دەگریا و بەزەییەکی بێ وێنە و هەست و سۆزێکی گەورەی نیشان ئەدا. هارون ڕەشید کەسێکی دیندار بووە، خواناس، پابەند بە ئەرکە شەرعیەکان و دەقەکانی قورئان و سوننەت، ئەگەر جیهادی نەکردایە، حەجی دەکرد، ئەو ژیانی بە حەج و جیهاد کردندا تەواو کرد، ڕۆژانە سەد ڕکات نوێژی دەکرد، و بە پیادە حەجی کردوە، هیچ خەلیفەیەکی دیکە جگە لە ئەو بەپێ حەجی نەکردوە و ژیانی خێزانیشی پشتگوێ نەخستوە.

حەزی لە شیعر و ئەدەب و دین دەکرد، شاعیران و گۆرانی بێژان و ئەدیبەندان و فەقێکانی لەخۆی نزیك کردەوە و ڕێزی لێگرتن، هانی وەرگێڕانی دا بۆ زمانی عەرەبی، وادیارە ئەو خاوەن  توانایەکی شیعری و ئەدەبی بوو، حەزی لە مشتومڕی لە ئاییندا نەبوو،  دانیشتنەکانی شەوانەی ناسراو بوو بەوتوێژی ئاست بەرز.

لەراستیدا ئەم وێنە جیاوازانەی هارون ڕەشید ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمە بوو کە تیایدا ژیا، شێوازی پەروەردەبوونی و بیرکردنەوە و هەست ونەستی دەنوێنێ.

چونکە سەردەمی ئەو، سەردەمی پارە زۆری و ڕۆچوونە ناو شارستانیەت بووە بەهۆی هەبوونی داهات و پارەی زۆر و پێشکەوتنی زانستی و فەلسەفی. لە خۆشگوزرانیدا پێگەییوە، لەسەر جیهاد و چۆنێتی سەرکردایەتیکردن پەروەردە بووە.

سەردەمی هارون ڕەشید بە سەردەمی زێرین لە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا ناودەبرێ. چونکە گەیشتە ئاستێك هیچ سەردەمێکیتر پێی نەگەیشتووە، بووە ناوەندی بازرگانی جیهانی، قیبلەی زانا و ئەدیبەکان. سەبارەت بەکەسایەتیشی، ئەوا مێژووی سەردەمێك دەنوێنێ زیاتر لەوەی مێژووی مرۆڤێك.

## ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی (هارون ڕەشید)دا

### پەیوەندی لەگەڵ (طالبي)یەکاندا

هارون رەشید لەسەرەتای حوکمڕانیدا ویستی (گالبی)یەکان بۆ لای خۆی رابکێشێ، ئەوەش لە رێگای نواندنی سۆزو بەزەیی لەگەڵیاندا، پاش ئەو سیاسەتە توندو تیژەی کە (ئەلهادی) بەرامبەریان پەیڕەوی کرد، جا هەوڵیدا نەرم و نیان و هاوسۆز بێ لەگەڵیانداو دڵنەوای کردن و بەندکراوەکانیانی بەردا ئەوانەی کە لەبەغداد بوون، گەڕاندنیەوە بۆ (مەدینە)، جگە لە (ئەلعەباسی کوڕی عەبدوڵڵا)، والی مەدینەی لەسەر کار لابرد چونکە دەیچەوساندنەوە ([1]).

بەڵام (طالبي)یەکان لەو بیروباوەڕە چەسپاوە، پەشیمان نەبوونەوە، کەوا خۆیان خاوەنی راستەقینەی خیلافەتن و قەت رانەوەستان لە خەبات کردن لە پێناوی. لەبەر ئەمەش، ئەو دڵپاکییەی نێوان لایەنی عەباسی و لایەنی عەلەوی زۆری نەخایاند، ململانییەکە بە توندی لە نێوانیاندا دەستی پێکردەوە.

شەڕی (فەخ) دەمێك بوو کۆتایی هاتبوو، ئەوەبوو دووان لە رابەرانی (طالبي)یەکان لەو شەڕە دەربازبوون، ئیدریسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەلحەسەن، کە بۆ ئەفریقا چوو، یەحیای برای کە بەرەو وڵاتی (دەیلەم) چوو لە رۆژهەڵات، سەبارەت بە ئیدریس ئەوا لەهەرێمی (طنجة) لەمەغریبی دوور جێگیربوو، بەربەرکان پاڵپشتیان کردو توانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ خۆی دامەزرێنێ کە بریتی بوو لە دەوڵەتی (ألادارسە). ئەمەش یەکەم دەوڵەتی (طالبي)یە کە لەخیلافەتی عەباسی جیابێتەوە.

ئەم دەوڵەتە مایەی هەڕەشە بوو بۆ سەر دەسەڵاتی دەوڵەتی عەباسی لەباکووری ئەفریقیا، بۆیە هارون بڕیاری دا لە ناوی بەرێ، بەڵام دوودڵ بوو لە ناردنی سوپا بەهۆی دووری رێگاو ترسی لەفراوانبوونی دەسەڵاتی ئیدریس بۆ ناو میسرو وڵاتی شامدا ئەگەر هاتوو سەرکەوت بەسەر سوپای عەباسیدا، سەرئەنجام دەوڵەتی

---

[1] الطبري: ب٨ ل ٢٣٥.

خیلافەتی عەباسیش لەناو ئەدات([1])،

ئەوسا پەنای بردەبەر فێڵکردن بۆ لەناوبردنی ئیدریس، پیاوێکی هەڵبژارد ناسراوبوو بە زیرەکی، سولەیمانی کوڕی جەریر ناوبانگ بە (الشماخ) واتە: (جامانە لەسەر)، بەکاری هێنا بۆ تیرۆرکردنی، ئەوەبوو ئەم پیاوە لەساڵی (١٧٧ك/٧٩٣ز) توانی ئیدریس بە ژەهر بکوژێ ([2]).

وادیارە مردنی ئیدریس، کۆتایی بەدەوڵەتی (ألادارسە)ی نەهێنا، چونکە ئەو کەنیزەکێکی بەربەری ژنی بوو و سکی پڕبوو، شوێنکەوتووانیشی چاوەڕان بوون منداڵی بێ، ئەوە بوو کوڕێکی بوو، ناوی (ئیدریس)یان لێنا، کاتێك تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ، بەربەرەکان بەیعەتیان پێدا و کاروباری خیلافەتیان رادەست کردو بووە دامەزرێنەری راستەقینەی دەوڵەتی (ألادارسە) لە مەغریب.

کە مەترسی ئەم دەوڵەتە زیادی کرد، هارون ویلایەتێکی ئەفریقیای رادەست (ئیبراهیمی کوڕی ئەلئەغلەب) کرد، بۆ ئەوەی بەرەو رووی راوەستێ ([3]).

سەبارەت بە (یەحیا)، ئەوا لەوڵاتی (دەیلەم)داپشتی قایم بوو، بەهۆی ئەو هەموو خەڵکەی کە شوێنی کەوتبوون، پاشان لە ساڵی (١٧٦ك/٧٩٢ز) دەرچوونی خۆی راگەیاند، بەوەش هەڕەشەی لە هێمنی و ئاسایشی دەوڵەتی کرد و بووە مایەی نیگەرانی بۆ هارون ([4]).

لەو شتانەی کە هێزو توانایەکی بە بزوتنەوەکەی بەخشی، دووری ئەو ناوچەیەی کە تێیدا دەرچوو لەبەغدادەوە و پارێزراوی لە رووی سروشتیەوە.

خەلیفە خۆی یەکلایی کردەوە لەسەر ئەوەی بزوتنەوەی یەحیا لەناو بەرێ، بۆ ئەم مەبەستەش ناردیە شوێنی (الفضل)ی کوڕی یەحیای بەرمەکی)، کەوا سەرکەوت لە راکێشانی یەحیا بۆ لای خۆی. پاش ئەوەی کە شوێنکەوتووانی لێی دوور کەوتنەوە،

---

[1] المسند : ل ٢٠٧.

[2] الاصفهاني : مقاتل الطالبين : ل ٤٠٧-٤٠٨.

[3] هەمان سەرچاوە : ٤٠٩.

[4] الطبري :ب ٨ ل ٢٤٢.

بۆیە دڵی بۆ لای ئاشتبوونەوە دەشنا. (هارون رەشید)یش دڵنەوای کردەوە و لەبەغداد پێشوازی لێکرد ([1]).

وادیارە خەلیفە لە نیازی یەحیا دڵنیا نەبوو، داردەستەش ڕۆڵیان هەبوو لەتێکدانی پەیوەندی نێوانیان، بۆیە خستیە ژێر چاودێری (الفضل-ی کوڕی یەحیا). ئەوە بوو یەحیا کاری تێکردو ئەویش بەبێ ئاگای خەلیفە بەریدا و ڕۆیشت بۆ حیجاز. ئەوجا هەواڵی درۆیان بە خەلیفە گەیاند کەوا یەحیا بانگەشە بۆ خۆی دەکات لەحیجاز، ئەمەش ڕێك بوو لەگەڵ ئەوە گومانەی کە لەناخیدا هەبوو، بۆیە دەستگیری کرد و خستیە بەندیخانەوە و پاشان کوشتی ([2]).

سەبارەت بەو کەسایەتیەی تر کە لە سەردەمی (هارون)دا لەناودرا، ئەوا ئیمام (موسا -الکاظم-ی کوڕی جەعفەر) بوو. لەراستیدا هارون رەشید چاودێری هەموو جموجوڵێیکی (طالبی)یەکانی دەکرد لەحیجازدا، زانی کە خەڵکی پاڵپشتی دەکەن و پێنج یەکی پارەکانیان پێ ئەدەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان باوەڕیان بە ئیمام بوونی ئەو هەیە. بۆیە دەستگیری کردو خستیە زیندانەوە، لەساڵی (١٨٢ ك/٧٧٩ز) کۆچی دوایی کرد، واشدیارە ئەو کوژراوە.([3]).

## بزوتنەوەی خەواریجەکان

ئەو پەشێوی و پاشا گەردانیەی کە باڵی بەسەر هەندێ ناوچەی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا کێشابوو، هۆکارەکەی (گالبی)یەکان نەبوون بەتەنها، بەڵکو کۆمەڵانێك لەناو موسڵمانانداا پەیدا بوون نکۆڵیان لە زۆر و ستەمی خەلیفە عەباسیەکان کردو پابەند نەبوونیان بە حوکمە شەرعیەکان، ئەمانەش (خەواریجەکان) بوون کەوا لەسەردەمی (هارون رەشید)دا لەساڵی (١٧٨ ك ٤٧٩ ز) لەناوچەی جەزیرەدا بە سەرکردایەتی (گریف الشاری) کەوتنە جموجوڵ و بەتەواوەتی بەسەر ئەرمینیا و

---

[1] الاصفهاني : لا ٢٩٣-٢٩٤.

[2] هەمان سەرچاوە : لا ٤٠١، ٣٩٥-٤٠٤.

[3] هەمان سەرچاوەی پیشوو :لا ٤١٢- ٤١٧.

ئازەربایەنجان، زاڵبوون، هەڕەشەیان لە سەر گەورەکانی عێراق کرد لەسەر رووباری دیالە (ئاوی سیروان) و گەیشتنە حەلوان.

هارون رەشید پرسی ئەم گروپەی گرتە ئەستۆ، لەساڵی (١٧٩ك/٧٩٥ن) بە سەرکردایەتی (یەزیدی کوڕی مەزیدی شەیبانی) هێزێکی سەربازی نارد، لە (حدیپە)ی فورات لەدووری چەند کیلۆمەترێکەوە لەئەنبار، بەریەککەوتن و خۆیان و رابەرەکەیانی لەناوبرد ([1]).

## پەشێوی لە وڵاتی شامدا

شەڕی هۆزایەتی لە نێوان گروپە بەهێزەکاندا لە وڵاتی شام کپ نەکرایەوە. لەساڵی (١٧٦ك/٧٩٢ن) لەدیمەشق کێشەکە تەقیەوە و نزیکەی دوو ساڵ بەردەوام بوو، ئەمەش پاڵی بە (هارون رەشیدە)وە تا گۆڕانکارییە ئیداری بکات والیەکان بگرێتەوە. بەڵام پرسەکە هێور نەبووەوە لەسەر دەستی ئەمانە نەبێ: موسای کوڕی یەحیای کوڕی خالد لەساڵی (١٧٨ك/٧٩٤ن)، جەعفەری کوڕی خالد لەساڵی (١٨٠ك/٨٩٦ن). لە پاش دووبارەبوونەوەی پێکدادان ([2]).

## پەشێوەی لە ئەفریقیادا

لەساڵی (١٧١ك/٧٨٧ن) پەشێوی باڵی بەسەر ئەفریقیادا کێشا، لەئەنجامی یاخی بوونی خەواریجەکان و سەرانی سوپا و بەربەرەکان، (هارون رەشید)یش، (هریمەبن أعین)ی وەکو والی بۆ سەر ئەفریقیا ناردو فەرمانی پێکرد راپەرینەکان دامرکێنێتەوە و ئاسایش و ئارامی بگەڕێنێتەوە، ئەوە بوو لەکارەکەی سەرکەوتوو بوو و چووە ناو (قەیرەوان)ەوە و خەڵکیشی دڵنیا کردەوە.

---

[1] الطبري : ب ٨ لا ٢٥٦. دەربارەی – حدیثة – ی فورات بگەڕێوە بۆ : الحموي، یاقوت، معجم البلدان ب ٢ لا ٢٣٠-٢٣١

[2] الطبري : ب ٨ لا ٢٥١-٢٦٢. ابن الاثیر : ب ٥ لا ٩١- ٩٢.

❁ الیعقوبي؛ ب٢ لا٣٥٨. هەمان سەرچاوە: لا١٠٩

وادیاره ناکۆکی لەنێوان گروپە جیاجیاکانی ئیسلام گەورە بوو، بۆیە گێرو گرفت سەر لەنوێ سەری هەڵدایەوە، (هرپمە)ش نەیتوانی ئەو درزەی نێوانیاندا پڕبکاتەوە، بۆیە لەسەر داواکاری خۆی لەساڵی (١٨٠ك / ٧٩٦ز) خەلیفە لەسەر کار لایبرد، هەروەها ئەو والی یانەی کە لەدوایەوە هاتن نەیانتوانی بەسەر بارودۆخەکە زاڵ بن، (ئیبراهیمی کوڕی ئەلئەغلەب)یش کاربەدەستی هەرێمی زاب (جەزائیری ئەمڕۆ)، ئەم رەوشە تێکچووەی بەهەلزانی و داوای لە خەلیفە کرد بیکاتە والی لەسەر ئەفریقیا و بەڵێنیدا بارودۆخەکە کپ بکاتەوە. خەلیفەش داواکەی پەسەند کردو لە (مانگی – جمادی الاخره – ساڵی١٨٤ك مانگی تەمموزی ساڵی ٨٠٠ز ویلایەتی ئەفریقیای پێ سپارد(*). ئیبراهیم سەرکەوتوو بوو لە چەسپاندنی سەقامگیری، ئەوەش بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی میانڕەوە، ئەفریقیاش لەسەردەمیدا ئاوەدانکردنەوەیەکی فراوان و چالاکیەکی ئابوری گەورەی بە خۆوە بینی. بەمەش ئیبراهیم رێگەی خۆشکرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی (ألاغالبه) کەوا زۆری نەخایاند لە ئیدارەی ناوەندی لەبەغداد جیا بووەوە و (قەیرەوان)ی کردە پایتەخت ([1]).

## پەشێوی لە رۆژهەڵاتدا

هارون رەشید دەستی فەرمانبەرانی لە هەرێمەکاندا بەردابوو بەبێ ئەوەی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، سەرەنجام هەندێکیان ترازان و بوونە هۆی بەرپابوونی راپەرینی میللی. کاریگەری ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەت لەخۆراساندا دەرکەوت، ئەوەبوو کاربەدەستانی ئەم هەرێمە سەرقاڵی بەرژەوەندییە کەسیەکانی خۆیان بوون و تامەزرۆی دەوڵەمەنی بوون، کاروباری هاوڵاتیانیان پشتگوێ خستبوو، تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە لەرێ دەرچوون باجیان زیاد کرد.

رەنگە چاوچنۆکترین کاربەدەست (عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان) بێ، کەوا بۆ ماوەی دە ساڵ خۆراسانی بەڕێوە برد، دە ساڵی پڕ لە زۆرو ستەم لەخەڵکی،

---

[1] الطبري :ب ٨ لا ٣١٤ ,الدوري : لا ١٠٨.

بەجۆرێك كە توانایان نەما لەوە زیاتر بەرگە بگرن ([1])، ئەوە بوو لەم بارودۆخەدا (رافعی کوڕی– اللیپ–ی کوڕی نەسری کوڕی سەیار) لە حکومەتی ناوەندی یاخی بوو، بەهۆی چەند پاڵنەرێکی کەسیەوە، خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی خۆراسان و وڵاتی دوای رووبار شوێنی کەوتن بە هۆی رقهەڵگرتنیان لەسیاسەتی عەباسیەکان، خەڵکی (نەسف)یش نوسراوێکیان بۆ نارد تێدا داوایان کرد کەسێکیان بۆ بنێرێ یارمەتیان بدات بۆ یاخی بوون لە والی عەباسی ([2])، لەئەنجامی راپەرینی ئەم بزوتنەوانە دژی، (عەلی کوڕی عیسا)ی والی، ناچار بوو بەرگری لە دەسەڵاتەکەی بکات، بەڵام سەرنەکەوت لە دامرکاندنەوە راپەرینەکە، پرسەرکەی لای هارون رەشید ئاشکرا بوو کەوا لەسەر کار لایبرد و دەستی بەسەر پارە و سامانیدا گرت، (هرپمە بن أعین)ی لەشوێنی دامەزراند و فەرمانی پێکرد دادپەروەر بێ لەگەڵ خەڵكدا و بە چاکی مامەڵەیان لەگەڵ بکات([3]). وادیارە (رافع) بارودۆخی تێکچووی بە هەلزانی و بزوتنەوەکەی دژی دەسەڵاتی عەباسی دەستی پێکردەوە، بۆیە هارون رەشید ناچار بوو بە خۆی بچێ بۆ خۆراسان تا سنورێك بۆ ئەو شلۆقی و پاشاگەردانیە دانێ لە ناوی، بەڵام لە رێگەدا مەرگ یەخەی پێگرت ([4]).

لێقەومانی بەرمەکیەکان

بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوە بۆ کوشتنی ئەبو موسلیم و بەدیهێنانی ئاواتە سیاسیەکانی لەناخی شوێنکەوتووانی لە خۆراساندا هەر مابووەوە، جا لەگەڵ بەرەو پێشچوونی رۆژگاردا ئەم بیرۆکەیە رێبازێکی نوێی گرتەبەر، واش پێویستی دەکرد لەناوەوە بەسەر دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا زاڵبێ، لەپاش شکستهێنان هەوڵدان بۆ روخاندنی لەدەرەوە. ئەوە بوو ژمارەیەك لە وەزیرانی عەباسی بەرەگەز فارسی

---

[1] الطبري : ب ٨لا ٣١٤. الدوري : لا ١٠٨.

[2] اليعقوبي : ب ٢ لا ٣٨٦. الطبري : هەمان سەرچاوە. لا ٣١٥– ٣١٩–٣٢٠ –٣٢٣.

[3] الطبري : هەمان سەرچاوە : [illegible] ٣٢٤– ٣٤٤.

[4] هەمان سەرچاوە : لا ٣٤٣– ٣٤٤.

ئەوەیان هێنایەدی، ناوبانگترینیان خانەوادەی بەرمەکیەکان و خانەوادەی بنەماڵەی سەهل و خانەوادەی تاهیری بوو[1].

خانەوادەی بەرمەکی کە خانەوادەیەکی فارسی رەسەنە، بۆ بەرمەکی باپیرەیان دەگەڕێنەوە، ئەمەش نازناوێکە بە مجەوری پەرستگەی (نەوبەهار) لەشاری (بلخ) دەوترا.[2]

لەسەرەتای سەردەمی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، (خالیدی کوڕی بەرمەك) لەو خانەوادەیە ناوی دەرکرد، ئەوەش لەمیانەی توانا ئیداری و داراییەکانی، گەورەیی ئەقڵی و دووبینی، بەمەش سەرنجی بەرپرسە عەباسیەکانی بۆ لای خۆی راکێشا.

(خوێنرێژ)یش دیوانی دارایی و دیوانی سەربازەکانی پێ سپارد [3] هەروەها لەپاش کوژرانی (ئەبو سەلەمەلخەلال) وەزارەتی جێبەجێکردنیشی گرتە دەست، بووە راوێژکاری مەنسور و سەرپەرشتیاری کاروباری دارایی و ناوی لە دروستکردنی شاری بەغدادیش دەرکرد [4]، بە حوکمی پۆستەکەی، لەسازکردنی بڕیارە سیاسیەکانیشیدا بەشدار دەبوو، لەسەردەمی (مەهدی)شدا کەوا لە ساڵی (١٦٣ك/٧٨٠ز) ناوچەی فارسی پێ سپارد، پلەوپایەی هەر بەرز بوو [5].

(خالید) پیاوێکی خستەوە ناوی (یەحیا) یە، بە نێوەندکاری خانەوادەی بەرمەکی دا ئەنرێ، مێژووی ناوبراو پەیوەست بوو بە مێژووی هارون رەشیدەوە. نوسینی بۆ گرتە ئەستۆ، نوێنەری خۆی و وەزارەتەکەی بوو [6]. رۆڵێکی ئاشکرای هەبوو لەمسۆگەرکردنی خیلافەت بۆی، دووچاری فشارێکی گەورە بوو لەلایەن (مەهدی)ەوە کەوا دەیویست هارون لابەرێ و جەعفەری کوڕی بکا بە جێنشین لەباتی.

وادیارە یەحیا ئاواتە سیاسیەکانی باوکی بۆی مابووەوە، کەوا ئەفەوتا ئەگەر

---

[1] العمرو : ل ٢٠٣-٢٠٤.

[2] المقدسي : البدء و التاريخ.ب ٦ ل ١٠٤. بروكلمان. كارل.تاريخ الشعوب الاسلامية : ل ١٨٦.

[3] الجهشياري :ل ٧٨-٧٩.

[4] بروكلمان : ات ١٨٦.

[5] الجهشياري : ل ١٥١.

[6] دەربارەی پلەو پایەی یەحیا لەلای هارون رەشید. بگەڕێوە ■ هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل ١٧٧.

هارون لە جێنشینێتی دووربخرایەتەوە، جا کاتێك بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت، چاکەی یەحیای لەبیرنەچوو، وەزارەتی دەسەڵاتپێدانی پێ سپارد و هەندێ دەسەڵاتی رەهای پێدا ([1])و هەموو دیوانەکان و دوو وەزارەتیشی بەدەستەوە بوو ([2]).

هەروەها چەند تایبەتمەندیەکی نوێی پێدا. ئەو یەکەم کەسە فەرمان بەوەزیرەکان بدات، ئەو نوسراوانەی کە لە دیوانی دارایی دەرئەچوو و جێبەجێ ئەکرا ناوی ئەمی لەسەر دەنوسرا، خەلیفەش تەنها فەرمانی جێبەجێکردنی دەر ئەکرد.([3])

بەهاوکاری هەر دوو کوڕەکەی (الفضل) و جەعفەر، یەحیا توانی بۆ ماوەی حەڤدەساڵ دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی بەڕێوەبەرێ (١٧٠-١٨٧ك/٧٨٦-٨٠٣ن)، بەوەش بیرۆکەی بەشداریکردنێکی تەواوەتی لەحوکمڕانیدا هێنایەدی. ئەم ماوەیەش بەراستی بە ماوەی درەوشانەوەی بەرمەکیەکان و سەردەمی زێڕینیان دادەنرێ.

سەبارەت بە (الفضل)، ئەوا برای شیری خەلیفە بوو، هارون رەشید کردی بە سەرپەرشتیاری پەروەردەکردنی (ئەمین)ی کوڕی، چەندین پۆستی کارگێری و سەرکردەیی پێ سپارد، بە تایبەتی لە رۆژهەڵات، چونکە بوژانەوەیەکی ئابوری و ئاوەدانی هێنایەدی و ئەمن و ئاسایشیشی چەسپاند ([4]).

سەبارەت بە جەعفەر، ئەوا هاودەمی هارون بوو، چونکە ئێسك سووك بوو ([5]) جا شەو و رۆژ لە گەڵیا بوو. ئەو لە هەموو بەرمەکیەکان نزیکتر بوو لەلای، پێی دەوت براکەم و یەك کراسیشیان لەبەر دەکرد ([6]) ئەم تێکەڵی و هۆگرییە وایکرد جەعفەر کاریگەریەکی زۆری هەبێ لەسەر هارون بە شێوەیەکی لە رادەبەدەر، تەنانەت بەسەر تایبەتمەندیەکانیشی زاڵبوو، ئەوەبوو لەگەڵ خۆیدا بەشداری پێکرد لە دادگایی کردن و

---

[1] بگەرێوە بۆ دەقی دەسەڵات پێیدانەکە لە لای الجهشیاری تا ١٧٧.

[2] هەمان سەرچاوە. الطبري: ب ٨ ل ٢٣٥.

[3] الجهشیاري : هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ١٨٩-١٩١-١٩٣.

[5] ابن الطقطقا: ل ٢٠٥

[6] الجهشیاري : ل ٢٠٤.

❁ گرتنە دەستی خانەی باج شتێکی نوێ بوو و ئیمتیازێکی سەرسور هێنەر بوو، چونکە لە پێش ئەم خەلیفەکان خۆیان بەم کارە هەڵدەستان و چاودێری پێوانەی درهەم و دینارە کانیان دەکرد.

چاودێری کردنی دیوانەکانی باج و فەرشسازی و پۆستەشی پێسپارد (ﷺ) هەروەها فەرمانی ا ناوی لەسەر درهەم و دینارەکاندا بنووسرێ لە (مەدینە السلام – بەغداد) و لە(موحەممەدیە) و ویلایەتی (مەغریب)یش لە ئەنبارەوە تاوەکو ئەفریقیای پێ سپارد، سەرەڕای خۆراسان و سجستان و تەبرستان و ئەرمینیا و ئازەربایجان ([1]) جا شتێکی سروشتییە لەم پلەو پایەیەدا ئامۆژگاری هارون بکات بە پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی دیاریکراو ([2]).

لە ریزی بەرمەکیەکاندا، موحەممەدی کوڕی خالیدی کوڕی بەرمەك ناوی دەرکرد، کەوا بوو بەدەرگەوانی هارون، موسای کوڕی یەحیای کوڕی خالید کەوا (شام)ی گرتە دەست ([3]).

وادیارە ئەم دابەشکردنە لە پۆستە گەورەکانی دەوڵەتدا، هەر لەخۆیەوە نەهاتۆتە کایەوە. بەرمەکیەکان ئامانجیان ئەوەبوو دەورووبەری هارون بگرن تا بتوانن کۆنترۆڵی بکەن یاخود بەویستی ئەوان بجوڵێ، هەروەها دەبینین زۆربەی پیاوە ناوبانگەکانی دەوڵەت شوێنکەوتووی ئەوان بوون، بە جۆرێك هارون زۆر ماندوو دەبوو تا پیاوانێك بدۆزێتەوە سەربە ئەوان نەبێ و هەندێ کاروباری دەوڵەتیان پی بسپێرێ ([4]).

بوونی سیاسیی بەرمەکیەکان سێ ئاکاری هەبوو ([5]):

یەکەم: ئەم خانەوادەیە بە بەراورد لەگەڵ بوونی سیاسی خانەوادەکانی پێش خۆیان یاخود هاوچەرخیان وەکو ئەبو موسلیمی خوراسانی، زۆرتر مایەوە.

دووهەم: گەشەکردنی سیاسیی ئەم خانەوادەیە وادیارە نەخشەی بۆ کێشراوە. چونکە بە رۆڵێکی ئاسایی لەبزوتنەوەی عەباسی دەستپێدەکات و گەشە دەکات بۆ گرتنەدەستی هەندێ پۆستی دەوڵەت، پاشان خانەوادەکە دەچنەناو جەرگەی ماڵی

---

[1] المقريزي : شذور العقود في ذكر النقود. لا ٢١، ١١ – الطبري : ب ٢ لا ٢٤٢، ٢٤٢.

[2] العمرو : لا ٢١٨.

[3] الجهشياري : لا ١٨٧.الطبري: ب ٨ لا ٢٥١.

[4] الجهشياري : هەمان سەرچاوە : لا ٢٥٤.

[5] العمرو : لا ٢١٣.

عەباسیەوە، واتە ئەم گەشە کردنە ورد وردە بەرەو سەرەوە دەچوو، لەئامێرێکی جێبەجێکردنەوە بۆ دەستێوەردان لە نەخشەکێشانی سیاسەتی دەوڵەت.

سێهەم: بەردەوام پەیوەندیان لەگەڵ خەلیفەکاندا بوو، تەنها جاروبار نەبێ خانەوادەکە دووچاری تەنگ پێهەڵچنین بوون.([1])، لەژیانی (ئەلخەیزەران)دا، دایکی هارون، ئەم خانەوادەیە گەیشتە لووتکە، بەڵام کاتێك کۆچی دوایی کرد لەساڵی (١٧٣ك/٧٨٩ز)، متمانەی خەلیفە بە تاکەکانی کەم بووەوە، تا وای لێهات تەنگی پێهەڵچنین.

مێژوونوسان ناکۆکن لە دەستنیشانکردنی هۆیەکانی لێقەومانی بەرمەکیەکان، ئەم ناکۆکیەش هۆکەی دەستنیشانکردنی ئەو رۆڵەیە کە ئەمان گێراویانە، چونکە ریوایەتگێرەکان یان لایەنگریان بوونە یان دژیان، سەرەرای باس نەکردنی هارون بۆ ئەم هۆکارانە.

وادیارە ئەم هۆکارانە دەگەرێتەوە بۆ دوو پاڵنەری سەرەکی، سیاسی و دارایی ([2]).

لە رووی پاڵنەری سیاسیەوە، ئەوا لەپاش تێپەربوونی چەند ساڵێك لەدەرکەوتنیان، هارون بۆی روونبووەوە کە بەرمەکیەکان بوونەتە مەترسیەکی راستەقینە لەسەر دەوڵەتەکەی، پەیدابوونی ئەم هەستە بەهۆی چەند هۆکارێکەوە بوو، ئاشکراترینیان پشتگیری کردنیان لە(طالبي)یەکان بوو ([3]).

بەرمەکیەکان مەیلێکی سیاسیان دەرخست بۆ لای (گالبی)یەکان و مێژوویان پەیوەستە بە هاوسۆزییان لەگەڵ یەحیای کوری عەبدوڵلای عەلەوی و ئەحمەدی کوری عیسای کوری یەزید ([4])، ناکۆکە لەگەڵ پەیوەندییە دژ بە یەکەکانی نێوان عەباسیەکان و (گالبی)یەکان.

سەبارەت بە مەیلە رەگەزپەرستیە فارسیەکانیان([5]) وادیارە بەتەواوەتی روون

---

[1] دەربارەی سارد بوونەوەی پەیوەندی نێوان عەباسیەکان و بەرمەکیەکان بگەرێوە بۆ : الطبري ب ٨ لا ٥٤-٥٦.

[2] الدوري : لا ١٣٠ و ئەوەی دوای.

[3] العمرو : لا ٢٣٦ و ئەوەی دوای.

[4] دەربارەی ئەم پەیوەندیە بگەرێوە بۆ : الجهشياري : ٢٤٣ الطبري : ب ٨ لا ٢٨٩.

[5] العمرو : لا ٢٣٨--٢٤٠.

نیە، بەهۆی کەمی سەرچاوەی مێژوویی لەو بارەیەوە، بەلام هەستیاربوونی هارون رەشید بەرامبەر بە رەفتاری بەرمەکیەکان و هەڵسوکەوت کردنیان بەبێ راوێژ پێکردنی، پرسەکەی لەلا گەورە کرد. بۆیە تەنها تۆمەت کردن لە ئارادا هەبوو تەنانەت لەکارە وردەکانیشدا، بەلام شاراوە نیە کە فارسە رەگەزەکان لە کۆمەلگەی عەباسیدا هەمیشە تۆمەتبار بوون بەهۆی لایەنگریان.

لەرووی پالنەری دارییەوە ([1]) بەرمەکیەکان دارایی دەولەتیان زەوتکرد بوو، هەموو کاروبارەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو، تەنانەت دەڵێن هارون رەشید ((پێویستی بە پارەیەکی کەم بووە کەچی دەستی نەکەوتووە)) ([2])، هاوکات بەرمەکیەکان زیادەڕەویان کردووە لەخەرجکردندا، ئەوەبوو بەزەوتکردنی دارایی، خەلیفەیان کەلەبچە کرد، هەروەکو چۆن لەرەفتاری سیاسیدا، کۆتیان کردبوو.

سەرەڕای ئەوە، قسە هەڵبەستن رۆڵێکی تری گێڕا لەکاریگەری کردن لەسەر (هارون رەشید)دا بۆ ئەوەی بەرمەکیەکان رەش بکەن لەبەرچاوی، هەموو هەڵەکانیان قۆستەوە تا دڵی پڕ قین بکەن و گومانی لا دروست بکەن بەرامبەر هەڵسوکەوتیان([3]).

جا هەرچۆنی بووبێت، هارون رەشید لە شەوی یەکەم لەمانگی سەفەر ساڵی (١٨٧ك/٨٠٣ز) جەعفەری کوشت، یەحیا و ئەبوداوی کوڕەکانیشی خستە زیندانەوە، دەستی بەسەر ماڵ و موڵك وسامانیانیشی گرت، یەحیا لەساڵی (١٩٠ك/٨٠٥ز) کۆچی دوایی کرد و (الفچل)یش لە ساڵی (١٩٣ك/٨٠٨).([4])

ئابەم شێوەیە بەرمەکیەکان کۆتاییان هات، ئەمەش هێمای بەریەککەوتنە لەنێو دەسەلاتی وەزیران و نێو دەسەلاتی خەلیفەکان، هەروەها بەلگەیەکە لەسەر لەیەك نەچوونی بەرژەوەندی ئەمان و لایەنگرێتی ئەوان ([5])، پەیوەندی نێوان ئەوان و هارون رەشید بە بەشێك لە پەیوەندیەکانی نێوان عەباسیەکان و فارسەکان دادەنرێ کە تەماحی سیاسی ئاراستەی دەکرد ([6]).

---

[1] الدوري : لا ١٣١– ١٣٣.

[2] الجهشياري : لا٢٤٦. الطبري :ب ٨ لا ٢٨٧-٢٨٨. محمود و الشريف : لا ١٠٩.

[3] هەمان دوو سەرچاوە : لا ٢٤٥–٢٦١.لا ٢٩٤.

[4] الطبري : هەمان سەرچاوە لا ٣٤١. ابن كثير : ب ١٠ لا ٢٠٤–٢٠٥.

[5] الدوري : لا ١٣٦.

[6] العمرو : لا ٢٥٨.

## پەیوەندییە دەرکیەکان لەسەردەمی (هارون رەشید)دا

### پەیوەندی لەگەڵ بێزەنتیەکاندا

ململانێی نێوان موسڵمانان و بێزەنتیەکان لەسەردەمی (رەشید)یشدا هەر بەردەوام بوو، بەڵام جەنگەکانی نێوانیان بەپێی پلانێکی دیاریکراوە بەڕێوە نەدەچوو، بەڵکو بریتی بوو لەپەلاماردانی یەکتری بێ ئەوەی ئەوە لەباروذۆخی هەر دوو لایان بگۆڕێ. خەلیفەش تەنها سەرانەی وەرئەگرت. بەڵام شەڕو پێکدادانەکان، سەرکەوتنی سەربازی موسڵمانەکان و کورت بینینیان لە نەقۆستنەوەی ئەو باروذۆخە تەنگاوەی دەرخست کە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی پێدا تێپەڕ دەبوو؛ بۆ ئەوەی لە ناوچە رزگار کراوەکاندا پێیان جێگیر بێ و تێدا بسرەوێنەوە، هەرچەندە جوانیەکی تایبەتی بە سەردەمەکەی بەخشی ([1]).

هارون رەشید هەر کە پۆستی خیلافەتی گرتە دەست، بایەخی خۆی ئاراستەی قایم کردنی ئەو ناوچە سنوورییانە کرد کە نزیکی وڵاتی بێزەنتیەکان بوو و بەهێزکردنی سوپای عەباسی لەناویدا. هەوڵیشیدا لە نێوان دوو سیاسەتی هاوسەرنگدا کۆبکاتەوە، هێرش بردن و بەرگری کردن. ئەو سەرەڕای هێرشکردنە سەرناوچەکانی بێزەنتی، سوور بوو لەسەر پاڵپشتی کردن و قایم کردنی بەرگری لەناوچەکانی ئیسلامدا کەوا بەر پەلاماری بێزەنتیەکان دەکەوت. بۆیە ناوچە گەلێکی لەسەر سنوورەکان دروست کرد لەناو یەکەیەکی ئیداری ئازاد لەبەڕێوەبردنی کاروباری خۆیداو جیاکردنەوەی ئەو ناوچانە لەناوچە سنووریەکانی جەزیرە و شام ([2]).دوو سیستەمی بۆ ناوچەکانی سەر سنوری دانا:

یەکەم : سیستەمی پێش، کە ناوچە سنوریەکانی جەزیرە و شام دەگرێتەوە، کەوا بۆ روبەروبوونەوەی رێڕەوەکانی شاخ تایبەت کرا. بۆیە بەقەڵا قایمی کرد و پڕی کرد لەبەرگریکار.

---

[1] الدوري :لا ۱۱۳.

[2] عبدالله : ۲٤۰-۲٤۱.

دووهەم: سیستەمی پاش، کە هەرێمەکانی دواوە وقـەڵاکانی باشـوور دەگرێتـەوە و ناوی (العواصم – پارێزگاکان)ی لێنا.([1])، لە (إنطاکیة) درێژبۆتەوە تاوەکو فـوڕات ([2]). جا (منبج) پایتەختی پارێزگاکان بوو، دواتریش (إنطاکیة) بووە پایتەخت، ( هـارون) و (قاسم)ی کوڕی کرد بە میر لەسەری ([3]). سـەبارەت بـە ئـەرکی ئـەم پارێزگایانـە ئـەوا پاڵپشتی کردنـی ناوچـەکانی سـەر سنوور بـوو لەگـەڵ پێدانی کـەرەسـتەی جـەنگ و شەڕکەر و خواردن و ئازوخـە، لـەبـەر ئـەوەش ئامـادەی کـرد بـە قـەڵغانی بـەردەوام و ئازوخە و کەرەستەی پێویست بۆ بەرگری و پاڵپشتی کردن.

لەلایـەنی خۆیانـەوە بێزەنتیـەکانیش هێڵێکـی بـەرگـری کردنیـان دروسـتکرد بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی ناوچـە سـەر سـنوریەکانی ئیـسلام و خـستیانە ژێـر سەرپەرشـتی سەرکردە سەربازییە گەورەکان، جا هـەردوو زەنجیرە چیای تـۆروس دەگرێتـەوە کـە لەفوراتەوە تا کیلیکیا درێژبۆتەوە و دەبێتە دوو بەشەوە:

یەکەم: لە(ملطیة) درێژبۆتەوە تاوەکو (عین زربە)، ئەمەش بۆ بەرەنگاربوونـەوەی جموجوڵی موسڵمانەکان تایبەتکرا لەلای باکووری عێراقەوە.

دووهەم: بۆ بەرەنگاربوونەوەی جموجوڵی.موسڵمانەکان تایبەتکرا لە وڵاتـی شـامدا ([4]).

ئەمەو ئەو ناوچـە سـنوورییانەی کـە لـەکـاتی جـەنگی هـەردوولادا دەبـەزێنـرا، ئـەم قەڵایانـەی لـەخۆ دەگـرت: ئەدنـە و (المصیـصە) و مـرعش و هارونیـە و (الحـدث) و (الملگیە) و (گرسوس).

لەپاش تەواوبوون لەقایم کاری و پاڵپشتی کردن، پێکدادانە سەربازییەکان لـەنێـوان

---

[1] ناوی پارێزگاکانی لێنرا چونکە پارێزگاری لە سنورەکان دەکات لەوەی بکەوێتە چنگی دوژمن. هەروەها هارون رەشید ئامانجی ئەوە بوو لەم ناوەدا لە قەڵاکانی باکوور کە هاو سنوورە لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتی و ناسراوە بە (الثغور) واتە : ناوچەی سەر سنوور، جیابکاتەوە

[2] عبدالله : لا ٢٤٢-٢٤٣.

[3] الطبري : ب ٨ لا ٢٠٢.

[4] Bury, J – B :A Hist of the Latar Roman Empire IIpp ٢٤٤-٢٤٥

❁ الطبري: ب ٨ لا ٢٠٢

❁ الطبري: ب٨ لا ٢٦٨ - ٢٦٩. camp, med. Hist: IV P ٧٠٧

هەردوولا دەستپێکردەوە. بزەوتنەوەی (صوائف – هاوینان)یش چالاك بووەوە. عەباسیەکانیش هەموو هەڵەکانیان قۆستەوە بۆ زیادکردنی فشاری سەربازی. هارون رەشید لە یەکێك لە قۆناغەکانی روبەڕوبونەوە، بارەگاکەی خۆی بۆ (الرقە) گواستەوە، تا لە گۆڕەپانی شەڕ نزیك بێت، هەروەها بەخودی خۆی لە هەندێ شەڕدا بەشداری کرد و قەڵای (صفصاف)ی رزگارکرد لەساڵی (١٨١ك/٧٩٧ن).(❀) وە یەکێ لەتیمەکانی توانی بگاتە ناو ئەنقەرە لەناو قووڵای خاکی بێزەنتی و ناوچەی سەر سنووری (ئۆبسیکۆن)ی داماڵی و گەیشتە (ئەفسوس) لە سەر کەناری دەریای (ئیجە).(❀)

(ئیرین) ئیمپراتۆری کچ، لەبەرامبەر سەرکەوتنی موسڵماناندا دەستەوسان راوەستابوو، بۆیە ئارەزووی کرد ئاشت بێتەوە، لەساڵی (١٨٣ك/٧٩٩ن) هاتەدی و بەوپێیە بڕیار لەسەر ئەمانە درا:

- گۆڕینەوەی دیلەکان.
- دەبێ ئیرین ساڵانە سەرانە بدات ([1]).
- جەنگ ڕاگرتن، بۆ ماوەی چوار ساڵی بەردەوام دەبێت.

جەنگ ڕاگرتنەکە تا ساڵی (١٨٧ك/٣٠٢ن) بەردەوامبوو، تا ئەوکاتەی کە پیلانیان دژی ئیرین گێڕا، ئەوە بوو لەسەر تەختی دەسەڵات لابرا و (نقفور)ی یەکەم دەسەڵاتی گرتە دەست ([2])، کەوا پێی وابوو ئەوەندە بەهێزە دەتوانێ روبەڕوی موسڵمانان بێتەوە، بۆیە رازی نەبوو بەردەوام بێ لە سەرانە دان، کەوا پێشتر ئیرین بەڵێنی دابوو بیدات. جا بەوەش قایل نەبوو، بەڵکو داوای کرد ئەوەی کە (ئیرین)یش داوێتی بگەڕێتەوە بەبیانووی ئەوەی کەوا ئەو کارەی ئەو لە لاوازی ئافرەتاندایە، ئەمەش بووە هۆی تووڕە بوون ورق هەستانی هارون رەشید ([3]).

---

[1] سەرچاوەکان ئەو بڕە سەرانەیانە دیاری نەکردوە کە ئیرین دەیدا: وادیارە یەکسانە بەوەی کە پێشتر بە خەلیفە مەهدی دەیدا کەوا بڕەکەی لە نێوان حەفتا ونەود هەزار دینارە. بگەڕێوە بۆ : عبدالله :لا٢٧٥.

[2] Ostrogorsky: A Hist Of Byٓantine states p ١٥٦

[3] الطبري : ب ٨ لا ٢٠٧-٣١٠.

دەسبەجێ بەرپەرچی ئەم رەفتارە درایەوە، ئەوە بوو خەلیفە لە ساڵی (١٨٧ك/٨٠٣ز) سەرکردایەتی شاڵاوێکی سەربازی کرد و چووە ناو ناوچەی (کبادۆکیا). (نقفور) ئەوەی بەدیکرد کە توانای نیە بەرەنگاری ببێتەوە، بۆیە ناچاربوو لەگەڵیا ئاشتبێتەوە و هەموو ساڵێکیش باجی پێ بدات، لەبەرامبەر کشانەوەی موسڵمانەکان لە ناوچەکەدا، هارون رەشید یش بەوە قایل بوو و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی([1]).

وادیارە (نقفور) جارێکیتر خراپ هەڵوێستی سەربازیی هەڵسەنگاند، ئەوە بوو پەیمانی شکاند و لەساڵی (١٩٠ك/٨٠٧ز) هێرشی کردە سەر (عین زربە) و کەنیسەی رەش و ئەدنە، دەستی بەسەر (طرطوس)یشدا گرت و فشاری خستەسەر (مرعش) و موسڵمانەکان نەیانتوانی بەرەنگاری ببنەوە و لە رووی راوەستن، بەهۆی سەرقاڵبوونی خەلیفە بەدامرکاندنەوەی بزوتنەوە ناحەزەکانی ناوخۆ، سەرەڕای ئەوەی کە نالەباری کەش و هەوا و سەرمایی رێگرێك بوو لە گەڕانەوە بۆ جەنگاندنی. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند ([2]).

چونکە هەر ئەوەندە رەوشی ناوخۆ هێور بووەوە، هارون رەشید بریاریدا بگەڕێتەوە بۆ ناوچە سنوریەکان بۆ ئەوەی تۆڵە لە ئیمپراتۆر بکاتەوە. بۆیە شاڵاوێکی گەورەی لەسەر سنوور بەڕێوەبرد و چووە ناو جەرگەی خاکی بیزەنتیەوە، هرقلەی گرت و (طوانة)شی خستە ژێر رکێفی خۆی، هێزێکی سەربازیشی بۆ ئەنقەرە نارد([3]).

(نقفور) هەستی بەوە کرد کە ناتوانێ بەرەنگاری موسڵمانەکان بێتەوە یاخود فشار لەسەر خاکەکەی کەم بکاتەوە، ترس و تۆقین و دڵتەنگی زاڵ بوو بەسەریا، کەوتە گەڕان بۆ رێگە چارەیەك لەم تەنگەشەدا دەربازی بکات، جا جگە لە ئاشتبوونەوە رێگە چارەیەکی دیکە نەبوو، بۆیە پەیوەندی بە هارون رەشیدی کرد وپێشنیاری

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل ٢٠٨.
[2] البلاذري: ل ٢٣٥.
[3] Theophanes:p ٩٦٩

ئاشتبوونەوەی خستەڕوو بۆی[1].

لەبەر ئەوەی زستان بەڕێوەوە بوو، هارون رازی بوو پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵیا مۆربکات کە ئەم خاڵانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێ :

- دەبێ نقفور پابەند بێ بە پێدانی باج وسەرانە بەبڕی سێ سەد هەزار دینار ساڵانە.
- دەبێ ئەو قەڵایانەی کە موسڵمانەکان روخاندیان نۆژەن نەکاتەوە وەکو : هرقلە و ئەنقەرە و دبسە و (الصفصاف).
- لەلایەنی خۆیەوە، (هارون)یش بەڵێنیدا قەڵاکانی (ذي الكلاع)و (صملە)و (سنان) وێران نەکات.
- ئەو سەربازگانەی کە لە ژێر دەستیەتی بگەڕێنێتەوە بۆ بێزنتیەکان.
- جەنگ ڕاگرتنەکە بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بێت.(❀)

نقفور لە دوای ماوەیەکی کەم تێگەیشت کە جموجوڵی چڕو پڕی ئیسلامی، ناوچەی باشووری ئاسیای بچووکی کردۆتە ناوچەی دەسەڵات بۆ موسڵمانان، هەروەها زاڵن بەسەر ئەو ڕێگایانەی کە بۆ شوێنە گرنگەکانی بێزەنتی دەچن، لەلایەکی دیکەوە هەستی بەسەر شۆڕی کرد کاتێك قایل بوو سەرانە بدات، بۆیە بڕیاریدا پەیمان بشکێنی، ئەو قەڵایانەی نۆژەن کردەوە کە پەیامانامەکە قەدەغەی کرد بوو، (هارون رەشید)یش کە بەوەی زانی، ئۆپراسیۆنی سەربازی دەست پێکردەوە و جارێکیتر سەرکەوت لە گرتنی قەڵای دبسە ([2]) ئەوە بوو رەشید خۆی تەرخانکرد بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە خوراسان سەری هەڵدا، دوای ئەوەش دەرفەتی گونجاوی بۆ نەڕەخسا سەرپەرشتی جموجوڵی جیهادی بکات دژی بێزەنتیەکان، دوا ئۆپراسیۆنی ئەوە بوو، جەنگ ڕاگرێ و دیلەکان ئاڵ و گۆڕ بکات.([3])

جەنگەکانی هارون رەشید لەگەڵ بێزەنتیەکاندا تەنها بە ئاسیای بچووك تایبەت

---

[1] I b id

❀ الطبري: ب٨ ■ ٢٤٠

[2] Thephahes : p ٩٦٩

[3] الطبري: ب٨ لا ٢٤٠.

نەبوو، بەڵکو بۆ دەریای سپی ناوەڕاستیشی گرتەوە، لە هەوڵێکدا بۆ گەڕانەوەی بنکەی موسڵمانان لە دوورگە نزیکەکان لەلایەکەوە، بۆ پاڵپشتی کردنی شالاوە وشکانیەکان لەلایەکی دیکەوە. ئەوە بوو هێزی دەریای ئیسلامی هێرشی کردەسەر هێزی دەریایی بێزەنتی، هەروەها هێرشی کردەسەر دوورگەی قوبرس لە ساڵی (١٩٠ك/٨٠٦ز) لەپاش ئەوەی خەڵکی دوورگەکە پەیماننامەی (بێ لایەنی)یان شکاند کەوا لە ساڵی (٧٩ك) بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی ([1]) نێوان موسڵمانان و بێزەنتیەکان مۆرکرا. هەروەها موسڵمانەکان هێرشیان کردەسەر دوورگەی (کریت)یش ([2])

سەردەمی هارون ڕەشید بەرجەستە بوونێك بوو بۆ ئەو هێزەی کە خیلافەتی عەباسی هەیبوو، وادیارە ئەم خەلیفەیە زانی کە لە ناوبردنی دەوڵەتی بێزەنتی لەبووندا، کارێکە لە سنووری توانای ئەودا نیە، بۆیە تەنها بێزەنتیەکانی بە خۆیانەوە سەرقاڵ کردو لاوازی کردن و بێبەشی کردن لەئەنجامدانی کارێکی سەربازی بەسوود دژ بە موسڵمانەکان ([3]). ئەمەش وایکرد لە نقفور رایگەیەنێ کە ڕۆژی مردنی (سێی مانگی جومادای دووهەم ساڵی ١٩٣ك/بیست و چواری مانگی ئادار ساڵی ٨٠٩ز)، بیێتە جەژنی بێزەنتیەکان.

## پەیوەندی لەگەڵ فەرەنجەکاندا (دانیشتوانی ئۆڕپا)

جیهانی ئیسلامی، لەسەردەمی (هارون ڕەشید)دا، دوو دەوڵەتی ئیسلامی گەورەی بەخۆوە بینی: دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لە ڕۆژهەلات، دەوڵەتی ئەمەوی لە ئەندەلوس. جیهانی مەسیحیش، لەو کاتەدا، دابەش بوو بۆ دوو دەوڵەتی گەورە: دەوڵەتی بێزەنتی لە ڕۆژهەلات و دەوڵەتی فەرەنجەی کارۆلنجی لە ڕۆژئاوا. هەندێ لە مێژوونوسانی ڕۆژئاوا پشتیان بە ناکۆکییە هەرێمیەکان بەستووە وەکو پاساوێك بۆ بەیەك گەیشتنی ئەم لایەنانە لەسەر کۆمەڵێ ئامانجی هاوبەش، بۆیە خیلافەتی

---

[1] عبدالله :لا ٢٩٨پەراوێزی ٣.

[2] هەمان سەرچاوە : لا ٢٠٤.

[3] هەمان سەرچاوە : لا ٣١٠. العسلي، بسام : هارون الرشيد لا ٣٩- ٤٠.

عەباسی لەفەرەنجەکاندا نزیك بووەوە، بێزەنتیە لە ئەمەوییەکاندا لە ئەندەلوس نزیکبووەوە، ئەم نزیك بوونەوەش هۆکار و پاڵنەر و رەنگدانەوەی هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان رۆژئاوادا.

سروشتی پەیوەندییەکان لە نێوان دەوڵەتی فەرەنجەکان و دەوڵەتی ئەمەوی لە ئەندەلوسدا، جیاواز بوو لە سروشتی پەیوەندییەکان لە نێوان دەوڵەتی فەرەنجەکان و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا.

پەیوەندەییەکانی نێوان دەوڵەتی فەرەنجە و ئەمەوی بارگرژی و دوژمنایەتیەکی بە خۆیەوە بینی، چونکە دراوسێ بوون وموسڵمانەکانیش دەیانویست رووبەریان فراون بکەن بەرەو باکوور، ئەمە لەلایەکەوە، هەوڵدانی کارۆلنجیەکان بۆ زاڵ بوون بەسەر ئۆرپادا و بە (ورایە) کردنی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەلایەکی دیکەوە، ئەمەش بووە هۆی پێکدادان لە نێوانیاندا.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان فەرەنجە و عەباسیەکان، ئەوا لەتەماحی کارۆلنجیەکان دوور بوو، ئەمەش دەرفەتێکی گونجاوی بۆ پەیوەندی سیاسی رەخساند لەنێوان هەردوولا ([1])، ئەمەو سەرچاوە رۆژهەڵاتیەکان چ ئیسلامی و چ دیانی باسی ئەم پەیوەندیانەیانە نەکردوە، تەنها سەرچاوە لاتینیەکان ([2]) باسی ئەو پەیوەندیە دەکات کە هارون رەشید بە شارڵمان – شای فەرەنجەکان– دەبەستێتەوە، بەڵام ئەم پەیوەندیە پەشێو و پەنهان دیارە، ئەمەش متمانەی مێژوونوسانی پێ کەم کردۆتەوەوە، لەرەنگە ناودارترین مێژوونوس کە ئەم پەیوەندییەی باس کردبێت خۆی (ئینهارد) بێت، مێژوونوسی شارڵمان و نووسەری ژیاننامەی، هەروەها (سانت جول)ی قەشە.

بەپێی ئەم سەرچاوانە، ئەوا پەیوەندی نێوان ئەم دوو شاهە لەساڵی (١٨١ك/٧٩٧ز) دەستی پێکردوە، کاتێك شارڵمان دوو شاندی بۆ رۆژهەڵات نارد، یەکەمیان بۆ خەلیفە هارون، دووهەمیشیان بۆ (بگریرك – سەرۆك قەشە)ی قودس.

---

[1] الرحيلي، سليمان ضفيدع :العلاقات السياسية بين الدولة العباسية و دولة الفرنجة، لا ٢٢– ٢٣.

[2] الدوري : لا ١١٧.

نێردەی یەکەمیان لە سێ کەس پێکهاتبوو، دووانیان لەفەرەنجەکانن و سێهەمیشیان جولەکەیەکە ناوی (ئیسحاق)ە، کەوا کاری وەرگێڕانی دەکرد ([1])، بەلام ئەم سەرچاوانە شوێنی چاوپێکەوتنی هارون بەدوو نێردراوەکەی (شارلمان)ی باس نەکردوە.

وادیارە ئەندامانی نێردەکە، بەهێزکردنی هاریکاری لەنێوان هەردوو دەوڵەتیان تاوتوێ کردوە، هەروەها داوایان کرد لە هارون ئاسانکاری بکات بۆ حاجیانی (کاپولیك) کە بۆ شوێنە پیرۆزەکان دێن و بیانپارێزی لە (أرپوژکس)ەکان. (ئینهارد) باس دەکات کە ئامانجی ئەم رەوانەکردنە دەستکەوتنی فیل بووە لەخەلیفە ([2]).

ماوەی گەشتی نێردەکە سێ ساڵی خایاند، لەم ماوەیەدا دوو فەرەنجەکە مردن و ئیسحاق بە تەنیا لەگەڵ فیلێکدا هاتووە، کە دیاری هارون بوو بۆ شارڵمان ([3]). لەساڵی (١٨٣ك/٧٩٩ز) هارون رەشید نێردەیەکەی بۆ شانشینی فەرەنجی نارد، کە لە دوو ئەندام پێکهاتبوو، یەکەمیان فارسێك بوو نوێنەرایەتی خەلیفەی دەکرد، ئەوەی تریشیان مەغربیەك بوو نوێنەرایەتی ئیبراهیمی کوڕی ئەلئەغلەبی دەکرد. جا گەیشتنی ئەم نێردەیە بۆ (ئاخن) پایتەختی کارۆلنجیەکان هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی ئیسحاق، وادیارە ئەم نێردەیەی خەلیفەی وەلامدانەوەیەك بوو بۆ یەکەم نێردەی شارڵمان بۆی ([4]) پاشان شارڵمان هەستا بە ناردنی نێردەی دووهەم بۆ هارون رەشید لەساڵی (١٨٦ ك / ٨٠٢ ز)، هارون–یش لەساڵی (١٩٢ك/ ٨٠٧ز) نێردەی دووهەمی بۆ نارد. ([5]).

ئەوە بوو لەکاتی بوونی نێردراوانی رۆژئاوا لە رۆژهەلاتدا، نزیکبوونەوەیەکی دۆستانە لە نێوان (بگریرك)ی قودس و شارڵمان روویدا، هەردوولا نێردە و دیارییان

---

[1] Runcimah,s : charlwmagneand Palestine.Ip ٦٠٧

[2] Einhard: The Life of charelemagne,p ٤٢

[3] Runciman :op.cit. p. ٦٠٧. Joranson, E: The Alleged Frankish Protectorate Palestine, p ٢٤٤(٢)in

[4] Palestine,p ٢٤٤

[5] الرحيلي : ل ٢٤.

ئاڵوگۆڕکرد. (بگریرك) هەستا بە ناردنی کلیلەکانی کەنیسەی قیامە و کلیلەکانی شاری قودس و ئاڵایەك بۆ شای فەرەنجی (١).سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە نەکردوە کە (بطریرك) هیچ داخوازییەکی بە شارلمان پێشکەش کردبێت (٢).

سەبارەت بەو پاڵنەرانەی کە بوونە هۆی پەیوەندی کردن لە نێوان هەردوولا، ئەوا بریتین لە:

## پاڵنەرەکانی هارون رەشید:

– دوژمنایەتی دێرینی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان وای لەخەلیفەی عەباسی کرد دەسەڵاتی مەعنەوی لەناو گاورەکانی رۆژهەڵاتدا لە ناوبەریێ، ئەمەش لە رێگەی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ رۆژئاوادا.

– دژایەتی کردنی خەلیفەی عەباسی بۆ ئەمەویەکان لە ئەندەلوسدا و ئارەزووکردنی گەڕانەوەی وڵاتی ناوبراو بۆ ئامێزی دەوڵەتی عەباسی.

## پاڵنەرەکانی شارلمان

– حەزی شای فەرەنجی لە زاڵبوون بەسەر ئۆرپادا، بە ئەندەلوس-یشەوە، بە مەبەستی ئەوەی تاجی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بۆ بمێنێتەوە، پێویستبوونی بە پشتگیری مەعنەویی خەلیفە تا دووچاری بەرهەڵستی عەرەبەکان نەبێتەوە لە ئەندەلوسدا، هەروەها لەهەڵمەت بردنی بۆ ئەم وڵاتە لەساڵی (١٦٢ك/٧٧٨ز) کەوا بە شکست خواردن کۆتایی هات، روبەڕوی ئەمانە بووەوە:

– ناکۆکی لە نێوان خۆی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی دەربارەی (بۆماوەیی) تاجی دەوڵەتی رۆمانی.

– ئارەزووی کرد ئاسانکاری بکریێ بۆ هاوڵاتیەکانی ئەوانەی کە حەزیان لێیەتی برۆن بۆ شوێنە پیرۆزەکان حەج بکەن، دەسەڵاتی مەعنەوی لەو شوێنانە پەیدا بکات.

---

١ Runciman :op.cit. p ٦١١. هەمان سەرچاوە : ل ٧٣

٢ Ibid:p ٦١٠: Joranson:pp٢٤٥-٢٤٦

- دوژمنایەتی لە نێوان پاپا، هاوپەیمانی شارلمان، لەنێوان (بگریرک)ی (قسگنگینیە) و رکابەرێتیان لەسەر سەروەرێتی رۆحی لەجیهانی مەسیحیدا ([1])، بەلام چەشنی ئەم پەیوەندییە و پالنەرە شاردراوەکانی، مشتومڕێکی بێ ئەنجامی لەنێوان مێژوونوسان وروژاند.

هەندێکیان هەبوونی ئەم پەیوەندیەیانەی رەتکردەوە، بۆیە نکۆلیشی لەهەبوونی هەر پەیوەندییەکی سیاسی لە نێوان هەردوو دەولەتی عەباسی و کارۆلنجی، کرد، پەیوەندی بازرگانیش لەنێوان چەند تاکێك لەهاولاتیانی هەردوو دەولەتەکە، تێپەڕی نەکرد، ئەمە جگە لەوەی کە لە نێوان خەلیفە و شاهەکاندا، هەر نەبوو.

گروپێکی دیکە لە مێژوونوسان هۆی ئەو نێردانەیانە بۆ پالنەری ئاینی گەڕانەوە، ئەوەش لە گۆشە نیگای ئەوەی (ئازادی)

ئەوە بوو شارلمان بەلێنێکی لە هارون وەرگرت بۆ بەدیهێنانی ئەمە.

گروپی سێهەم لە مێژوونوسان وادەبێنن کە ئەم نێردانە رووکارێکی سیاسی بوو، مەبەستی یەکخستنی دیدەی سیاسی بوو لەنێوان هەردوو دەولەتدا، بەپێی ئەوەی کە لە زۆر دیاردەی سیاسیی دەولەت لەو کاتەدا، هاوبەش بوون.

گروپی چوارەم لە مێژوونوسان، وادەبینن کە ئەو نێردانە، هەولدانێك بوو بۆ بەستنی هاوپەیمانێتی لە نێوان دوو دەولەتدا، بەمەبستی راوەستانی هارون دژ بەدەولەتی بێزەنتی، راوەستانی شارلمان دژ بەدەولەتی ئەمەوی لە ئەندەلوسدا، بەحوکمی ئەو دوژمنایەتیەی کە لە نێوان عەباسیەکان و ئەمەویەکاندا هەبوو، هەروەها لە نێوان فەرەنجەکان و بێزەنتیەکانیشدا.([2])

بەلام راستیە مێژووییەکان هەر ئەگەرێك بۆ بەستنی ئەم هاوپەیمانێتیە سیاسیە لە نێوان هەردوو شادا رەت دەکاتەوە، بە بەلگەی:

---

[1] بگەڕێوە بۆ : الدوري : لا ١١٨.

دیفز: شارلمان. ئەم مێژوونوسە باس دەکات کە شارل هیچ پالنەرێکی شاراوەی نەبووە بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەل هاروندا، بەتەما نەبووە سوود لەم پەیوەندییە وەرگرێ و پیلان بگێرێ؛ بەلکو ئەو رێزی هەبووە سوارچاکی ▪ نەبەردی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی کەوا لە زۆر رووەوە لەگەل ئیمپراتۆریەکەی خۆیدا لەیەك دەچوون. لا ٢٠٢.

[2] سەبارەت بە ئامانجی نێردەکان لە نێو هەردوو شادا بگەڕێوە بۆ :الرحیلی: لا ٣٧-٤٠.

١- مێـژووی ئـەم نێردانـە، وەکـو لـە سەرچـاوەکانـدا هـاتووە، هاوکاتـە لەگـەڵ پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان (ئێرین) ئیمپراتـۆری بێـزەنتی، لـەلایەکـەوە، شـارڵمان لەلایەکی دیکەوە، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی دوو دەوڵەتەکەیان لەسەر ناوچـەی ئەستریا و دڵماسیا بەشێوەیەکی ئاشتیانە، ئـەم پەیوەندییـە باشـەش بـە شـێوەیەکی گشتی هەر بەردەوام بوو لەنێوان شارڵمان و ئەوانەی جێی ئێرین-یان گرتەوە، نقفور و میخائیلی یەکەم ([1]).

٢- هارون رەشید لە ململانێی لەگەڵ بێزەنتیەکاندا پێویستی بـە پاڵپـشتی رۆژئـاوا نەبوو، چونگە ئەو سەرکەوتوو بـوو بـەسەریاندا لـەرووی بازییـەوە، بـۆ ئـەوەی زیـاتر سەرکەوتنی خۆی بسەلمێنێ سەرانەی سەپاند بە سەریاندا، لەبەر ئـەوەش پەیوەنـدی عەباسـی – بێـزەنتی هـیچ پێویـستی نـەدەکرد لـە عەباسـیەکان –لـەبـەر دوژمنایـەتی هاوبەشیان بۆ بێزەنتیەکان- پەیوەندی بەفەرەنجەکانەوە بکەن ([2])

٣- هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە کـە گاورەکـانی رۆژهـەلات مەترسـیان هـەبووبێت لەسەر ئـەمن و ئاسایـشی دەوڵـەتی ئیـسلامی لـەسـەردەمی هـارون رەشـیددا، یـاخود بارودۆخیان خراپ بووبێت لـەسـایەی دەسـەلاتی عەباسـیدا. خەلیفـە عەباسـیەکان لـە سەردەمی عەباسی یەکەمدا، بەپێی بنەماکانی شەریعەتی ئیـسلامی مامەڵـەیان لەگـەڵ گاورەکـان کـردوە، ئەوانـەی کـە هـاوڵاتی دەوڵـەتی خۆیـان بـوون، بـەڵکو هەنـدێکیان گەیشتە پلـەیـەکی بـەرز لـە نـاو کۆشـکی خیلافەتـدا، هەندێکیان پۆسـتی ئیداریـشی گرتەدەست لە ئیدارەی عەباسیدا وەکو جرجیسی کوڕی جبرائیل و بختیـشوعی کـوڕی کەوا پزیشك بوو([3]).

٤- ناکرێ هارون دەستبەرداری مافە سیاسیەکانی خۆی بێ لـە شـوێنە پیرۆزەکـانی فەلەستیندا بۆ ئەوەی شاهی فەرەنجی بیگرێتە دەست، هەروەها بارودۆخی گاورەکـان لەفەلەستیندا پێویستی بەوە نەدەکرد (بطریرك) داوای پاسەوانیان بۆ بکات لـە شـاهی

---

[1] دیفز : لا ١٨٦.عاقل، نبیه: الامبراطوریة البیزنطیة: [illegible] ١٨٤.حاطوم، نورالدین :تاریخ العصرالوسیط، ب ١ لا ١٧٨

[2] الرحیلي: لا ٤٠

[3] ابن ابي اصیبعة:طبقات الاطباء، [illegible] ١٨٣-١٨٦. الرحیلي :لا٦٩.

فەرەنجی. سەرچاوە فەرەنجیەکانیش، ئامانجی ئەو نێردانەی نێوان شاهی فەرەنجەو (بطریرک)ی قودس، روون نەکردۆتەوە، ئاماژەیەکی پەنهان هەیە بۆ خاوەنداریتی شوێنە پیرۆزەکە ([1]).

٥ – بیرۆکەی پارێزگاری کردنی شارلمان لە شوێنە پیرۆزەکان، ئەفسانەیەکە، مێژوونوسی قەشە (سانت جول) دایهێناوە، کەوا لەپاش مردنی شارلمان بۆ ماوەی پەنجا سالّ دەینوسی. ئەم قەشەیە هەستا بەکۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی نێردەکان و دیارییە ئالوگۆڕکراوەکانی هەردوولا بۆ ئەوەی چیرۆکێك دانێ ناوەڕۆکەکەی ئەوە بێ کە هارون رەشید دەستبەرداری فەلەستین بووە بۆ شارلمان و داهاتەکانیشی بۆ ناردووە ([2])، لە هەولێکدا بۆ گەڕانەوەی دەسەلاتی گاورەکان بۆ سەر شوێنە پیرۆزەکاندا.

٦– پێشکەشکردنی کلیلەکانی کەنیسەی قیامە و قودس، سەرەڕای ئاڵاکە لەلایەن (بطریرك) ی قودس بۆ شارلمان، ناکرێ واتایەکی سیاسی ببەخشێ، چونکە ریوایەتگێڕەکان ئەوەندە بایەخیان پێ نەداوە و کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەمە تەنها بۆ دوعاو نزاو پیرۆزی بووە، جێی باسکردنە کە (بطریرك)ی قودس ناتوانێ هیچ هەنگاوێکی گرنگ بنێ کە رەهەندی سیاسی هەبێ بە بێ رەزامەندی خەلیفە، چونکە قودس لەسنووری دەسەلاتی دەولەتەکەیەتی ([3]).

٧– هیچ شتێکی وەها نیە متمانە لە نێوان هەر دوو شادا پەیدا بکات. زۆر دوورە هارون رەشید لە گەل شارلمان رێکبکەوێ لەسەر لێدانی موسلمانەکانی ئەندەلوس، بەتایبەت ئەو وازی هێنا لەبیرۆکەی گەڕانەوەی ئەم ولاتە لە کاتێکدا کەئەو ناچار بوو دەست لە ئەفریقیا هەلگرێ ([4]).

---

[1] سەبارەت بە ئامانجی نێردەکانی نێوان شارلمان و (بطریرك)ی قودس و بۆچوونی لێکۆلەران دەربارەی، بگەڕێوە بۆ : الرحيلي : هەمان سەرچاوە. لا ٧٦-٨٦

[2] Runciman :op.cip cit.,p ٦٢٩

[3] Jorahsom;p ٢٤٨ (١) الدوري: لا ١١٩. الرحيلي :لا ٨٢

[4] Buckier; pp٢٢-٢٥. (٢) مؤنس : ب ١ لا ١٨٣.عبدالله : لا ٣١٢

٨- سەرچـاوە ڕۆژهەلاتیـەکان چ ئیـسلامی و چ مەسـیحی ئامـاژەی بـەو نێردانـە نەکردوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بەو نێردانەی کردوە کە لە نێـوان هـارون ڕەشـید و پاشای (هند)دا ئاڵوگۆڕکراوە([1]).

لەوانەیە هەبوونی جۆرێك لەپەیوەندی بازرگانی و سیاسی هـەبووبێت کـە شـێوەی هاوپەیمانێتی سیاسی لەخۆ نەگرتبێت، بازرگانانی جوولەکە بەرپرس بووبێتن لێی کەوا ئەڵقەی گەیشتن بوون لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، کەوا لەنێـوان فـەرەنـسا و وڵاتـە ئیسلامیەکان و چیندا بازرگانیان دەکرد، بە تایبـەت شـێوازی بازرگانـەکانی ئـەو کاتـە وابوو ناوی نێردراویان لەخۆیان دەنا بۆ ئاسانکردنی بەرژەوەندییەکان ([2]).

## جێنشینێتی – مەرگی هارون ڕەشید

لەساڵی(١٧٥ ك/٧٩١ ز) هارون، (موحەممـەد لئـەمین)ی کـوڕی کـرد بـە جێنـشینی خۆی، هەرچەندە تەمەنیشی لەپێنج ساڵ تێپـەڕی نـەکردبوو، بـەڵام بـە باشـتری زانـی لەبرا گەورەکـەی (عەبـدوڵلا لمـەئمون)، ئـەوەش بـەکاریگـەی زوبـەیدەی هاوسـەری و خاڵەکانی لەبنەماڵەی هاشم و (الفضل)ی کوڕی یەحیا، بەڵام هەندێ لـەبنـەماڵی هاشـم بەهۆی بچووکی تەمەنیەوە ڕازی نەبوون بەیعەتی پێ بدەن ([3]).

لەساڵی (١٨٢ ك/٧٩٩ز) هارون، بەیعەتی بۆ (عەبدوڵلا لمـەئمون)ی پەسـەندکردنی بـە جێنـشین لـەدوای ئـەمین، وەکـردی بـەفـەرمانڕەوای خۆراسـان و ئـەوەی سـەر بـە خۆراسان بـوو، لـە هەمـەدان-ەوە تـاوەکو کۆتـایی ڕۆژهـەلات، ئەمـەش بـەکاریگـەری جەعفەری کوڕی یەحیا بوو ([4]).

لەساڵی (١٨٦ك/٨٠٢ز) هارون بەیعەتی بۆ قاسمی کوڕی سـەند لـەدوای مـەئمون و نازناوی (موئتەمەن)ی پێداو کردی بەفەرمانڕەوای جەزیـرە و ناوچـەکانی سەرسـنور و

---

[1] ابن عبد ربه : العقد الفريد، ب ٢ ل ٢٠٣- ٢٠٤.

[2] الدوري :ل ١٢١.

[3] الطبري: ب٨ ل ٢٤٠ - ٢٤١

[4] ابن اعثم: ب ٤ ل ٤٢٢. الطبري: هەمان سەرچاوە : ل ٢٦٩ - ٢٧٥.

پارێزگاکان، ئەوەش بەکاریگەری عەبدولمەلیکی کوڕی سالح -پەروەر دیاری قاسم.([1]).

ئابەم شێوەیە، هارون کەوتەناو هەڵەی پێشینەکانی، بەهۆی ترسی لەسەر دەسەڵاتدا لەپاش خۆی. ئەم دامەزراندنە بۆ جێنشینەکانی و بەش بەش کردنی دەوڵەت لە نێوانیاندا، مەترسیەك بوو هەڕەشەی لەدەوڵەت دەکرد بە شەڕی ناوخۆ. ئەوە بوو رکابەرێتی نێوان هەردوو برا گەورە مەئمون و ئەمین، لە ژیانی هاروندا، وای لەخەلیفە کرد لەسەر ئایندەی دەوڵەت لەپاش خۆی بترسێ. بۆیە چەندین دانیشتنی یەك لەدوای یەکی سازکرد بۆتاوتوێ کردنی ئەم بابەتە لە گەڵ وەزیرو یاریدەرەکانی، رێکەوتن لەسەر ئەوەی پەیمان لەم دوو میرە بسێنن لە (کەعبە – ماڵی خوا) کە شەڕو ئاژاوە نەگێڕنەوە دژ بەیەکتر.

لەساڵی (١٨٦ ك/٨٠٢ز) هارون بۆ حەج رۆیشت و هەردوو کوڕەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی کە لەسەری رێککەوتن. ئەوەبوو پەیمانی لێسەندن کە دەست وەرنەدەن لە کاروباری یەکتری و لە کاروباری (موئتەمن)ی برایان.کۆپییەك لەو پەیماننامەیە لەحەوشەی (کەعبە) هەڵواسرا بۆ ئەوەی زیاتر پیرۆزبێت و جێبەجێکردنی دوو پات بکرێتەوە ([2]).

لەساڵی (١٩٢ ك / ٨٠٨ ز) هارون لەبەغدادەوە کەوتەرێ بەرەو خۆراسان بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ شۆڕشی (رافعی کوڕی-لیپ) دانێ، (موحەمەد لئەمین)ی کوڕی خستە شوێنی خۆی لەبەغداد و (عەبدوڵلا لمەئمون)ی کوڕی لەگەڵ خۆیدا برد، هارون بەدەستی نەخۆشیەك لە سکیدا دەیناڵاند و پشتێنێکی ئاورێشمی بەستبوو تا ئێش و ئازارەکەی کەم بکاتەوە. جا کاتێك گەیشتە (گوس) لەمانگی سەفەر، نەخۆشیەکەی ئەوەندە زیادی کرد لە سەری نەیدەتوانی هەستێ. شەوی شەممە کە سێ رۆژی مابوو بە (مانگی -جمادی الاخرە- ١٩٢ ك/مانگی ئادار ساڵی٨٠٩ ز) کۆچی دوایی کرد ([3]).

---

[1] الطبري : هەمان سەرچاوە : لا ٤٧٦

[2] الطبري :ب٨ لا ٢٧٧ – ٢٨٦ وە طبري.دەقی پەیماننامە کانیش دەنووسیت. ابن اعثم: ب ٤ لا ٤٢٢- ٤٢٣.

[3] الطبري : هەمان سەرچاوە : لا ٢٤٢ – ٢٤٦.

## بەندی پێنجەم

## موحەمەدی ئەمین – عەبدوڵڵای مەئمون

### ئەبوموسای موحەمەدی ئەمین ١٩٣-١٩٨ ك / ٨٠٩-٨١٣ ز

### ناساندنی ئەمین

موحەمەدی ئەمین، کوڕی هارون ڕەشیدی کوڕی موحەمەدی مەهدی کوڕی مەنسور، ئەبو موسای هاشمی عەباسی، دایکیشی (دایکی جەعفەر)، ناوی زوبەیدەی کچی جەعفەری کچی ئەبو جەعفەری مەنسورە. ئەمین، لەڕەسافە لەساڵی (١٧٠ك/٧٨٦ز) لە دایکبووە و لە پاش مردنی هارونی باوکی بەیعەتی پێدرا بۆ خەلافەت. بە ڕەوشت جوانی ناسراو بوو، لەشیعردا شارەزابوو، زمانپاراو، بەڵام گەمەو گاڵتە و ئارەزووبازی و لاوازی کەسایەتی زاڵ بوو بەسەریا. لەسەر دەستی (کیسائی) پەروەردە بوو و قورئانیشی خوێندوە لەلای ([1]). ناسراو بوو بە خۆشویستنی هاوڕێکانی و سۆزنواندن لەگەڵیاندا، بەڵام وەکو سەرکردە و فەرمانڕەوایەك شکستی هێنا.

### هۆکارەکانی ململانێی نێوان ئەمین و مەئمون

ڕەگ وریشەی ململانێی نێوان ئەم دووبرایە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆ کار، بریتین لە: کێشەی جێنیشینێتی – ململانێی ڕەگەزپەرستی عەرەبی فارسی – تەماحی دارودەستە.

### أ- کێشەی جێنشینێتی

ئەم کێشەیە بە بەهێزترین هۆکار دادەنرێ، چونکە هەوڵدانە بۆ دەسەڵات گرتن، هەروەها ئەو هۆکارە دەروونییانەی کەوا لەلای ئەمین پەیدا بوو بەرامبەر بە دووبراکەی، ئەوەبوو دەستپێشخەری کرد لە سەرپێچی کردنی بنەماکانی

---

[1] ابن كثير : ب ١٠ لا ٢٢٢ – ٢٤١.

پەیماننامەکە، چەند هەنگاوێکی نا بووە هۆی تەقینەوەی ڕووداوەکە، لەو هەنگاوانەش:

– هەر لەسەرەتاوە هەوڵی ئەوەیدا دەسەڵاتی بسپێنێ بەسەر ویلایەتەکانی هەردوو براکەیدا پاشان پێشخستنی موسای کوڕی لەبەیعەتدا.

– ئەو کاتەی کە باوکی پەیمانی لەخۆی و مەئمونی برای سەندو لە حەوشەی کەعبە پەیماننامەکەی هەڵواسی، نیازی ئەمین غەدرکردن بوو. چونکە کاتێك جەعفەری بەرمەکی داوای لێکرد سوێند بخوا پەیمانەکە نەشکێنێ بەدەنگیەوەچوو و وتی: ((خوا سەرشۆرم بکات ئەگەر هاتوو شکاندم)) سێ جاریش دووبارەی کردەوە. جا کاتێك دەرچوو بە (فضل–ی کوڕی رەبیعی) وت : ((ئەی ئەبو لعەباس، کە سوێندم دەخوارد نیازی غەدرکردنم هەبوو)).([1])

– لێدوانەکانی ئەمین، کاتێك بڕیاریدا مەئمون لابەرێ و بەیعەت بە موسای کوڕی بدات، بە یەحیای کوڕی سەلیم –کەوا لەم کارەدا راوێژی پێکردو هەوڵی دا لە بڕیارەکەی پەشیمانی بکاتەوە– وتی: ((بۆچوونی هارون هەڵەیەك بوو، جەعفەری کوڕی یەحیا کاری تێکرد و سەری لێ تێکدا و بە نەرمونیانی خۆی رازی کرد. جا نەمامێکی نەویسترای بۆ چاندین سوودی لێ نابینین بە بڕینی نەبێ، کارەکانمان باش نابێ بە هەڵکەندنی نەبێ)).([2]) ڕۆژێکیان بە (الفضل)ی کوڕی رەبیعی وت: ((هاوار لەتۆ ئەی (فچل)، ژیان لەگەڵ مانەوەی عەبدوڵلا و بەرهەڵستی کردنی بۆ ئێمە نیە، دەبێ لابردرێ......))([3])، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە نیازی غەدرکردن لەلای ئەمین هەبووە و هەر لە ساتی یەکەمەوە کەوا هارونی باوکی مەئمونی برای کرد بە جێنشین لەدوای خۆی. ئەم کێشەیە بوو، ململانێی نێوان هەردوو برای تەقاندەوە، ئەوان لە ژیانی باوکیاندا نێوانیان باش نەبوو جا کە مرد هیچ کامەیان ئەوەی تری نەدەویست.

---

[1] الجهشياري: لا ٢٢٢.

[2] الطبري :ب ٨ لا ٢٨٤– ٢٨٥.(جهشياري) وا باسی دەکات کە ئەوەی ئەمین راوێژی پێکردوە، یەحیای کوڕی سولەیمان بووە. لا ٢٩٢.

[3] الطبري :هەمان سەرچاوە : لا ٢٩٩.

سەبارەت بە مەئمون، ئەوا لە خۆراساندا خۆی گیردابوو و جێی نەدەهێشت، سەبارەت بە ئەمین–یش ئەوا لەئاکامی ئەم گۆشەگیریە دەترسا، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو کە هەردو ویرا گومان لەیەکتری بکەن ([1])

ب – ململانێی رەگەزپەرستی عەرەب و فارس

ئەو رۆڵە سیاسیەی کە هەریەك لەم دوو کەسە دەیانگێرا، (الفضل)ی کوڕی سەهل نوسەری مەئمون و کارسازی، کەوا رەگەزپەرستی فارسیی لەئیدارەی عەباسیدا دەنواند، (الفضل)ی کوڕی رەبیع کە حەز وئاواتەکانی عەرەبی دەنواند، لەماوەی پێش مردنی هارون بەشێوەیەکی سنودار دەرکەوت، ئەوە بوو (الفضل)ی یەکەمیان بەگوڕو تینێکی رەگەزپەرستانەوە و لەترسی مردنی هاروندا پاش قورس بوونی نەخۆشیەکەی، کەوتە هەوڵ و تەقەلا بۆ مسۆگەر کردنی مافی مەئمون لە خیلافەتدا و پاراستنی لە زۆر و ستەمی ئەمین–ی برای و داردەستەکەی. رەنگە یەکەم هەنگاوی بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانی ئەوە بوو قەناعەتی بە مەئمون کرد لەگەڵ باوکی بۆ خۆراسان بڕوات تا لایەنگر بۆ خۆی پەیدا بکات و لە دەستدرێژی ئەمین و گروهـپ و تاقمەکەی دوور بکەوێتەوە.

لەپاش مردنی هارون رازو نیازی هەردوولا ئاشکرا بوو، لەیەك نەچوونی تیڕوانینە سیاسیەکانیان بە روونی دەرکەوت.

هارون کاتێك نەخۆشیەکەی قورسی کرد لەسەری، بەیعەتی بۆ مەئمون نوێ کردوە لەپاش ئەمین. جا ئەمین کەزانی نەخۆشیەکە قورسی کردووە لەسەر باوکی، (بەکری کوڕی ئەلموعتەمیری) لەگەڵ نوسراوێکدا بۆ خۆراسان نارد، رووکەشەکەی هەواڵپرسینی باوکی بوو و ناوەرۆکەکەی فەرمانکردن بوو بە خەڵکی کە بەکەرەستەی جەنگەوە بگەرێنەوە بۆ بەغداد ([2]).

(الفچل)ی کوڕی رەبیع–یش کە بەرپرسی مووچەدان و خەرجکردنی پارە و

---

[1] محمود و الشریف : ل ١١٢.

[2] الطبري : ب ٨ ل ٣٦٨-٣٦٩.

ڕێکخستنی کاروباری هارون، بوو، دوو دڵی نەکرد لەهێنانەوەی سەربازەکان بەکەرەستەی جەنگەوە لەپاش مردنی، هەر لای ئەدا لەلای مەئمون و ئاوڕیشی بۆ نەدایەوە، هەرچەندە مەئمون داوای لە خۆی و هاوەڵەکانی کرد نەڕۆن و بیری خستنەوە بەو پەیمان و بەڵێنانەی کە هارون لێی سەندن. ئەمەش مەئمونی زۆر دڵتەنگ کرد و ئازاری پێگەیاند و هەستی بە بەدنیازی ئەمین–ی برای کرد لەبەرامبەری([1]).

لەراستیدا ئەو سەرکەوتنەی کە ڕەگەزی عەرەبی بەدەستی هێنا لە زاڵبوون بەسەر بەرمەکێکاندا و هەوڵی بەردەوامی بۆ مسۆگەرکردنی دەسەلات و دەستڕۆیشتنی زیاتر، لەوانەیە ئەگەر لەسایە خەلیفەیەکی وەکو ئەمین نەبێ نەهاتبایەتەدی، ئەمەش بوو وای لە(الفچل)ی کوڕی ڕەبیع کرد هەموو قورسایەتی خۆی بخاتە سەری وەکو هەلێك بۆ چوونە ناو ململانێیەکی دیکە.

سەبارەت بە (کوڕی سەهل) ئەوا داخوازیەکەی ئەمین–ی ڕەتکردەوە و کارەکەی بۆ مەئەون ئاسانکرد و پێی وت: ((بەرەنگاری خاڵەکانت ببەوە و بەیعەتت لە ئەستۆیانە و کەمێك خۆڕاگربە من خیلافەتت بۆ مسۆگەر دەکەم)).([2]).

بێ گومان کوڕی سەهل کە مەئمون–ی هان دەدا لە خۆراساندا بمێنێتەوە و پاڵپشتی دەکرد و داوای ئەمین–ی ڕەت کردەوە لە گەڕانەوە بۆ بەغداد، پاڵنەری ڕەگەزپەرستی و کەسی هەبوو ([3])، ئەمەشی بۆ (ئەبو موحەمەدی یەزیدی) ڕوونکردەوە کەوا ئەو خزمەتی دەکات ((بۆ ئەوەی لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا زاڵ بێ، ئاماژەی بە ئەنگوستیلەکەی کردو وتی: ((لەبەر ئەمە خزمەتم کرد و لەبەر ئەمە هاوەڵیم کرد)).([4]).

لەراستیدا کوڕی سەهل کەوا هەوڵی دەدا هاوەڵەکەی بگەیەنێتە پۆستی خیلافەت،

---

[1] هەمان سەرچاوە : ل ٣٧٠–٣٧١. الجهشیاري :ل ٢٧٧ز

[2] الطبري : هەمان سەرچاوە : ل ٣٧٢.

[3] الدوري :ل ١٤٨.

[4] الجهشیاري : ل ٢٨٠.

ئومێدەوار بوو (مرو) بکرێتە پایتەختی ئەم خیلافەتە لەباتی بەغداد، خۆراسانیش شکۆمەندی بۆ بگەڕێتەوە، رۆڵێکی ئاشکرای بینی لە کۆکردنەوەی خەڵکی خۆراسان لە پشت دۆزەکەی، ئەمانیش قایل نەبوون بچنە ژێر سایەی دەوڵەتی عەباسی پاش لێقەومانی بەرمەکیەکان بۆیە بە توندی پشتگیریان لە مەئمون کرد، بووە ئەو پێشەوایەی کە خۆراسانی نوێ پشتیوانی دەکرد ([1]).

ئابەم شێوەیە ململانێکە رەهەندێکی نەتەوە پەرستی لەخۆگرت لەنێوان عەرەب و فارسدا، کەسانێکی دەمارگیر بۆ لایەنێك رووداوەکانیان ئاراستە دەکرد، عەرەب پشتی ئەمینی دەگرت و فارسیش دەستی خوشکەزاکەیان گرت و پشتیان قایم کرد.

ج – تەماحی دارودەستە

دارودەستەی ئەمین، بە تایبەتی (الفضل)ی کوڕی ئەلرەبیع و عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان، بەهێزانە پشتیوانیان لێ دەکرد و هانیان دەدا پەیمانەکە بشکێنێ، ئەگەرچی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن مەیلی هەبووە وەفادار بێ لەگەڵ دووبراکەیدا، هەرچەندە لێدوانەکانی پێشووی پێچەوانەش بوو. (الفضل)ی کوڕی ئەلرەبیع ئامۆژگاری کرد مەئمونی برای بانگهێشت بکات بۆ بەغداد، بۆ ئەوەی وەکو بارمتەیەك لای خۆی داینێ و خۆی و سەربازەکانی لەیەك جیابکاتەوە، وەکو رێخۆشکردنێك بۆ لابردنی و کردنی موسای کوڕی بە جێنشین لەدوای خۆی ([2]) لەلایەنی خۆیەوە، (الفضل)ی کوڕی سەهل پشتی مەئمونی گرت و داوای لێبوردنی کرد لە رۆیشتن بۆ بەغداد بە بیانوی ئەوەی کە بارودۆخی خۆراسان وا دەخوازێ بمێنێ ([3]) ئابەم شێوەیە دەستێوەردانی دارودەستە ململانێکەیان ورووژاند کەوا گەیشتە رادەیەك کە دەبوو بچوونایە بەگژی یەکتر.

---

[1] محمود و الشريف :لا ١١٠.

[2] الطبري : ب ٨ لا ٣٧٤.

[3] الجهشياري :لا ٢٨٩–٢٩٠.

## قۆناغی ململانێی ئەمین و مەئمون

ململانێی نێوان ئەمین و مەئمون بەدوو قۆناغدا تێپەڕ بوو: قۆناغی دانوستانی ئاشتیانە کەوا لەساڵی (١٩٥ك/٨١١ز) کۆتایی هات، قۆناغی یەکلایی کردنەوەی سەربازی کەوا بەکوشتنی ئەمین لەساڵی (١٩٨ك/٨١٣ز) کۆتایی هات ([1]).

## قۆناغی دانوستان

لەسەرەتاوە ململانێکە شێوەی نامە ناردنی وەرگرت لەنێوان هەردوبرا دەربارەی دژی جێنیشینێتی و ئەو دەسەلاتانەی تایبەتن بە خەلیفە ([2])ئەمین شێوازێکی سیاسی هەڵخەڵەتێنەری پەیڕەو کرد بۆ رازی کردنی براکەی و راکێشکردنی داروەستەکەی، نیازیشی ئەوە بوو لە جێنیشینێتی لایبەری، بۆیە دۆستایەتی خۆی بۆ نواند.

مەئمون-یش لەلایەنی خۆیەوە بەشێوەیەك هەڵسو کەوتی کرد براکەی دڵنەوا کردوە، لە نامەکانیدا بەرز رایدەگرت و دیاری زۆر جوانی خۆراسانی بۆ نارد ([3]).

ئەوە بوو ئەمین هەموو دەسەلاتێکی لە مۆێتەمەن-ی برای سەندەوە و هێنای بۆ بەغداد.هاوکات نوسراوێکی بۆ هەموو کاریەدەستەکان نارد کە بانگەشە بۆ موسای کوڕی بکەن ببێ بە جێنشینی لەدوای خۆی ئەوجا بۆ مەئمون و قاسم. مەئمون کاتێك ئەوەی بیست، زانی کە ئەمین بە نیازە پەیمانەکە بشکێنێ، بۆیە نامەو پۆستە ناردنی راگرت و ناویشی لەسەر دراو سڕییەوە([4]).

ئەمین بەردەوام بوو لە دۆستایەتی نواندن بێ ئەوەی رازونیازی خۆی دەرخات، بۆیە نوسراوێکی بۆ مەئمون نارد بانگهێشتی دەکرد بۆ بەغداد کەوا پێویستی بەو هەیە لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا، بەنیازی غەدرکردن.([5]) وا دیارە ئەمین دڵی بۆ

---

[1] الدوري : لا ١٤٨.

[2] الطبري بە وردی باسی کردوە :ب٨ لا ٢٧٤ و ئەوەی دوای.

[3] الطبري: ب٨ لا ٢٧٢.

[4] هەمان سەرچاوە: لا ٢٧٥.

[5] الجهشياري : لا ٢٩١-٢٩٢.

ئەوە شنا بەدەنگی براکەیەوە بچێ و خەریك بوو هەڵخەڵەتێ، ئەگەر (الفضل)ی کوڕی سەهلی وەزیری ئاگاداری نەکردایەتەوە، و ئامۆژگاری کرد داوای لێبوردنی لێ بکات و کاربکات بۆ بەهێزکردنی سوپاکەی و پتەوکردنی بنکەی خۆی لەخۆراسان ([1]).

ئەمین نامێد نەبوو لە هەڵخەڵەتاندنی مەئمونی برای و بڕیاری دا وردە وردە هەر تایبەتمەندییەکی هەیە لێی بیسێنێتەوە، نوسراوێکی بۆ نارد داوای لێکرد دەستهەڵگرێ لە چەند ناوچەیەکی خۆراسان کە خۆی ناویانی برد و لەلایەنی خۆیە کاربەدەستی بۆ بنێری و نیازی هەیە کارمەندێکیش لەسەر پۆستە(برید) دامەزرێنێ بۆ ئەوەی هەواڵی بۆ بنێرێ، چونکە ئەو خەلیفەی موسڵمانانە و بۆی هەیە هەڵسوکەوت بەکاروباری خۆراساندا بکات بەپێی بەرژەوەندی گشتی ([2]).

مەئمون راوێژی بەکەسانی دەوروبەری کرد، هەموویان ئامۆژگاریان کرد بەدەنگی داخوازیەکەی بچێت جگە لە (الفضل)ی کوڕی سەهل کەوا پێشنیارەکەی رەتکردەوە، مەئمون-یش بە گوێی کرد و ئەوەی بۆ براکەی نوسی ([3]).

ئەم وەزیرە فارسە سیاسەتێکی بۆ مەئمون داڕشت لە سەری رێ بکات:

- پەناگرتن بەخۆراسان چونکە خۆراسانیەکان بەیعەتیان بۆی هەڵناوەشێننەوە بە حوکمی خزمایەتیان.
- پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ئاینی سەنگین.
- بایەخدان بە کاروباری دەوڵەت و بەتەنگەوە چوونی سکاڵاکان ([4]).

بۆیە خەڵکی خۆشیان ویست و پشتیان گرت ([5]).

لەئەنجامی ئەم لەیەك دابڕانە، بارودۆخەکە زیاتر گرژبوو لەنێوان هەردوولا و سنورەکان لە نێوانیاندا داخرا، مەئمون-یش هەندێ ئامادەباشی کرد بۆ ئەوەی رێگە لەو پروپاگەندەیە بگرێ کە ئەمین دژی بڵاوی دەکردەوە بەمەبەستی راکێشکردنی

---

[1] الطبري : ب ٨ لا ٣٧٢.

[2] الطبري:ب ٨ لا ٣٧٧.

[3] هەمان سەرچاوە : لا ٣٧٧-٣٧٩.

[4] الجهشياري : لا ٢٧٨-٢٧٩.

[5] هەمان سەرچاوە : لا ٢٧٩.

هەست و سۆزی خۆراسانیەکان بۆ لای خۆی. هەستا بەدانانی پاسەوانیەکی توند بەدرێژایی رێگەی نێوان عێراق و خۆراسان، فەرمانی دا بەدەستگیر کردنی ئەو گومانلێکراوانەی کە لە عێراقەوە دێن ([1]).

نزیکبوو دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی ببێتە دوو بەشەوە، دژ بەیەکتر. بەشی رۆژئاوا کە شاری بەغدادی لێیە و ئەمین سەرکردایەتی و عەرەبەکان پاڵپشتی دەکەن، سەرۆکی هێزەکانیشی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان، سەرکردەیەکی عەرەبە، بەشی رۆژهەڵات واتە خۆراسان و ویلایەتەکانی رۆژهەڵات، مەئمون-یش لەشاری (مرو) نیشتەجێ بووە بە پاڵپشتی فارسەکان، سەرکردەی هێزەکانیشی (تاهیری کوڕی ئەلحوسەین)ە.

رۆژ هات و رۆژ چوو و ململانێکە پەرەی دەسەند، ئەمین-یش نەیتوانی وا لە مەئمون بکات دەستبەرداری مافی خۆی بێ لە جێنیشینێتی بۆ بەرژەوەندی موسای کوڕی ([2]). ئەمەش وای لێکرد لە ساڵی (١٩٥ک/٨١١ز) لایبەری، پەیماننامەکەشی لە حەوشەی کەعبە هێنا و سوتاندی، هەرچەندە هەندێ لە دەوربەرەکەی ئاگاداریان کردەوە لە ئەنجامدانی ئەم کارە.([3])

ئەم هەڵسوکەوتە، خۆراسانیەکان و کۆمەڵی خەڵکی تری لەشارەکاندا تووڕە کرد، بۆیە لەرووی هەستان و ئاشوب و ئاژاوە بەرپابوو و روبەڕوبوونەوەی چەکداری بووە شتێکی گومان لێنەکراو، جا هەردوولایان کەوتنە خۆ ئامادەکردن.

## قۆناغی یەکلایی کردنەوەی سەربازی

ئەمین، بەسەرکردایەتی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان، فەرمانڕەوای پێشووی خۆراسان، سوپایەکی بەڕێکرد بۆ جەنگاندنی براکەی و بەرەو (رەی) کەوتەڕێ، سوپای مەئمون-ی براشی بە سەرکردایەتی تاهیری کوڕی ئەلحوسەین لەوێ

---

[1] الطبري : ب ٨ لا ٣٧٩.

[2] الطبري : ب ٨ لا ٣٧٥-٣٧٦.

[3] هەمان سەرچاوە :لا ٣٨٩، ٣٨٧.الجهشياري : لا ٢٩٢.

چاوەڕوانی بوو.

هەردوو سوپاکە چوونە گژیەکدا لەشەڕێکی سەخت و گراندا، لە ئەنجامدا سوپای مەئمون سەرکەوت وعەلی کوڕی عیسا کوژرا. هێشتا هەواڵی سەرکەوتن نەگەیشتبووە بارەگای مەئمون لە (مرو)دا، خەڵکی بەیعەتیان بە مەئمون دا بۆ خیلافەت([1]).

لەراستیدا ئەمین هەڵەی کرد لە هەڵسەنگاندنی هەڵویستی سیاسی و سەربازی، یاخود دەسخەڕۆیان کرد بە هەڵبژاردنی عەلی کوڕی عیسا بۆ سەرکردایەتی هێزەکانی، چونکە ئەم هەڵبژاردنە ئەگەری راکێشکردنی خۆراسانیەکانی بۆ لای خۆی لە ناوبرد، چونکە زۆر رقیان لێی بوو، ئەمەش هەست و نەستیانی جۆشاند، بۆیە بۆ مردن شەڕیان کرد.

وادیارە حەزو ئارەزوی کەسی لەم هەڵبژاردنەدا رۆڵی گێڕا. چونکە عەلی تەماحی ئەوەی بوو بگەرێتەوە بۆ پۆستە کۆنەکەی، فەرمانڕەوا لە ویلایەتی خۆراسان، لەوانەیە ئەمین-یش بۆ ئەوەی رقیان هەڵسێنێ بە ئەنقەست سەرکردایەتیەکەی رادەست کرد. زیاتر یەکێك لە سیخوڕەکانی (الفچل)ی کوڕی سەهل کە ناوی ئەلعەباسی کوڕی موسایە، ئامۆژگاری ئەمین-ی کرد، عەلی بکاتە سەرکردەی سوپاکە تا خۆراسانیەکان بۆ شەڕکردن بجۆشێنێ.

دەنگوباسی دۆڕانی سوپای ئەمین بووە مایەی ترس و تۆقین لە (بەغداد)دا، ئەمەش وای لە خەلیفە کرد سوپایەکی تر ئامادە بکات بە سەرکردایەتی عەبدولڕەحمانی کوڕی جیلەی ئەنباری و ناردی بۆ خۆراسان، بۆ ئەوەی بەر بە هێرشی تاهیر بگرێ ([2])، شەڕی دووهەم لەنێوان ئەم دوو هێزەدا لە هەمەدان روویدا، دیسانەوە سوپای مەئمون سەرکەوت. تاهیر زاڵ بوو بەسەر شارەکەو بەردەوام بوو لەهێرشەکەی بەرەو بەغداد بەهاوەڵێتی (هرثمە بن أعین).([3]). کە گەیشتە نزیکی بەغداد، گەمارۆیەکی توندوتۆڵی دا، ئاژاوە کەوتە ناوی و شەقامەکانی پێکدادانی ناوخۆیی

---

[1] هەمان دوو سەر چاوەی پێشوو : لا ٤١١، لا ٢٩٣.

[2] الطبري : هەمان سەر چاوە لا ٤١٣-٤١٤.

[3] الطبري : ب ٨ لا ٤١٣ – ٤١٤.

بەخۆوە بینی لەنێوان لایەنگرانی هەردوولا. ئەوە بوو هێزێکی خۆراسانی توانی بچێتە ناو و ئەمین دەستگیر بکات، لابردنی لەسەر حوکم راگەینرا، بەڵام گروپە عەرەبیەکان دژە هێرشێکیان کرد و توانیان ئازادی بکەن و هێزەکانی خۆراسان لە شار دەربکەن.

لە ئەنجامی فشاری گەمارۆدانەکە، ئەمین بێ هێزبوو، سەربازەکانی ورەیان نەما، بەرگریکردن نەما، تاهیر-یش بە زۆر چووە ناو شارەوە، جا خەلیفە دوو هەڵبژاردنی لەبەردەمدا بوو: یان دەبێ دواین هەوڵی خۆی بدات بۆ شکاندنی ریزەکانی هێزی خۆراسانی، یان خۆی بەدەستەوە بدات و داوای ئەمان بکات. جا لەبەر ئەوەی بەپێی پێویست پیاوی لەگەڵ نەبوو یارمەتی بدەن لەسەر بەرگری کردن، پێی باش بوو خۆی رادەستی سەرکردە (هرپمەبن أعین) بکات، بۆیە ئەمی هەڵبژارد چونکە تاهیر توندرەو بوو، بەڵام تاهیر بۆسەی بۆ داناو دەستگیری کردو خستیە زیندانەوە، ئەوجا ژمارەیەك لە سەربازەکانی خۆراسان خۆیان کردە ناو زیندانەکەیەوە و کوشتیان، ئەمەش لەبیست وپێنجی (مانگی موحەرەم سالی ١٩٨ك/مانگی ئاب سالی ٨١٣ن) روویدا. تاهیر شاری بەغدادی کۆنترۆڵ کرد و خەڵکەکەی دڵنیا کردەوە، بەوەش خیلافەتی ئەمین کۆتایی پێهات ([1]).

---

[1] دەربارەی وردەباسی ئەم رووداوانە بگەڕێوە بۆ هەمان سەرچاوە : ■ ٤٧٢-٤٨٩

## ئەبو جەعفەری عەبدوڵڵای مەئمون ١٩٨-٢١٨ك/٨١٣-٨٣٣ز

### ناساندنی مەئمون

عەبدوڵڵای مەئمون، کوڕی هارون ڕەشیدی قرشی هاشمی، ئەبو جەعفەر، میری بڕواداران، دایکی بەس کوڕی هەبووە، پێی دەوترێ (مراجل الباذغسية). لەساڵی (١٧٠ك/٧٨٦ز) لە دایك بووە، لەتەمەنی سیانزە ساڵیدا باوکی کردی بەجێنشین. لە ساڵی (١٩٨ك/٨١٣ز) هات بۆ بەغداد.([1]).

مەئمون بەکۆمەڵی سیفەت ناسرا کە لە خەلیفەکانی دیکەی عەباسی جیای دەکردەوە، لەوانەش : حەزی لە لێبوردەیی بوو و رقی لەتۆڵەسەندنەوە بوو، لە هەموو خەلیفە عەباسیەکانی تر بەخشندەتر بوو، بەڵگەی بەهێزی پێ بۆ قەناعەت کردنی بە بەرامبەرەکەی، زرنگ بوو، وەڵامی خێرای پێ بوو. ئەدیب ناس بوو، شیعری باشی لە خراپی دەناسیەوە. حەزی لەبیستنی گۆرانی بوو ([2])

### ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی (مەئمون)دا

### ڕەوشی ناو بەغداد لەسەرەتای سەردەمی (مەئمون)دا

(الفضل)ی کوڕی سەهل ویستی بەری سەرکەوتنەکەی بچنێ، هێشتا هەواڵی کوشتنی ئەمین نەگەیشتبووە (مرو)، ئەم ئامۆژگاری خەلیفەی کرد کە کۆمەڵی گۆڕانکاری بکات بگونجێ لەگەڵ ئەم بارودۆخە تازەیە. ئامانجیشی ئەوە بوو هەردوو سەرکردە، تاهیری کوڕی ئەلحوسەین و (هرثمە بن اعین) لە عێراق دووربخاتەوە، تا بە تەنیا حوکمڕانی بکات.

مەئمون ئامۆژگاری وەزیرەکەی پەسەند کرد، تاهیری کوڕی ئەلحوسەینی لەسەر عێراق لابرد و براکەی لەباتی دامەزراند، هەروەها (هرثمەبن أعین)یشی بۆ خۆراسان

---

[1] ابن كثير : ب ١٠ لا ٢٧٤-٢٧٥.

[2] دەربارەی سیفەتەکانی مەئمون بگەڕێوە بۆ لای - الطبري :ب ٨ لا ٦١٥-٦٦٦.

نارد ([1]) جا دوور خستنەوەی ئەم دوو سەرکردەیە لە عێراق بووە هۆی بەرپا بوونی ئاژاوە و ئاشوب لەناوی.

لەلایەنی خۆیە، خەلیفە ویستی خەڵاتی وەزیرەکەی خۆی بکات، بۆیە نازناوێکی نوێی پێدا ئەوەش: ((ذو الرئاستین – خاوەن دوو سەرۆکایەتیەکە))، واتە سەرۆکایەتی شمشێر و سەرۆکایەتی قەڵەم، ئەم تایبەتمەندییەش نیشانەی ئەو دەسەڵاتە فراوانەیە کە ئەم پیاوە فارسە پێی گەیشتووە، لەتەتیشت ئەمەش، (الفضل) تایبەتمەندی میرێتی هەبووە، ئەو یەکەم وەزیرە نازناوی پێ بدرێ، یەکەم وەزیریشە نازناو و میرێتی هەبێ، پێی دەوترا ((وەزیری میر)). هەروەها بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتیشی خستە ژێر دەسەڵاتی.([2]).

ئەم هەڵسوکەوتەی مەئمون، بووە هۆی خەشم و قینی عەرەب رەگەزەکان و بێزاری بنەماڵەی هاشم و پیاو ماقوڵان، بۆیە ئاشوب بەرپا بوو لەناو بەغداد و خەڵکەکەشی بەیعەتیان بە (مەنسوری کوڕی مەهدی) دا، کە مامی مەئمون-ە، ناوبراو رازی نەبوو بەیعەتی پێ بدرێ بۆ خیلافەت، بەڵام پێی پەسەند بوو بەناوی مەئمون-ەوە فەرمانڕەوایەتی بەغداد بکات([3]).

پەستبوونی خەڵکی لەم ململانێیەو لەئەنجامەکانی، هۆکارێکی تر بوو بۆ گرژبوونی باردۆخەکەو وایان لێهات دەیانویست بەس رزگاربن. ئەوەی کە کارەکەی ئاڵۆزتر کرد لابردنی تاهیری بەهێز بوو لەسەر عێراق و لاوازی حوکمی ئەلحەسەنی کوڕی سەهل و لایەنگیری مەئمون بۆ (طالبي)یەکان، ئەوە بوو بەشێوەیەکی کتوپڕ و بۆ یەکەم جار بەیعەت بە (علی الرچا)، درا.

ئابەم شێوەیە شەڕی ناوخۆ لەبەغداد هەڵگیرسا، کاروباری دەوڵەت راوەستا، گوندەکانی باشووری عێراق تۆشی تاڵانکردن بوو لەلایەن بەکرێگیراوەکان و بارودۆخی ناو بەغداد وای لێهات نەدەویسترا، پاش ئەوەی کە شەقامەکانی پڕ بوو لە دز

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل٥٢٨.

[2] الجهشياري : ل ٢٠٥-٢٠٦.

[3] الطبري : ب ٨ ل ٥٤٦.

وجەردە. لەکاتێکدا ئەم پەشێویە ئیدارەی مەئمون–ی گرتبووەوە، ناوبراو لە (مرو) بوو و هیچ هەواڵێکی بەغدادی بۆ نەدەگەیشت، ئەوەش (الفضل)ی کوڕی سەهل پرسەکەی لێ شارد بووەوە و نەیدە هێشت هەواڵی پێ بگات.

## بەیعەتدان بە (علی الرچا)

لەکاتی نیشتەجێ بوونی مەئمون لە (مرو)، دڵی بۆلای (طالبي)یەکان شناو جلی سەوزی پۆشی، کە دروشمیانە، جلی رەشی فرێ دا کە دروشمی عەباسیەکانە و بوو بە زاوای عەلی کوڕی موسای کوڕی جەعفەر (الصادق).([1])، کە هەشتەمین ئیمامە لەریزی دوانزە ئیمامەکەی شیعە، پاشان لە(مانگی رەمەزان ساڵی ٢٠١ك/مانگی نیسان لەساڵی ٨١٧ز) کردی بە جێنشینی خۆی و ناوی (الرچا)ی لێنا، چونکە میری بڕواداران رازی بوو لەسەری.

بەڵام ئەم بەیعەتە هەروەها بەبێ کاریگەری تێپەڕ نەبوو، بۆیە پێویستی بە خوێندنەوەیەکی هێواش و بیرکردنەوەیەکی ورد هەیە تا پاڵنەر و ئەنجامەکانی بزانرێ.

لەرووی پاڵنەرەکانەوە، ئەوا دەبێ کەمێك بگەڕێینەوە دواوەوە و بچینە ناو دانیشتنەکانی کۆشك لەسەردەمی (هارون رەشید)دا کەوا بە هاندانی بەرمەکیەکان ساز دەکرا، تەماشایەکی و توێژە هزری و سیاسیەکانی (أهل الكلام) بکەین لە موعتەزیلەو شیعەکان، کەوا باسی خیلافەت ئاشکرا ترین باس بووە تێدا.

ئەوە بوو لەیەك نزیکبوونەوەیەك لەنێوان مەزهەبی موعتەزیلە و مەزهەبی شیعە روویدا، لەئەنجامی تێڕوانینی هاوشێوەیان بۆ پرسی خیلافەت. چونکە زۆربەی زانایانی موعتەزیلە خیلافەت بە مافی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەزانن، بۆچوونی شیعەکان–یش هەروەهایە.

مەئمون–یش لەناو ئەم وتوێژە هزریە پێگەیی و کاریگەر بوو بە ناوەڕۆکەکەی، بۆیە بۆچوونی موعتەزیلەکانی لەخۆگرت، بەتایبەتی لە پرسی خیلافەت و خوڵقاندنی

---

[1] مەئمون، (ام حبیب)ی کچی، دابە (علي الرضا)، هەروەها (ام الفضل)ی کچی، دابە موحەممەدی کوڕی(علي الرضا). هەمان سەرچاوە لا ٥٦٦.

قورئاندا ([1]). دەبینین ئەو شایەتانەی کە پەیماننامەی (علی الرچا)یان واژوویکرد لەو موعتەزیلانە بوون کە ناسراو بوون بە لایەنگریان بۆ عەلەویەکان ([2])، هەروەها گەورە پیاوانی شیعەش واژوویان کرد ([3]) لەتەنیشت ئەم دیاردەیە، ئەوا مەئمون لە ژینگەیەکی فارسی پەروەردە بووە چونکە دایکی فارس بووە و باوەڕیشی بە ماف عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوڕەکانی بووە لە خیلافەتدا، پەیوەندیەکی پتەوی بە خۆراسان هەبوو، بۆیە شیعەتگەری خۆی دەرخست و لایەنی عەلەویەکانی گرت ([4]).

مەئمون کاریگەر بوو بەو هەلومەرجە سیاسی یەی کە لەکاتی ململانێی لەگەڵ ئەمین-ی برایدا بەسەری برد، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە ئەم ململانێیە شێوازێکی رەگەزپەرستی لە خۆ گرتبوو، (الفضل)ی کوڕی سەهل-یش کە حەزوئاواتەکانی فارسی دەنواند، بە توندی لە پشتیەوە وەستا بۆ ئەوەی سەرکەوتن مسۆگەربکات. لەبەر ئەوەش مەئمون هیچ هەڵەیەکی نەبینی لە رازی کردنی فارسەکان کەوا رێزیان لەبنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگرت و سۆزدارانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن. بۆیە بەڵێنی دا لەگەڵ خوای خۆیدا ئەگەر سەرکەوت بەسەر براکەیدا خیلافەت بداتە باشترین کەس لەبنەماڵەی عەلی. راستی کرد کە سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەڵێنەکەی بردەسەر و بە راوێژی (الفضل)ی کوڕی سەهل، (علی الرضا)ی کرد بە جێنشینی خۆی.([5]) وادیارە مەئمون ناچاربوو لە جێبەجێکردنی پلانەکەی لەبەر دڵی خۆراسانیەکان، ئەمەش لەمیانەی گفتوگۆکەی لەگەڵ (علی الرچا)دا تێبینی دەکەین، چونکە هەڕەشەی لێکرد کاتێك رازی نەبوو ببێتە جێنشین و وتی ((دەبێ داخوازیەکەم بەجێ بێنێ، چونکە چارەیەکی دیکەم نیە........))([6])

لەرووی ئەنجامەکانەوە، ئەوا لەوانەیە ئاشکراترینیان گۆاستنەوەی خیلافەت بێ

---

[1] البغدادي : الفرق بين الفرق : لا ١٥٧.

[2] نموانەش : بشری کوڕی ئەلموعتەمەر و یەحیای کوڕی ئەکتەم و حەمادی کوڕی ئەلنوعمان.

[3] وەکو (الفضل)ی کوڕی سەهل و عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر.

[4] المسعودي : ب ٤ لا ٥. ابن الاثیر :ب ٥ لا ٢٣٠.

[5] الاصفهاني : لا ٤٥٤. ابن الطقطقا : لا ٢١٧. المسند لا ٢٣٥-٢٤١.

[6] هەمان سەرچاوە: لا ٤٥٤ – ٤٥٥

لەبنەماڵەی عەباسیەوە بۆ بنەماڵەی عەلەوی، کاردانەوەی توندوتیژی ناو بەغداد و هەندێ لە شارەکانی تر کەوا نەرێنیانە سەیری ئەم رووداوەیانەکرد، ئەوە بوو خەڵکی گەرەکی – ئەلحەربیە – لەبەغداد، بەیعەتیان بە ئیبراهیمی کوری ئەلمەهدی دا ([1]).

جێی سەرنجە کە (الفضل)ی کوری سەهل رووداوەکانی بەغدادی لەمەئمون شاردەوە تا ئەو کاتەی (علی الرضا) ئاگاداری کردەوە ([2]).

سەبارەت بە شارەکانی تر، ئەوا فەرمانرەوای بەسرە، ئیسماعیلی کوری جەعفەری کوری سولەیمانی کوری عەلی عەباسی، نکۆڵی لەم رەفتارەی خەلیفەی کرد و بە یاخی بوونێك لەبنەماڵەی عەباسی داینا، بۆیە جلی سەوزی نەپۆشی و لابردنی مەئمونی راگەیاند ([3]).

خەڵکی (مەککە)ش بەیعەتیان بە (علی الرچا) دا، خەڵکی (مەدینە)ش هیچ نارەزاییەکیان دەرنەبری کاتێك خەلیفە دەقی بەیعەتەکەی بۆ ناردن بۆ ئەوەی بخوێنرێ بۆیان ([4]).

## بەسەرهاتەکانی گەرانەوە بۆ بەغداد

پاش ئەوەی (علی الرضا) بە شڵەژاوی بارودۆخی دەوڵەت ئاگاداری کردەوە، مەئمون زانی کە مانەوە لە (مرو) سوودی نیەو بەغداد ناتوانێ بەبێ خەلیفە بژی، سەرەرای مەترسی ئەم پەشێوییەی کە میسرو جەزیرەی گرتۆتەوە، هەستی بە مەترسی هەڵگیرساندنی شەرێکی تری ناوخۆ کرد لە نێوان تاکەکانی دەوڵەتی عەباسی، سیاسەتی (الفضل)ی کوری سەهل سەرئەنجامەکەی لەناوچوونی دەسەڵاتێتی، هەروەها لەباکوور بزوتنەوە گەلێکی مەزهەبی کە لەسەر رێبازی ئەبو موسلیم و (مقنع) رێیان دەکرد، هاتنە دەرکەوتن، لە لەئازەربێنجان بڵاوبوونەوە

---

[1] الگبری: ب٨ لا ٥٥٤- ٥٥٥

[2] ابن الطقطقا: لا ٢١٨-٢١٩.

[3] الیعقوبي : ب ٢ لا ٤٠٢-٤٠٣.

[4] الاصفهاني : لا ٤٥٦.

بەهۆی دەرکەوتنی (بابەکی خورەمی) کەوا خەڵکێکی زۆری راکێشکرد و بزوتنەوەکەی بەرە بەرە فراوانتر دەبوو و دەسەڵاتی زیادی دەکردو وای لێهات هەڕەشە لە لایەنە ئیسلامیەکان بکات. سەرکردەکانی مەئمون قسەکانی (الرضا)یان دووپات کردەوە و ئامۆژگاریان کرد بەپەلە بەرەو بەغداد بچێ بۆ ئەوەی فریای خۆی بکەوێ، ئەگینا خیلافەت لەدەستی دەرئەچێ، بۆیە بریاری دا بگەرێتەوە بۆ بەغداد، لە سالی (٢٠٢ك/٨١٧ن) بەرەو بەغداد کەوتەرێ.

گەرانەوەی مەئمون بۆ پایتەختی ناوەند گۆرانکاریەکی گەوهەری بوو لە رێرەوی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، مانای ئەوەبوو مۆرکی فارسایەتی پێوە نەما، کەوا لەکاتی بوونی لە (مرو)دا پێوەی دیار بوو و گەرانەوە بۆ رەچەڵەکی عەرەبی کە بەغداد شانشینی باوباپیرانی دەینوێنێ، ئەمەش (الفضل)ی کوری سەهل-ی جارس کرد، چونکە لەناوچوونی دەسەڵاتەکەی تێدایە.

دیارە مەئمون هەستی بە نارەزایی وەزیرەکەی کرد لەم گۆرانکاریانە کە پێویست بوو بکرێ، زانی کە دەبێتە کۆسپێك لەبەردەمی کاتێك بیەوێ خانەوادەکەی و خەڵکی بەغداد ئاشت بکاتەوە، وێرای ئەمە، مەئمون لەمیانەی رەفتارەکانی وەزیرەکەی ئەوەی بەدیکرد کە ئەو پلان بۆ ئەوە دائەنێ بە تەواوەتی بەسەر دەوڵەتی عەباسیدا زاڵبێ لە ناوەوە و پێچ وپەنای ئەو سیاسەتەی بۆ دەرکەوت کە پەیرەوی دەکرد، بەتەواوەتی دژە بە بەرژەوەندییە باڵاکانی دەوڵەتی عەباسیە، بۆیە لەناودانی بووە پێویستیەکی سیاسی ([1]).

---

[1] لەو رەفتارانەی کە تێبینی کرا لە - الفضل - ی کوری سەهل ئەوە بوو کە نەعیمی کوری خازم ئاشکرای کرد، ئەمەش یەکێکە لە گەورە پیاوانی خوراسان کەوا مەئمون راوێژی پێکرد لە بەیعەتدان بە (علي الرضا)، ئەوە بوو لەبەردەم مەئمون دا نەعیم بە - الفضل-ی وت : ((تۆ دەتەوێ دەسەڵات لە بنەماڵەی عەباس بسێنێ بۆ کورەکانی علی، پاشان فێڵیان لێ بکەی و بیکەیتە دەسەڵاتێکی کیسرایی، ئەگەر ئەمەت مەبەست نیە ئەی بۆچی جلی علی و کورەکانیت نەپۆشی، کە سپیە، جلی سەوزت پۆشی، کە جلی کیسرا و ئاگرپەرستەکانە)).

رەفتارێکی تر هەیە ئەوە ئاشکرا دەکات کە - الفضل- ی کوری سەهل ئامانجی زیندوو کردنەوەی دابونەریتی فارسیە.((جا خاوەن دووسەرۆکایەتی لەسەر کورسیەکی باڵدار بوو، کە بیویستایە بچێتە ژوورەوە بۆلای مەئمون هەڵیان دەگرت، دایان نەدەبەزاند تا مەئمون چاوی پێ نەکەوتبایە، کە چاوی پێ دەکەوت، کورسیەکەیان دائەنا و ئەویش دائەبەزی و بەپێ دەرۆیشت و کورسیەکیان هەڵدەگرت و لەبەر دەستی مەئمون دایان ئەنا، ئەوجا خاوەن دوو

مەئمون هێشتا گەشتەکەی بۆ بەغداد دەستپێ نەکردبوو، هەر گەیشتە شاری سەرخەس تەگبیری کوشتنی (الفضل)ی کوڕی سەهل-ی کرد، لە (مانگی شەعبان ساڵی ٢٠٢ك/مانگی شوبات ٨١٨ز) پاشان گەشتی گەڕانەوەی بۆ بەغداد دەستپێکردەوە. کە گەیشتە (طوس) لە ناکاو (علی الرضا) کۆچی دوایی کرد، لەسەرەتاکانی ساڵی (٢٠٣ك/٨١٨ز). مەئمون-یش لەتەنیشتی گۆڕی هارون رەشیدی باوکی ناشتی. مێژوونوسان ناکۆکن لە چۆنێتی مردنی، شیعەکان مەئمون بەوە تۆمەتبار دەکەن کە بە تری ژەهر خواردی کردوە، ناوی (مەشهەد)یان لە شاری (طوس) نا.([1])، مردنی ئەم دوو پیاوە گرنگترین هۆکار بوو بۆ ئەوەی عەلەویەکان رق لە مەئمون هەڵبگرن.

مەئمون بەردەوام بوو لەگەشتەکەیداو گەیشتە هەمەدان، جارێ لەبەغداد نزیک نەبووبووەوە خێرا خەڵکەکەی ئیبراهیمی کوڕی ئەلمەهدی-یان لابرد و بەیعەتیان بە مەئمون دا، ئەمەش لە حەفدەی (مانگی – زی الحجە – ساڵی ٢٠٣ك/مانگی حوزەیران ساڵی ٨١٩ز) روویدا، مەئمون رۆژی شەممە (چواردە رۆژی مابوو لە مانگی سەفەر ساڵی ٢٠٤ك/ مانگی ئاب ساڵی ٨١٩ز) چووە ناو بەغدادەوە، جا خۆی و هەموو ئەوانەی لە گەڵیدابوون هێشتا هەر جلی سەوزیان لەبەر بوو و ئاڵای سەوزیان هەڵگرتبوو، بۆیە بنەماڵەی هاشم و لایەنگرانیان بێزاری و ناڕەزایی خۆیانیان دەربڕی و ئەمیش ناچار بوو، لەدوای یەك حەفتە بگەڕێتەوە بۆ ڕەش پۆشین ([2]) پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت تا چەند بنەماڵەی عەباس هەستیارن بەرامبەر بە (طالبي)یەکان.

---

سەرۆکایەتی سڵاوی لێ دەکرد و دەگەڕایەوە و دادەنیشت.... بەم کارەش خاوەن دوو سەرۆکایەتی لاسایی کیسراکانی دەکردەوە چونکە وەزیرەکانی لەسەر کورسیەك هەڵدەگیران، هەڵگرتنەکەشیان لە ئەستۆی دوانزە پیاو بوو لە بنەماڵەی پاشاکان)).

وە ڕەنگە دوو باڵەکەش باڵی ئەهورا و مزدا بێ، خواوەندی خێر لەلای زەردەشتیەکان. بگەڕێوە بۆ : الجهشیاري : ل ٣١٦، ٣١٣. الدوري : ل ١٦٥.

[1] الاصفهاني : ل ٤٥٧-٤٦٠. المسعودي :ب ٣ ل ٤٤١. ابن الطقطقا : ل ٢١٨. ابن الاثیر : ب ٥ ل ١٩٣، کەوا بە دووری خست کە مەئمون ژەهرخواردی کردبێت، لە کاتێکدا – الطبري – هیچی نەوت دەربارەی تۆمەتبار کردنی مەئمون : ب ٨ ل ٥٧٥. خەلیفەبن خیاط-یش تۆمەتباری نەکرد: ل٧٦٦.

[2] الطبري :ب ٨ ل ٥٧٤-٥٧٥.

## بزوتنەوەكانی دژە دەوڵەت

### أ- بزوتنەوەی (طالبي)یەكان.

### بزوتنەوەی ئەبو لسەرایا

(طالبي)یەكان، ئەو ناسەقامگیریە سیاسیەی كە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی پێدا تێپەڕ بوو لەئەنجامی ململانێی نێوان ئەمین و مەئموندا، بەهەلزانی بۆ ئەوەی لە عێراق و حیجاز و یەمەن دژیان راپەڕن، كە لەوانەیە مەترسیدار ترینیان بزوتنەوەی (ئەبی لسەرایا لسری كوڕی مەنسور لشەیبانی) بێ، كەوا بەفەرمانی موحەممەدی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی ئیسماعیل، ناسراو بە (ابن طباطبا) لە كۆتاییەكانی (مانگی جومادای دووهەم ساڵی ١٩٩ك/ مانگی شوبات ساڵی ٨١٥ز)، لە شاری كوفە سەری هەڵدا ([1])، ئەم بزوتنەوەیەش بە ئەڵقەیەك دائەنرێ لە زنجیرە بزوتنەكانی شیعەی زەیدی.

لەپاش ئەوە، بەسرە و حیجاز و یەمەن-ی خستەژێر ركێفی خۆی، ئەبی لسەرایا دەسەڵاتی فراوانەوە بوو، ئەو لەشكرە عەباسیەی شكاند كە ئەلحەسەنی كوڕی سەهل ناردی بۆ بەرەنگار بوونەوەی.

وادیارە ئەبی لسەرایا ویستی تاكڕەوی لەدەسەڵاتدا بكات، بۆیە بە ژەهر (ابن طباطبا)ی لە ناودا و موحەممەدی كوڕی مەحومەدی كوڕی زەیدی عەلەوی خستە شوێنی، جا هێشتا تازەش پێگەیشتبوو([2]).

ئەبو لسەرایا درهەمی دروست كرد و بەرگێكی بۆ كەعبە نارد لەسەری نوسی: ((ئەبو لسەرایا، بانگخوازی ئال موحەممەد، فەرمانی داوە بە پۆشینی ماڵی خوا، دەبێ بەرگی ستەمكارانی بنەماڵەی عەباسی لێ بكرێتەوە)).([3]).

لەئەنجامی ئەم سەركەوتنانەی كە بەدەستیهێنا، ئەلحەسەنی كوڕی سەهل ناچاربوو داوا لە (هريمه بن أعين) بكات كۆتایی بەم بزوتنەوە بێنێ. ئەوەبوو ئەم سەركردەیە سەركەوت لە جێبەجێ كردنی ئەركەكەی و چووە ناو كوفەوە، ئەبو

---

[1] الطبري : ب ٨ ل ٥٢٨.

[2] الطبري :ب ٨ ل ٥٢٩.

[3] هەمان سەرچاوە :ل ٥٣٠-٥٣٦.

لسەراياش هەڵهات و لەوڵاتی فارسەوە بەرەو سوس چوو، پاشان بۆ جەزیرە و لە جەلەولا دەستگیر کرا، بردیان بۆ ئەلحەسەنی کوڕی سەهل لە نەهرەوان، ئەویش ملی پەراند.

وادیارە ئەم بزوتنەوەیە جیاوازە لەو بزوتنەوە عەلەوییانەی کە لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا سەری هەڵدا بوو. چونکە پلانی بۆ دارێژرابوو و پیاوێك ئاراستەی دەکرد لە غەیری ئال موحەممەد، کوفەی کرد بوو بە بنکەی خۆی، ئەمەش یەکەم جارە ئەم شارەیە بزوتنەوەیەکی عەلەوی بەخۆ ببینی لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا ([1]).

سەبارەت بە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ئەم بزوتنەوەیە، سەرەڕای فراوانبوونی دەسەڵاتی و سەرکەوتنی لەهەندێ بواردا، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ چوار هۆکار:

یەکەم: ئەبو لسەرایا سەربە ناوماڵی عەلەوی نەبوو، هەرچەندە بانگەشەی بۆ عەلەویەکان دەکرد، بۆیە شیعەکان پشتگیریان لە رابەرە عەلەوییەکانی خۆیانیان کرد، لەپێشی هەموویان موحەممەدی کوڕی جەعفەر (الصادق)، وازیان لە پشتگیری کردنی مێنا، ئەمەش بێ هێزی کرد.

دووهەم: رابردووی ئەبو لسەرایا گومانی بۆ دروستکرد. چونکە ئەم پیاوە سەرەتا لەژێر فەرمانی سەرکردەی عەباسی (هرثمه بن أعين) کاری دەکرد، پاشان بەجێیهێشت بەهۆی دواکەوتنی بژێوی یەکەی ([2]).

سێهەم: بزوتنەوەی ئەبو لسەرایا بە توندو تیژی ناسرا، ئەمەش وایکرد خەڵکێکی زۆر لێی دوورە پەرێز بێ، لە ئەنجامدا لەجۆش و خرۆشی کەم کردەوە و لاوازیش بوو.

چوارەم: کارو کردەوەی (طالبي)یەکان لە شوێنکەوتووانی ئەبو لسەرایا، لە (مەککە)دا ([3]) بووە مایەی خەشم و قینی هەموو موسڵمانان، لەئەنجامدا لەم بزوتنەوەیە تووڕە بوون بە تایبەتی کاتێك ئەبو لسەرایا بەرگی کەعبەی کردەوە و بەرگێکی تری تێکرت کە دروشمی دژ بە عەباسیەکانی لەخۆ گرتبوو ([4]).

---

[1] الليثي: سميرة مختار :جهاد الشيعة. لا ٣٣١.

[2] الطبري : ب ٨ لا ٥٢٩.

[3] الطبري – باسی ئەو کردەوانە دەکات کە شوێنکەوتووانی ئەبو لسەریا لە مەککە ئەنجامیاندا. هەمان سەرچاوە : لا ٥٣٦ – ٥٤٠

[4] الليثي :لا ٣٣١ – ٣٣٤.

## بزوتنەوەی موحەممەدی کوڕی جەعفەر(الصادق)

سەردەمی مەئمون راپەرینی بزوتنەوەیەکی تری (طالبي) بەخۆوە بینی کە بەرنامەو شوێنی دەستپێکردنی لەبزوتنەوەکانی تر جیاواز بوو، موحەممەد (الدیباج)ی کوڕی جەعفەر (الصادق) لەساڵی (٢٠٠ ك / ٨١٦ ز) لە وڵاتی حیجاز رابەرێتی کرد، لە (مەککە) بەیعەتی پێدرا بۆ ئەوەی ببێ بە (امیرالمومنین)، ئەوەیش پاش دوو دڵیەك رازی بوو ([1])

وادیارە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی سەرقاڵبوو بەکێشە زۆرەکانی ناو خۆی، بۆیە بایەخیەکی ئەوتۆی بەم بزوتنەوەیە نەدا، کەوا مەترسیدار نەبوو چونکە لە (مەککە) تەسکبوویەوە، ئەمەش دەرفەتی بە خیلافەتدا بەئاسانی لە ناوی بەرێ، موحەممەد (الدیباج)یش ناچار بوو لە مەککە لەبەردەم خەڵك خۆی لەسەرکار لابەرێ ([2]) رەنگە گرنگترین هۆکارەکانی شکستهێنانی ئەم بزوتنەوەیە بگەرێتەوە بۆ:

بڵاو نەبوونەوەی لە شارەکان و درێغی کردنی شوێنکەوتووانی لە روبەڕونەوەی عەباسیەکاندا.

– دوو دڵی موحەممەدی کوڕی جەعفەر لەبانگەشەکردن بۆ خۆی و حەزنە کردنی لەو کارە، بەڵکو ئەو لەئەنجامی زۆر لێکردنی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەلی کوڕی رازی بوو.

–پشتبەستنی بەو لایەنگرانەی کە بەدناون وەکو: ئاژاوەچیەکانی خەلکی مەککە، هەندی لە سودانیەکان، عەلی کوڕی، بۆیە خەڵکی لێی دووركەوتنەوە.

– دوو دڵی هەندێ لە خەڵکی لەبەیعەت پێدانی، هەروەها ئەوەی بەیعەتی پێدا پابەند نەبوو بەدۆستایەتی و پشتگیری کردنی.([3])

---

[1] الخطیب البغدادي :ب ٢ لا ١١٣-١١٤.

[2] الطبري : ب ٨ لا ٥٣٨- ٥٣٩.

[3] اللیثي : لا ٣٤١-٣٤٢.

ب – بزوتنەوە نا (طالبي)یەکان

بزوتنەوەی (نصرین الشبث)

(نصربن الشبث) رابەرێکی عەرەبە لەبنەماڵەی عەقیل، لە (کیسوم) دادەنیشیت لە باکووری حەلەب، دەمارگیر بوو بۆ ئەمین لەبەر ئەوەی نوێنەری رەگەزی عەرەب بوو، رقی لە مەئمون بوو چونکە لایەنگری خۆراسانیەکان بوو. لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٨ك/٨١٤ن) سەری هەڵدا و وڵاتەکانی دەوروبەری خستەژێر رکێفی خۆی و هەروەها (سمیساگ)یش، عەرەبیکی زۆر شوێنی کەوتن ([1])، ئەوەندە بە هێز بوو تەنانەت خەلیفەش سڵی لێکرد. لە راستیدا بزوتنەوەکەی دژ بەدەسەڵاتی عەباسی ئاراستە نەکرا بوو، بەڵکو راپەرینێك بوو دژی دەسەڵاتی فارسی کە زاڵ بوو بوو بە سەر دامودەزگاکانی خیلافەتدا ([2])

کاتێك تاهیری کوری ئەلحوسەین سەرکەوت بەسەر ئەمین–دا، مەئمون بانگهێشتی کرد بۆ (رقە) بۆ ئەوەی دژی (نصر) بجەنگی، موسڵ و جەزیرە و شام و مەغریبی خستەژێر دەسەڵاتی وعێراقی لێ سەندەوە، وادیارە ئەم کارە بێزاری کرد، بۆیە خاوە خاوی کرد لە جەنگاندنی (نصر) و دەرفەتی پێدا سوپای عەباسی بشکێنێ و گەمارۆی (حەڕان)ی دا. (طالبي) یەکانیش وەکو یەکێك لە هێما بەرهەڵستکارەکانی دەسەڵاتی عەباسی بۆیان دەڕوانی، بۆیە هەوڵیاندا سوودی لێوەربگرن ورازیی بکەن بەیعەت بداتە عەلەوی، بەڵام قایل نەبوو چونکە لایەنگری عەباسیەکان بوو ([3]).

مەئمون زانی کە تاهیر لە جەنگاندنی (نصر) دا خاوە خاوی کردوە، بانگهێشتی کرد و خۆراسانی خستەژێر دەسەڵاتی و ویلایەتەکانی رۆژئاوا لە (رقە)وە تا وەکو (میسر)ی خستەژێر دەسەڵاتی عەبدوڵای کوری و فەرمانی پێدا بجەنگێ لەگەڵیا. ئەوە بوو عەبدوڵلا توانی گەمارۆی (نصر) بدات و تەنگی پێهەڵچنێ، بۆیە ناچاربوو لەساڵی (٢٠٩ك/٨٢٤ن) داوای ئاشتبوونەوە بکات و ساڵی دواتر هێنایان بۆ بەغداد، پاش ئەوەی کە خەلیفە دڵنیای کردەوە ([4])بەوەش بزوتنەوەکەی کۆتایی پێهات.

---

[1] الیعقوبي :ب٢ ل ٣٩٨.

[2] الدوري : ل ١٢٨.

[3] طبري : ب ٨ ل ٥٧٩–٥٨٠.

[4] سەرچاوەی پێشوو : ل ٥٩٨–٦٠١.

## بزوتنەوەی (الزط)

(الـزط) هەسـتان بـە راپـەرينێكی توندوتيـژ لـەباشـووری عێـراق لـە دەوروبـەری (بەسرە)دا. ئەمانەش ميلەتێكن خەڵكيكی هەمە جۆريـان لـەخۆ گرتـووە ناسـراون بـە (النور) واتە رووناكی، بنەچەيان دەگەڕێتەوە بۆ هنديەكانی ئاسيا، پـاش كۆچـكردنيان بۆ رۆژهەلات لە (بطائح) لە نێـوان واسـت و بەسـرە، جـێگير بـوون. لـەكاتی ململانێـی نێوان ئـەمين و مەئمونـدا پـشت ئەسـتوور بـوون و رێگـەی بەسـرەيـان كـۆنترۆڵ كـردو پەيوەندی لە نێوان بەسرە و بەغداديان بچراند، لـە سـەردەمی مەئمونـدا زيـاتر پـشت قايم بـوون ([1]) كاتێـك مـەئمون لـەبـەغـداد جـێگير بـوو، دەسـتی بـەتاڵ بـوو بـۆ ئـەم كۆمەڵەيە كە دژی دەسەلاتەكەی راپەڕيون، لەسـاڵی (٢٠٥ك/٨٢٠ز) چـەند هەڵمـەتێكی سەربازيی بۆ ناردن. بەلام نەيتوانی لە ناويان بەرێ ([2]).

واديـارە ئـەوان زۆر وريـا بـوون، كـە بيانزانايـە لـەمەترسـيدان، دەسـتبەجێ بـلاو دەبوونەوە لەناوچە چۆڵەكان. جـا چـالاكيـان چـڕكردەوە دژی دەوڵـەت بـە شـێوەيـەك گومركيان سـەپاندە سـەر ئـەو كـەشتيانەی دێنـەناو بـەغدادەوە و هەوڵيانـدا نـەهێلن ئازوخە بگاتە پايتەختی خيلافەت ([3]). (زط)ەكان وەكو دڕكێك لـە قەبرغـەی دەوڵـەتی عەباسـی مانـەوە، تـا رۆژانـی (المعتـصم) كـەوا بزوتنەوەكـەيـان لـەنـاو دەبـات و شاربەدەريان دەكات بۆ (عين زربە) لە ناوچە سەر سنورەكانی ئيسلام.

## پەشێوی لە ميسر

رەوشی سياسی ويلايەتە ئيسلاميەكان كاريگەر بـوو بـەو ململانێيـەی كـە لـەنێوان ئـەمين و مەئمونـدا روويـدا، ئەمـەش بـەروونـی و بـە شـێوەيەكی تايبـەت لـە ميـسر دەركەوت، لەساڵی (٢٠٦ك/٨٢١ز) لەئاسۆی سياسيدا گرنگی بزوتنەوەيەكی سەربەخـۆ دەركەوت بە رابـەرێـتی (الـسری بـن الحكـم) بـەهۆی رق هەسـتانی (ئەلعەباسـی كـوڕی

---

[1] دائرةالمعارف الاسلامية : ب ١٠ لا ٣٤٩-٣٥٠.

[2] الطبري : ب ٨ لا ٥٨٠.

[3] هەمان سەرچاوە : لا ٥٨١.

موسا) –فەرمانڕەوای مەئمون لەمیسر. ئەم پیاوە ململانێی ناوخۆیی لەنێوان قەیسیەکان و یەمەنیەکاندا بەهەلزانی تا بیانداتە گژیەکتری بۆ ئەوەی گۆڕەپانی سیاسی بۆی چۆڵ بێ، لەئەنجامی ئەوەش کەشێکی نیگەران و ناسەقامگیر باڵی بەسەر میسردا کێشا.

لەساڵی (٢١٤ك/٨٢٩ز) هۆزە عەرەبەکانی میسری خواروو شۆڕشیان هەڵگیرساند، بەهۆی سیاسەتی زۆردارانەی فەرمانڕەوا عەباسیەکان، جێگری والیان کوشت.

مەئمون بەرەنگاری ئەم بزوتنەوە ناحەزە بووەوە و (المعتصم)ی برای بانگهێشت کرد بۆ جەنگاندنیان و سەرکەوت لە دامرکاندنی. بەڵام کە میسری بەجێهێشت سەر لەنوێ ئاژاوە کەوتە ناوی، لەساڵی (٢١٥ك/٨٣٠ز) خەلیفە (ئەلئەفشین)ی نارد کە سەرکردەیەکی تورکی خۆیەتی، توانی لەناوی بەرێ ([1]).

وادیارە رەوشی ناوخۆی میسر بەتەواوەتی هێور نەبووەوە، ئەمجار (قبط) و عەرەبەکان لەساڵی (٢١٦ك/٨٣١ز) راپەڕینێکی گەورەیان کرد، بۆیە مەئمون ناچار بوو خۆی بچێ بۆ میسر تا رەوشەکە هێوربکاتەوە، ئەوە بوو دایمرکاندەوە و بەشێکی زۆریشی لە (قبط)ەکان بەدیل گرت، رابەرانی بزوتنەوەکەی لەگەڵ خۆیدا بۆ بەغداد برد و بەرپرسی دارایی–شی لەسەرکار لابرد چونکە ئەو هۆی ئاژاوەکە بووە ([2]).

## بزوتنەوەی بابەکی خوڕەمی

مەترسیدارترین بزوتنەوەیە، بەرواڵەت ئاینیە، ئامانجی سیاسیە، دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە ئەم بزوتنەوەی ناسیوە، ناسراو بوو بە: زۆر بڵاو بوونەوەی، رێکوپێکی بانگەشەکەی، لێهاتوویی سەرکردەکانی و پەیوەندی کردنی بە غەیری فارسەکان ([3]).بە لوتکەی پیلانی فارسی لە دژی

---

[1] الیعقوبي : ب ٢ لا ٤٢٣.

[2] الیعقوبي : ب ٢ لا ٤٢٣–٤٢٥.

[3] الدوري : لا ١٧٩.خوڕەمیەکان: دەگەڕێتەوە بۆ وشەی خوڕەمی فارسی ▪ مانای (بەچێژ) دەبەخشێ چونکە بنەماکانی بەرەڵایانەیە. سەبارەت بە بۆچوونەکان دەربارەی ئەم ناوە بگەڕێوە بۆ : عمر : ▪ ٢٠٨–٢١٠.

دەسەڵاتی عەباسیدا دادەنرێ.

(بابەك) بنەماكانی خوڕەمی لەسەر دەستی (جاویدان) خوێندووە([1]). جا كاتێك جاویدان مرد، ژنەكەی وایڕاگەیاند كە گیانی پیاوەكەی بەر جەستەی بووە. بابەك-یش ئەم بیرۆكەی وەرگرت و بەو پێیە هەڵسوكەوتی دەكرد ([2]).واش دیارە ئەم شوێنی جاویدان-ی گرتبوو لە رابەرێتی خوڕەمیەكان لە ناوچە شاخاویەكاندا، ئەوجا كەوتە پەرەپێدان و رێكخستنی بزوتنەوەكەی لە هەوڵێكدا بۆ بەهێز كردنی مشتی خۆی بۆ بەدیهێنانی مەبەستە سیاسی و ئاینیەكانی. بابەكی گروپێكن لە خورەمێكان، شوێنكەوتووانی شوێنی بابەك كەوتن ([3]) ئەمەش بەڵگەیەكە لەسەر ئەوەی كە بابەك و شوێنكەوتووانی دژی دەسەڵاتی سیاسی عەرەب بوون و دژی ئاینی ئیسلامیش بوون چونكە ئاینی عەرەبە. لێرەشدا ئەوە بەدی دەكەین كە ئەم بزوتنەوەیە رەهەندی ئاینی و رەگەزپەرستی لەدواوە بووە.

لەرووی ئاینیەوە، ئەوا بابەكیەكان بروایان بە بنەمای (التناسخ و الرجعه) بووە، وە بە هاوبەشێتی و بەرەڵایی، پێیان وابوو كە ئافرەت حەڵاڵە ئەگەرهاتوو خۆی رازی بێ، ئەركە شەرعیەكانیان رەت كردەوە. بەم پێیەش بیروبۆچوونی بابەكی جیاوازە

---

[1] خورەمیەكان كۆمەڵێ بەش و جۆرن، بەڵام هەموویان كۆكن لەسەر بۆ چوونی (گەڕانەوە) و دەڵێن ناو دەگۆڕدرێ و لەشیش ئاڵوگۆڕ دەبێ، دەڵێن هەموو پێغەمبەران، بە جیاوازی شەریعەت و ئاینیان، یەك گیانیان دەست ئەكەوێ، وەحی (سروش) هەرگیز لە زەوی دانابڕێ، هەموو خاوەن ئاینەكانیش ئەگەر چاوەڕوانی پاداشت بێ و لە سزا بترسن، ئەوە لەلایان پەسەندە، پێشیان وانیە قسەی پێبكەن و زیانی پێ بگەیەنن، ئەگەر پیلانی دژی میلەتەكەیان نەگێڕاو هەوڵی نەدا مەزهەبەكەیان لەناوبەرێ. زۆر دوورە پەرێزن لە خوێنڕشتن تەنها لە كاتی جەنگدا نەبێ و ئەبو موسلیم بەرز ڕادەگرن و نەفرەت لە ئەبو جەعفەر دەكەن چونكە كوشتوویەتی، سڵاواتی زۆر بۆ مەهدی كوڕی فەیروز دەنێرن، چونكە لە كوڕی ( فاطمة)ی كچی ئەبو موسلیمە، ئیمامی خۆیان هەیە لە حوكمەكاندا بۆیان دەگەڕێنەوە، نێردراویان هەیە لەنێواندا دەگەڕێن ناوی فریشتەكان -یان لێناون، هیچ شتێكیان وەكو مەی خواردنەوە پیرۆز نەدەكرد، بنچینەی ئاینە كەیان روناكی و تاریكی یە...... و هەندێكیان بۆ چوونیان وایە ئافرەت حەڵاڵە ئەگەر خۆیان رازی بن، هەمو شتێك چێژی لێوەربگیرێ و دڵ بچێتە سەری حەڵاڵە ئەگەر زیان بە كەس نەگەیەنێ. بگەرێوە بۆ – المقدسي – ب ٤ لا ٣٠.

[2] گروپی خوڕەمی، كاتێك بابەك چووە ریزیانەوە، دوو بەش بوو، دوو سەرۆكیشی ململانێیان دەكرد لە سەر سەركردایەتی، یەكێكیان پێی دەوترێ جاویدان ئەوەی دیكەش عومران.

[3] الطبري : ب ٨ لا ٥٥٦ البغدادي : لا ٢٥١. ابن النديم : الفهرست لا ٤٨٢.

لەبنەماکانی ئاینی ئیسلام([1]).

بابەکیەکان هەوڵیاندا کێشەی جیاوازی لە دابەشکردنی سەروەت وسامان لە نێوان خاوەن موڵکەکان و جوتیارەکاندا چارەسەر بکەن، ئەوەش بە لێسندنەوەی زەوییەکان لە ئەوان و دابەشکردنی بەسەر ئەم جوتیارانە. چونکە (مازیار) کەوا ئاینی (محمرە – سوورگەری)([2]) لە جرجاندا دەرخست و کەوا پەیوەندییەکی بەهێزی هەبوو لەگەڵ بابەکدا، فەرمانی بە جوتیاران دا هەڵمەت بەرن بۆ سەر خاوەن باخەکان و پارەکانیان تاڵان بکەن ([3])

لەرووی رەگەزپەرستیەوە، ئەوا بزوتنەوەی بابەک دەربڕینێکە بۆ ئەو خەشم و قینەی کە دڵ و دەروونی کۆمەڵەیەک لەفارسەکانی پڕ کرد بوو دژی ئاینی ئیسلامی کەوا هانی عەرەبەکانی دا ئیمپراتۆریەتی فارسی لەناوبەرن، دژی عەرەبەکان کەوا دەوڵەتەکەیان لەناودا. بابەک خۆی لکاند بوو بە ئەبو موسلیمی خۆراسانی، وایڕاگەیاند کە ئەو لە نەوەی (فاتمە)ی کچێتی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کۆنە هەستی فارسایەتی.

لەرووی سیاسیەوە بابەک لێهاتوو بوو، ئەو بارودۆخی نالەباری دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی بە هۆی ململانێی نێوان ئەمین و مەئموندا، بە هەلزانی و لەساڵی (٢٠١ ك /٨١٦ ز) لە هەرێمەکانی باکوور بزوتنەوەکەی راگەیاند، جا ناوچەگەلێکی دوورن لە دەسەڵاتی دەوڵەت. بریتین لە شاخەکانی ئازەربایجان و ئەڕان کەوا لانەی بزوتنەوەکەیە و (بژ) کە بنکەکەیەتی ([4]). بابەک سیاسەتێکی ژیرانەی پەیڕەو کرد لە راکێشکردنی لایەنگران، توانی هەموو بەشەکانی ئازەربێنجان بهێنێتە پاڵی خۆی و وا رێککەوت بانگەشەکەی سەرکەوتنێکی سەرنجڕاکێشی بەخۆوە بینی لەناوچەی شاخەکان و هەمەدان و ئەسفەهان و (ماسبژان) و مەهرەجان–دا، هەروەها کۆمەڵەیەک لە کوردە شاخنشینەکان چوونە پاڵی و بەشێکی زۆریش لە ( دەیلەم) کان ولە

---

[1] المقدسي :ب ٤ لا ٣٠.

[2] خوڕەمیەکان، شوێنکەوتووانی بابەک پێیان دەوترا (المحمرة – سوورگەرەکان)، چونکە لە رۆژانی بابەکدا جلەکانیان بەسوور بۆیاغ کردبوو، هەروەها دروشمیشیان بووە.

[3] الطبري: ب ٩ لا ٨١

[4] بذ: گوندێکە لە نێوان ئازەربێنجان و ئەڕان

(طبرستان) و جرجان و ئەرمینیا و خۆراسان و سەرجەم خاکەکانی عەجەم بڵاو بووەوە ([1]). بزوتنەوەکە هەندێ سەرکردە و میری فارسیشی لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بۆ لای خۆی راکێش کرد. هەموویان بەشداریان کرد لە شۆڕشێکی چەکداری دژی عەباسیەکان، بابەك هەوڵی دا ئەرمەنەکان-یش بخاتە ریز خۆی و دەستی خستناو دەستی بێزەنتیەکانیشدا، بابەك رۆژ لەدوای رۆژ لایەنگری زیاتری پەیدا دەکرد، ئەوەش بەهۆی ئامادە نەبوونی هێزی عەباسی کە سەرقاڵ بوو بە شەڕی ناوخۆ و دامرکاندنی بزوتنەوە بەهەڵستکارەکانی میسر و وڵاتی شام و عێراق و جەنگ کردن لەگەڵ بێزەنتیەکاندا، جا ئەم بارودۆخە هۆکارێکی یارمەتیدەر بوو بۆ سەرکەوتنی لە رووی سەربازیەوە، تێکچوونی رەوشی ناوخۆ لە ئازەربێنجان هۆکارێکی دیکە بوو لە پەلەکردن لە راگەیاندنی شۆڕش. ئەوە بوو حاتەمی کوڕی (هریمە بن اعین) هەر هەواڵی مردنی باوکی بیست، لە ئازەربێنجان سەری هەڵدا و پەیمانی بەست لە گەل بابەکدا و پرسی موسڵمانانی لا سووك کردەوە ([2]).

بابەك سیاسەتێکی سەربازی پەیرەو کرد لەسەر روخاندنی قەڵاکان و وێرانکردنی هەستابوو، تا بەرگری کردنی عەباسی لاواز بێتەوە، هەروەها جەختی کردەوە سەر بچراندنی ئەو رێگایانەی ئازوخە دەگەیەنن، تاڵانکردنی کاروانەکانیان بۆ ئەوەی هێرشەکانیان پەك بخات.

شوێنکەوتووە شاخەوانەکانیشی ناسراو بوون بە ناسینی پێچ و پەناکانی ناو شاخەکان و بۆسەدانان، ئەوان سەربازە عەباسیەکانیان لە رێڕەو و دەربەندە شاخاویەکاندا گیر ئەداو لە ناویان ئەبردن، ئەمەش روونی دەکاتەوە کە ئەو شاڵاوە زۆرانەی مەئمون بۆ جەنگاندنیان ئاراستەی کردبوو، شکستی دەهێنا ([3]).

لەئەنجامی سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی، بابەك بووە هێزێکی مەترسیدار

---

[1] الدینوري : لا ٢٨٠. الیعقوبي : ب ٢ لا ٤١٩. المسعودي : التنبیة و الاشراف لا ٣٠٦. البغدادي :لا ٢٦٨، ٢٥٢.

[2] الیعقوبي: ب٢ لا ٤١٩

[3] لەساڵی ٢٠٤ك مەئمون چەندین شاڵاوی بۆ جەنگاندنی بابەکیەکان نارد بە سەرکردایەتی ناوبانگترین سەرکردەکانی نمونەی یەحیای کوڕی – معاذ – و عیسای کوڕی موحەمەد و عەلی کوڕی – صدقة – و موحەممەدی کوڕی حەمید–الطوسي– و هیتر، بەڵام ئەمانە نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنن.

دژی دەوڵەتی عەباسی. مەئمون لە ساڵی (٢١٨ ك/٨٣٣ن) کۆچی دوایی کردو بابەکیش لە لوتکەی بەهێزیدا بوو، ئەوەی کە مەترسیداری ئەم بزوتنەوەیە دەسەلمێنێ ئەوەیە مەئمون پێش مردنی تەمێی (المعتصم) ی برای کرد بەپێویستی بەرەنگار بونەوەی ئەم کۆمەڵەیە و دژایەتی کردنیان بە هەموو هێزو توانایەکەوە.([1])

## زانست لە سەردەمی (مەهدی)دا

– ناوی مەئمون پەیوەستە بەو بوژانەوە زانستیەی کەوا بە شێوەیەکی گشتی لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا گەشەی کرد و لەسەردەمی خۆیدا بەشێوەیەکی تایبەت. سەردەمی ئەم خەلیفەیە بە پێشکەوتووترین سەردەمی زانستی دادەنرێ لە سەردەمی عەباسی یەکەمدا، چونکە ئاستی رۆشنبیری گەیشتە لوتکە، ئەوەش لەبەر چەندین هۆکار ئاشکرا ترینیان:

مەئمون هەرلە منداڵیەوە پەرۆشی خۆندنەوە بوو، بۆیە زانست و فیقە و مێژوو و فەرموودە و راڤەی قورئان و زمانی، خوێند، شەیدای زانست بووە و حەزی بووە زیاتری لێ بەرێ، رێگەی بەوتوێژە هزریەکان دا و خۆشی تیایدا بەشداری دەکرد، هەموو توانای خستەگەڕ و گشت رێگەیەکی گرتەبەر بۆ ئەوەی گەنجینە هزریەکان بدۆزێتەوە لە کتێبخانەکانی (قسطنطينية) و ( قبرص) ([2]).

– سەردەمی مەئمون بوژانەوەیەکی زانستی بە خۆوە بینی بەهۆی رووکردنی خەڵکی لە لێکۆڵینەوەی زانستی و زانیاریە دێرینەکان، زیاد بوونی ژمارەی زانایان لە شارەکاندا.

– پەرەسەندنی پەیوەندی لە نێوان دەوڵەتەکان، لەو کاتەدا، هەوڵی عەباسیەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاشتی سەرەرای ئاڵوگۆڕی بازرگانی، یارمەتیدەرێك بوو بۆ گەشەکردنی بزوتنەوەی (تەعریب – واتە وەرگێران بۆ سەر زمانی عەرەبی)، کەوا

---

[1] بۆ دەقی راسپاردەکە بگەرێوە بۆ لای – الطبري – ب٨ ، ٦٤٨ – ٦٤٩.

[2] ابن النديم :لا ٣٥٣-٣٥٤

گەیشتە لوتکە، ئەمەش کەشێکی گونجاوی هێنایە ئاراوە بۆ زانستخوازی.

- دەوڵەتی عەباسی هەر لەسەردەمی مەنسورەوە رێککەوتننامەیەکی مۆرکرد تایبەت بەکرینی کتێب و بەدەستهێنانی، رەنگە بەرزترین نرخی بدایە بۆ ئەم مەبەستە. ئەم دیاردەیەش لەسەردەمی مەئمون-دا زیادی کرد، ئەو بەردەوام پەیوەندی هەبوو بە (لیو) ئەرمەنی ئیمپراتۆری بێزەنتی، نێردە گەلێکی بۆ وڵاتی بێزەنتی نارد بەمەبەستی هەڵبژاردنی کتێبە زانستیە دێرینەکان کە لەوێ هەڵگیراو وپاشەکەوت کرابوو.

- بزوتنەوەی تەعریب وەکو بزوتنەوەیەکی تاکەکەسی نەمایەوە، بەڵکو بوو بەفەرمی و دەوڵەت خۆی بایەخی پێ ئەدا و هانی دەدا و یارمەتی دەدا و پارەی بۆ خەرج ئەکرد ([1]).

لەراستیدا وا بۆ مەئمون رێککەوت خزمەتی رۆشنبیرییەتی ئیسلامی بکات لەمیانەی ژیانی سیاسی ئەوەش لە رێگەی گرنگی کەسی خۆی بەکۆکردنەوەی کەلتووری نەتەوە دێرینەکان، بە تایبەتی کەلتووری یۆنانی کەوا زۆر حەزی لێ بوو. بۆیە نێردە گەلێکی زانستی نارد بەمەبەستی گەران بۆ کتێبە یۆنانیەکاندا و گواستنەوەی بۆ (بیت الحکمە - خانەی حیکمەت) کەوا لە ساڵی (٢١٥ك /٨٣٠ز)دایمەزراند. ئەم خانەیە وەکو پەیمانگایەکی زانستی وایە، کتێبخانەیەك لەخۆ دەگرێ بۆ چاپکردنی کتێبە بیانیەکان، خانوویەك بۆ وەرگێرانی بۆ سەر زمانی عەرەبی و خوێندنەوەی و روانگەیەکی فەلەکی لە خۆدەگرێت هەروەها مەئمون کۆمەڵێ وەرگێری دانا و مووچەی بۆ برینەوە لە (بیت المال). بۆیە ئەم خانەیە، کەلتووری رۆشنبیریەتی ئیسلامی لە گەل کەلتووری رۆشنبیریەتی بیانی کۆکردەوە.

هێزی ئیسلامی لەسەردەمی مەئمون-دا بەسێ سەرچاوە کاریگەر بوو. بە رۆشنبیریەتی ئەغریقی و هیلینی لە شێوە و ناوەرۆکەوە. لە رووی شێوەوە، ئەوا (منطق- ژیربێژ)ی یۆنانی کۆمەڵی دارشتنی لە مشتومر و لێکۆڵینەوە و دەربرین و

---

[1] محمود و الشریف : ل ٢٧١- ٢٧٢

ئاماژە کردنی بە هزری ئیسلامی بەخشی. بۆیە شێوازی قسەکەران بەو داڕشتنانە کاریگەربوو بە تایبەتی (منطق– ژیربێژ)ی ئەرستۆ.

لە رووی ناوەڕۆکەوە، ئەوا کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە رێنمایی کردنی قسەکەران، بیری ئەفلاتونی نوێ کاریگەری هەبوو لە سەر سۆفی گەرێتی ( [1] ).

هەروەها هزری ئیسلامی، کاریگەری رۆشنبیریەتی هندی–شی لەسەر بوو ئەوەش لە رێگەی شالاوە سەربازیەکان و بازرگانیەوە. بە بڵاو بوونەوەی هندیەکان لە وڵاتە جیاجیاکانی ئیسلامدا، بیرۆکەکانیشان بڵاویوەوە، هەروەها هەندی بیرۆکەی هندی لەڕێگەی فارسەکانەوە تەشەنەی کرد. کاریگەری هندی گەیشتە (الهیات – خواناسی) و وتارە ئەدەبیەکان و بیرکاری و گەردوون ناسی ( [2] ). وادیارە ئەو کاریگەری یە قووڵەی کە رۆشنبیریەتی هندی بەجێیهێشت زیاتر لەسەر بیرکاری و گەردووناسی بووە. ئەوە بوو (موحەممەدی خەوارزمی) هەستا بەپوختکردنەوەی کتێبی گەردووناسی هندی (سرهنتا) کە لەلایەن (ئیبراهیمی فەزاری)یەوە وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبی، بۆ خەلیفە مەئمون، رەنگە ئەم کتێبە ئەو هۆکارە بووە کە لە رێگەیەوە ژمارە عەرەبیەکان و سیفر لە وڵاتی هندەوە بەوڵاتی ئیسلام گەیشتووە.

لەساڵی (١٩٨ك/٨١٤ز) خەوارزمی ژمارە هندیەکانی لەخشتەی بیرکاری بەکارهێنا، پاشان لەساڵی (٢١٠ ك/٨٢٥ز) نامەیەکی بڵاو کردەوە بەناوی ((خەوارزمی لە ژمارە هندیەکانیەوە)).( [3] ).

هەروەها رۆشنبیریەتی فارسیش کاریگەری هەبوو لەسەر زمانی عەرەبی و و ئەدەبی عەرەبی بەشێوەیەکی تایبەت. چونکە وشە گەلێکی فارسی چۆتەناو ئەم زمانەو کتێبی فارسیش لەبارەی ئەستێرەناسی و ئەندازیاری و جوگرافیاو ئەدەب و مێژووەوە، کراوە بە عەرەبی ( [4] ).

---

[1] امین، احمد : ضحي الاسلام ب ١ لا ٢٧٧

[2] محمود و الشريف :لا ٢٧٧

[3] عمران، محمود :محاضرات في معالم التاريخ الاسلامي الوسيط : [illegible] ٢٤٢

[4] محمودو الشريف : لا ٢٧٨ –٢٧٩.

وەرگێڕەکان لەسەردەمی مەئمون–دا خەریکی بە عەرەبی کردنی کتێبە گەورەکانی زمانی سنسکریتی و فەهلەوی و یۆنانی و سریانی بوون. لەوانەی کە ناویان دەرکەوت لەخانەی حیکمەتدا، حەنینی کوڕی ئیسحاق بوو. ناوبراو زۆر لەبەرهەمەکانی جالینۆس و ئەرستۆ و ئەفلاتۆن وئەبقرات و بتلیمۆس–ی کرد بە عەرەبی، بەرامبەر ئەم کارەش مەئمون خەلاتی کرد و بەکێشی ئەو کتێبانەی وەریگێڕابوو زێڕی پێبەخشی([1])، ئەوجا ئیسحاقی کوڕی کاری وەرگێڕانی کرد، ئەوەبوو هەندێ بەرهەمی ئەرستۆ وهەموو بەرهەمە فەلسەفی و پزیشکیەکانی جالینۆسی کرد بە عەرەبی، لەگەڵ ژمارەیەك لە زانایان بەشداری کرد لە دانانی شافەرهەنگێکی جوگرافی بۆ خەلیفە ([2]).

هەروەها مەئمون کۆمەڵێ لە گەردوون ناسەکانی بەکارهێنا بۆ تێبینی کردنی تەنە ئاسمانیەکان و تۆمارکردنی ئەنجامی ئەم تێبینیە، بۆ ئەوەی دۆزینەوەکانی بتلیمۆس بەدی بهێنن و خۆرگیران بخوێنن.([3]).

ئابەم شێوەیە هەموو ئەو کەلتوورە زانستیە گەورەیەی کە زانایانی یۆنان بە جێیانهێشت، گوێزرایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی..

## پەیوەندییە دەرەکیەکان لە سەردەمی (مەئمون)دا

### پەیوەندی لەگەڵ (بێزەنتی)یەکاندا

خەریك بوو لە سەردەمی مەئموندا جەنگ لە نێوان موسڵمانەکان وبێزەنتیەکاندا هەڵگیرسێ. ئەوە بوو ئەم خەلیفەیە سەرقاڵی ئەوە بوو کۆتایی بە ململانێی نێوان خۆی و ئەمینی برای بێنێ، ئەمەش دەرفەتێکی بەدەوڵەتی ماندووی بێزەنتی دا، هەناسە هەڵکێشێ.

بۆیە، بەرەی ئیسلامی – بێزەنتی ئارامیەکی نیمچە تەواوی بەخۆوە بینی جگە لە

---

[1] عمران :لا ٢٤٢.
[2] سەرچاوەی پێشوو: لا ٢٤٤.
[3] سەرچاوەی پێشوو.

چەند حالەتێکی کەمدا. ئەم رەوشە نیمچە ئارامە تاوەکو سالی (٢٠٥ك/٨٢٠ن)بەردەوام بوو، ئەوجا جموجولی سەربازی لەسەردەمی ئیمپراتۆر میخائیلی دووهەم، تارادەیەك، دەستی پێکردوە. ئەوە بوو هەریەك لە مەئمون و میخائیل ئەم ئاژاوە و شۆڕشانەیانە بۆ قایمکردنی هەڵویستی خۆی قۆستەوە. مەئمون رێککەوتنێکی لەگەڵ تۆماس-ی (صقلبی) مۆرکرد کەوا سەرکردایەتی شۆڕشێکی چەکداری کرد دژی رژێمی بێزەنتی، هاوکات میخائیل دانوستانی لە گەل خورەمێکاندا کرد کەوا دژی مەئمون راپەڕین.

لەراستیدا هەڵمەتە چالاکەکانی ئیسلام بۆ سەر خاکی بێزەنتی لەسالی (٢١٥ك/٨٣٠ ن) دەستپێکردەوە وەکو بەرپەرچدانەوەیەك لە سەر ئەو هێرشەی کەوا (پیوفل)ی ئیمپراتۆر بە پالپشتی هێزی خورەمی دژی (زبطرة)، کردی ([1]).
مەئمون و عەباسی کوڕی چەندین هەڵمەتی سەربازییان برد و توانیان چەندین قەلا لەناوچەی کبادوکیا بگرن ([2])
و هرقلە و لوئلوئە-شیان هینایەوە ([3]).

مەرگی مەئمون

مەئمون پێش مردنی خیلافەتی بە (المعتصم)ی برای راسپارد پاش ئەوەی قاسمی برای لابرد و عەباسی کوڕی پەڕاند. دوانزە شەوی مابوو لە (مانگی رەجەب سالی ٢١٨ك /مانگی ئاب سالی ٨٣٣ن) لە (بدندون) لەکاتی هێرش بردنی بۆ سەر ولاتی بێزەنتیدا کۆچی دوایی کرد، بردیان بۆ (طرسوس) و لەوێ ناشتیان. موسلمانەکانیش ناچار بوون شوێنەکەیان کە لە دوای چیاکانی تۆرۆس-ەوە بوو، چۆل بکەن ([4]).

---

[1] العريني الدولة البيزنطية :لا ٢٧٩.
[2] الطبري :ب ٨ لا ٦٢٣-٦٢٤.
[3] هەمان سەرچاوە :لا ٦٢٩ فازيلييف : العرب و الروم لا ١٠٧ – ١٠٨ – ١١١
[4] سەرچاوەی پێشوو :لا ٦٥٠.

## بەندی شەشەم

## موحەممەدی (المعتصم) – هارونی (الواثق)

### ئەبو ئیسحاق موحەممەدی (المعتصم) ٢١٨-٢٢٧ک/ ٨٣٣- ٨٤١ز

#### ناساندنی (المعتصم)

میری بڕواداران، ئەبو ئیسحاق موحەممەدی (المعتصم)، کوڕی هارون ڕەشیدی کوڕی مەهدی کوڕی مەنسوری عەباسیە، پێی دەوترێ (المیمن – هەشتەمین) چونکە هەشتەمین کوڕە لە کوڕەکانی عەباس و هەشتەمین خەلیفەیە لە نەوەکەی، هەروەها توانیویەتی هەشت جار فەتح بکات، هەشت ساڵ و هەشت مانگ و هەشت ڕۆژ لەخیلافەتدا مایەوە، لەساڵی سەد و هەشتا لەمانگی شەعبان لە دایکبووە ئەمەش لەساڵدا مانگی هەشتەمە، کە کۆچی دوایشی کرد تەمەنی چل و هەشت ساڵ بوو، هەشت کوڕو هەشت کچی خستۆتەوە. ئەو نەخوێندەوار بووە و نوسینی باش نەزانیوە، بەڵام وا باس دەکرێ کە سەربازێکی ئازا بووە، ڕاهێنراو لەسەر جەنگ، هەروەها باسی بەهێزی لەشیشی دەکەن ([1]).ئەو ڕۆژەی کە مەئمونی برای لە (طرسوس) مرد، بەیعەتی پێ درا بۆ خیلافەت. هەندێ میر هەوڵیاندا عەباسی کوڕی مەئمون بکەن بەخەلیفە، بەڵام عەباس خێرا بەیعەتی دا بە مامی وەکو ڕێزێک بۆ ڕاسپاردەی باوکی و هێور کردنەوەیەک بۆ سەربازەکان ([2]).

(المعتصم) زۆردارانە حوکمڕانی دەوڵەتی عەباسی کرد، لەگەڵ کەمێک سۆزو بەزەیی نواندن و پلانی باشدا، ئەو ناسراوبوو بە ئازایەتی و دەستپێشخەری، زەبر وزەنگی و بەسامی. خولیای بیناسازی و کشتوکاڵی بوو و کاتی خۆی بۆ دروستکردنی تەلار و نەخشەسازی باخچەو بێستانەکان، تەرخان کرد.

---

[1] ابن کثیر : ب ١٠ لا ٢٩٥ – ٢٩٦.

[2] الیعقوبی: ب ٢ لا ٤٢٠.

## ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی (المعتصم)دا

### بزوتنەوەی (طالبي) یەکان

سیاسەتی (المعتصم) بەرامبەر بە (طالبي)یەکان لەسیاسەتی خەلیفە عەباسیەکان – کەوا پێش ئەم حوکمڕانیان کردووە – نەرم و نیاتر نەبوو، جگە لە مەئمون. ئەوە بوو لە ساڵی (٢١٩ك/٨٣٤ز) موحەممەدی کوڕی ئەلقاسمی کوڕی عەلی ئەلزەیدی لە (طالقان) سەری هەڵدا، خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچەی خۆراسان شوێنی کەوتن ([1]).

بەڵام بزوتنەوەکەی ڕێکخراو نەبوو و مەترسیەکی ڕاستەقینەی نەبوو لەسەر دەسەڵاتی (المعتصم)، کەوا فەرمانی بە عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر دا – میری خۆراسان– بەرەنگاری ببێتەوە، ئەم سەرکردەیەش توانی بیشکێنێ و دەستگیری بکات، ناردی بۆ سامەرا و لەوێ خرایە زیندانەوە، بەڵام بەهاوکاری کۆمەڵێ پیاو لە گروپەکەی هەڵهات، لەسەردەمی (المعتصم و الوپق)دا خۆی شاردەوە و لەسەردەمی (المتوکل) گیرا و زیندان کرا، لە ناو زینداندا، مرد ([2]).

وادیارە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ئەم بزوتنەوەیە، وێڕای بڵاو بوونەوەشی، دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار:

– بەهێزی دەوڵەتی عەباسی لەسەردەمی (المعتصم)دا.

– بڕوابوونی موحەممەدی کوڕی ئەلقاسم بە بۆچوونی زەیدی و جارودیەکان([3]) ئەمەش بەدڵی زۆر لە زەیدیەکان نەبوو، بە تایبەتی زەیدیەکانی کوفە، سەرەڕای ڕقبوونی شیعە ئیمامیەکان لە شیعە زەیدیەکان ئەوانەی کەوا شوێنکەوتووی ئەبو جارود بوون.

---

[1] المسعودي : ب ٣ لا ٤٦٤– ٤٦٥.

[2] الاصفهاني : لا ٤٧٢.

[3] (جارودی): گروپێکی ئیسلامیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەبو جارود. بڕوایان وایە پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) ئاماژەی کردوە ئیمامەت بدرێتە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ئەوەش لەمیانەی باسکردنی سیفاتەکانی بێ ئەوەی ناوی بهێنێ. بگەڕێوە بۆ – الشهرستاني – ب ١ لا ١٥٧–١٥٨.

- بڕوابوونی موحەممەدی کوڕی ئەلقاسم بە بۆچوونی موعتەزیلەکان ([1]).

لەسەردەمی (المعتصم)دا لەساڵی (٢٢٠ك/٨٣٥ز) موحەممەدی کوڕی (علی الرضا)، نۆهەمین ئیمامی شیعەی دوانزە ئیمامی، کۆچی دوایی کرد. (المعتصم) بەم مردنە دڵنەوا بوو، چونکە لەوە دەترسا رکابەرێتی بکات لەسەر دەسەڵات و دوای خیلافەتی لێ بکات، لەسەر بنەمای ئەوەی کە کوڕەکانی لە وەچەی مەئموون-دان لە (أم الفضل)ی هاوسەری.

## بزوتنەوەی (زط)

لەو ئاستەنگانەی کە توشی (المعتصم) بوو و بارشانی قورس کرد لەماوەی خیلافەتەکەیدا، بزوتنەوەی (زط) بوو، کەوا توانیان رێگەی بەسرە کۆنترۆڵ بکەن و هەڕەشە لە دامودەزگاکانی دەوڵەت بکەن، گومرگیان سەپاندە سەر کەشتیەکاندا و هەوڵیاندا نەهێڵن دەستی یارمەتی بگاتە بەغداد، بۆیە لەساڵی (٢١٩ك/٨٣٤ز) (عوجەیفی کوڕی عونبس)ی نارد بۆ ئەوەی بەرپەرچیان بداتەوە لە (البطیحة)، ئەوە بوو تەنگی پێ هەڵچنین و ئەوانیش داوای ئەمانیان کرد، خەلیفەش دەربەدەری کردن بۆ (عین زربە) ([2]).

## لەناوبردنی بزوتنەوەی بابەك

(المعتصم) جێی متمانە بوو، ئەوە بوو جەنگی هەڵگیرساند دژی بابەکیەکان تا لەساڵی (٢٢٣ك/٨٣٨ز) لەناوی بردن. ئەوەبوو لەپاش سەقامگیر بوونی رەوشی ناوخۆ، جەختی کردەوە لەسەر جەنگاندنی بابەك و شاڵاو لەدوای شاڵاوی بۆ دەناردن. لەلایەکی ترەوە مەترسی بابەك گەورەتر بوو پاش ئەوەی (ئازەربێنجان)یش چووە ژێر دەسەڵاتی، ترس باڵی کێشا بە سەر ئەو ناوچەیە کە تا ئێران درێژ بۆتەوە. تاوەکو یەکێك لەتیمە عەباسیەکان بەسەرکردایەتی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسعەب

---

[1] اللیثي : ٢٧٦-٢٨٧.

[2] الطبري : ب ٩ ل ٨-٩.

لەساڵی (٢١٨ك/٨٣٣ن) توانی شوێنکەوتووانی لە ئێران لە ناوبەرێ ([1]).

لەساڵی (٢٢٠ك/٨٣٥ن) (المعتصم) هەستا بەدامەزراندنی مەزنترین سەرکردەی خۆی کە ناوی (ئەفشین)ە، حەیدەری کوڕی کاوس، وەکو میرێك لەسەر شاخەکان ([2]) و فەرمانی پێدا بجەنگێ لەگەڵ بابەك –دا. ئەم سەرکردەیە ناسرا بەوەی کە زۆر وریایە، شارەزا لە ڕێڕەوە شاخاویەکاندا. ئەو پلانێکی سەربازی پەیڕەوکرد کە لەسەر – بەرەوپێشچوونی هێواش – هەستابوو. لە (برزند) لە دەورووبەری (تەفلیس) دەواری هەڵدا، قەڵاکان و ڕێگەکانی نێوان خۆی و ئەردەبیل کۆنترۆڵ کرد و سەربازەکانی بەسەر قەڵا و شوێنی جیاجیادا دابەشکرد.([3]). (المعتصم)یش بەردەوام کۆمەکی دەکرد و ئازوخەی بۆ ڕەوانە دەکرد و خەرجی سەربازەکانی بۆ دەنارد. پۆستەشی (برید) ڕێکخست، ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی هاتوچۆ و پەیوەندی کردن بە خێرایی و دڵنیایی مسۆگەر بکات، وای لێهات نامە گۆڕین لە نێوان سامەرا و سەربازگەی ئەفشین ماوەی چوار ڕۆژ یاخود کەمتری پێ دەچوو ([4])، هەروەها (بۆ یەکەم جار لەم جەنگەدا) کۆتری نامەبەر بۆ گەیاندنی هەواڵەکان بەکارهێنرا ([5]) وە بە خۆی لە (سامەرا)وە سەرپەرشتی شەڕەکانی دەکرد و نەخشەی سەربازی دائەنا. بەوەش موسڵمانەکان بوونە خاوەن زنجیرە قەڵایەکی سفت و سۆڵ بە ڕووی بابەك.

ئەفشین پەنای بردەبەر شێوازی سیخوڕێتی بۆ ئەوەی دوژمنەکەی لاوازبکات و بە پلانەکانی ئاشنابێت. ئەوە بوو هەر سیخوڕێکی ئەوانی چنگ بکەوتبایە، ڕاکێشی دەکرد بۆ لای خۆی و پارەی زیاتری پێ دەبەخشی و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری دەهێنا ([6]).

---

[1] هەمان سەرچاوە :ب ٨ لا ٦٦٧-٦٦٨.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو : ب ٩ لا ١١.

[3] هەمان سەرچاوە : لا ١١ – ١٢.

[4] الطبري, شێوازی گواستنەوەی یارمەتیەکان لە نێوان سامەرا و برزند –شوێنی سەربازگەی ئەفشین– دەستنیشان دەکات : هەمان سەرچاوەی پێشوو : ب ٩ لا ١٢-١٣.

[5] الدوري :لا ١٨٥.

[6] الطبري : ب ٩، لا ١٣.

❋ ڤازیلییف: لا ١٤٢. Bury: p.cit.p ٢٥٩

بابەك دەستبەجێ هەستی بەوە کرد کە ئەم جارە روبەڕوی سەرکردەیەکی ژیر و چاوکراوە بۆتەوە، بۆ ئەوەی فشار لەسەر هێزەکانی لە ئازەربێنجان کەم بکاتەوە، داوای لە (پیوفل)ی ئیمپراتۆری بێزەنتی کرد هێرش بکاتە سەر خاکی ئیسلام، بەڵێنی پێدا بێتەناو ئاینی گاورەوە.(❀)

لە ئەنجامی ئەم خەشم و قینە (و ئەم ئامادە سەربازیە) دەبێ پێکدادن لە نێوان هەردوولا رووی بدایە، ئەوە بوو خەلیفە فەرمانی بە ئەفشین کرد کاری سەربازی دەستپێبکات و شاری (بذ)ی وەکو یەکەم ئامانجی سەربازی بۆ دیاری کرد، پاش ئەوەی لە ئاکامی شەڕی (ئەرشەق)دا ([1]) بابەك ناچار بوو خۆیی تیا حەشار بدات.

ئەفشین پەلەی نەکرد لە رۆیشتنی بەرەو (بذ)، بەڵکو لەسەر خۆی بۆی چوو تا گەیشتە لای و گەمارۆیەکی توند و تۆڵیدا و شاری (روذ الروذ)ی کرد بە سەربازگەیەکی نوێ بۆ هێزەکانی. ئالەم کاتەدا بابەك هەوڵی دا بۆ لای خۆی رایکێشێ بەلام سەرنەکەوت. ئەفشین بەردەوام بوو لە گەمارۆدانی (بذ) تا لە رۆژی هەینی لە (دەی مانگی رەمەزان ساڵی٢٢٢ ك/مانگی ئاب ساڵی ٨٢٧ز) توانی بچێتە ناوی ([2]).

لەپاش روخاندنی (بذ)، بابەك بۆ ئەرمینیا هەڵهات، ئەفشین-یش بۆ شا و میرەکانی نووسی رێگەی لێ بگرن. سەرچاوەکان وا باس دەکەن کە (بەتریق -سەهلی کوڕی -سنباط) شوێنی خۆشاردنەوەی زانی و دڵنیای کردەوە پاشان غەدری لێ کرد و رادەستی ئەفشینی کرد ([3]).

لە (مانگی سەفەر ساڵی ٢٢٣ك/مانگی کانونی دووهەم ساڵی ٨٣٨ز) (بابەك)یان هێنا بۆ سامەرا لەگەڵ عەبدوڵڵای برایدا.جا رۆژی گەیشتنی رۆژێکی بیرنەچوو بوو. ئەوە بوو سەربازەکان جلە ئەرخەوانیەکەیان لەبەری کرد و خستیانە سەر پشتی فیلێك و بەشەقامەکاندا گەڕاندیان. کە گەیشتە شوێنی دانیشتنی خەلیفە جلەکەیان

---

[1] سەبارەت بە شەڕی ئەرشەق بگەڕێوە بۆ - الطبري - : ب ٩ ل ١٢- ١٧.

[2] هەمان سەرچاوە پێشوو:ل ٣١-٤٥.

[3] هەمان سەرچاوە :ل ٤٥-٥١.

داکەنـد، پاشـــان هـــەردوو دەســـت و قاچـــیان بـــڕی و دەســـتیانکردە چـــەقاندنی شمشێرەکانیان بە لەشیدا بەهێواشی، بێ ئەوەی بیکوژن تا زیاتر ئازار و ئەشکەنجە بچێژێ. لە کۆتاییدا سەریان بڕی، خەلیفەش ناردی بۆ بەغداد و پیشان خەڵك درا، لەکاتێکدا تەرمەکەی لە خاچ درا و لە سامەرا خرایە روو. عەبدوڵلای براشی لەگەڵیا لەخاچ درا([1]). بەمەش ئەم بزوتنەوەیە کەوا خیلافەتی لە سەردەمی مەئموندا بەخۆی خەریك کردبوو، کۆتایی پێهات.

## بزوتنەوەی مازیار

هێشتا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەمەترسی بزوتنەوەی خوڕەمی رزگاری نەبوو بوو لەو ناوچانەی کە دەکەونە رۆژئاوای دەریای قەزوین، بزوتنەوەیەکی دیکەی فارسی روبەڕوی بووەوە، کە بریتی بوو لە بزوتنەوەی مازیاری کوڕی قارن، دواین میری قاریانیەکان لە (گبرستان)، کەوا نیشتیمانی خۆی کرد بە گۆڕەپانێك بۆ چالاکیە شۆڕشیەکانی دژی دەوڵەت.

مازیار هاتەناو ئیسلامەوە و ناوی موحەممەدی لەخۆی نا و مەئمون-یش کردی بە فەرمانڕەوا لەسەر (طبرستان) و (رویان) و (دنباوند) و نازناوی (أصبهذ)ی لێنا([2]).

وادیارە ئەو کابرایە هەستی سەربەخۆیی هەبووە، ویستی لە جەستەی دەوڵەت جیا بێتەوە. بۆیە، دوژمنایەتی نێوان تاهیریەکان کەوا رقی لێیانە، لە نێوان ئەفشین کە تەماحی ویلایەتی خۆراسانی کردبوو، قۆستەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئالای شۆڕش. جا ئەفشین نامەی بۆ مازیار ناردبوو هانی دەدا یاخی بوونی خۆی لە دەسەلاتەکەیان راگەیەنێ، بە هێوای ئەوەی ئەمان نەتوانن ملکەچی بکەن، ئەو کاتەش، ئەمە دەکاتە بەهانەیەك بۆ ئەوەی خۆراسانیان لێ بگەڕینێتەوە ([3]).

---

[1] الطبری : ب ٩ ل٢٧ ,٥٥.

[2] الیعقوبي: ب ٢ل ٤٣٧، ٤٣٨.

[3] المسعودي :ب ٣ ل ٤٧٣. الطبری : ب ٩ ل ٨٠.

بەلام پەیوەندی نێوان ئەفشین و مازیار بەو سادە وساکاریە نەبوو، بەلکو پەیوەندییەکی قووڵ و رەگ و ریشەی داکوترا کۆیانی دەکردەوە. ئەوە بوو مازیار دانی بەوە نا کە ئەفشین هانی داوە بۆ یاخی بوون و رێککەوتن لەسەر ئاینێك کە لە مەزهەبەکانی (ثنویة) و ئاگر پەرستی پێکهاتبوو([1]) هەروەها مازیار نوسراوی بۆ بابەك-یش دەنارد و هاریکاریکردنی بۆ دەخستەروو ([2]) وادیارە ئەو لەسەر مەزهەبی خورەمی بووە، ئەو مەزهەبەی کە وای لێهات شۆڕشی هۆشیاری فارسی دەنواند دژی دەسەلاتی عەباسیەکان و دژی ئەو کۆمەلگەیەی کە دایانمەزراند ([3])، ئەو پالنەرانەی کە بابەکی جولاند هەر خۆیەتی هانی ئەمی دا یاخی بێ، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە ئەو تازە چۆتە ناو ئیسلامەوە، واتە ئەم پالنەرانە تێکەلەیەك بوو لەپالنەری سیاسی و رەگەزپەرستی و ئاینی ([4]).

ئەو کارانەی کە مازیار ئەنجامی دا لەپاش راگەیاندنی بزوتنەوەکەی، مۆرکی خورەمی هاوبەشی پێوە دیار بوو. چونکە ئەو ویستی دەست بەسەر زەوی و زاری مولکدارەکان بگرێ و بەسەر جوتیارەکاندا دابەشی بکات ([5]) ئەم کارەش مانایەکی سیاسی هەیە لە تەنیشت مانا ئابوورییەکەی، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە بەشێکی زۆری خاوەن زەوییەکان عەرەب و مەوالیەکانیان بوون، بۆیە مازیار فەرمانی دا بە کاربەدەستەکەی لەسرخستان ([6]) دووسەد و شەست کەس لە کوڕی سەرکردەکان کۆبکاتەوە و رادەستی جوتیارەکانی بکات بۆ ئەوەی بیانکوژن بەو پێیەی کە خەلکێکی مەترسیدارن، هەروەها هەلیخەلەتاندن بەکوشتنی خاوەن کێلگەکان و دەستگرتن بەسەر ژن و مالیاندا، لە هەولێکدا بۆ ئەوەی هێزی چینی هەژار بخاتە پال

---

[1] المسعودي : ب ٣لا ٤٧٣.
[2] الطبری : ب ٩ لا ٨١.
[3] الدوري : لا١٨٨.
[4] العمرو: لا ٣٦٠.
[5] الطبري : ب ٩ لا ٨١.
[6] سەبارەت بەم ناوانە بگەڕێوە بۆ : هەمان سەر چاوە : لا ٨١-٨٩، ٨٤-٩٣

خۆی و هانیان بدات بۆ رزگار بوون له دەسەڵاتی عەرەبی ([1])

خەلیفە ئامانجی ئەم شۆرشەی بۆ دەرکەوت، کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر، نامەیەکی ئەفشین بۆ مازیاری گرت و پاش ئەوەی کە خۆی چەندین نامەی تری دەسکەوت لەخودی مازیارەوە(٦).

ئەوەی راستی بێ ئەم بزوتنەوەیە بە مردوویەتی لەدایك بوو! ئەوەش چونکە کاتی راگەیاندنی، لەساڵی (٢٢٤ك/٨٣٩ز)، گونجاو نەبوو. دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەو کاتەدا بارودۆخی ئارام بوو، لە لوتکەی بەهێزیدا بوو، ئەوەش پاش ئەوەی چەندین بزوتنەوەی بەرهەڵستکاری لەناوبرد، بۆیە لەناوبردنی بزوتنەوەی مازیار زۆر ماندووی نەکرد([2]).

سەبارەت بە کۆتایی مازیار، ئەوا لە کۆتایی بابەك دەچوو، خەلیفە کوشتی و لە تەنیشت بابەك لەخاچی دا. ([3]).

## دەرکەوتنی رەگەزی تورکی

لەسایەی بارودۆخێکی پڕ لە ململانێ لە نێوان عەرەبەکاندا لەلایەکەوە و فارسەکان کەوا مەئمون لە ساڵانی یەکەم لە خیلافەتەکەیدا بەسۆز بوو لەگەڵیاندا لەلایەکی دیکەوە، تێکچوونی هاوسەنگی لە نێوان ئەو رەگەزانەی کە دەوڵەتی عەباسی لێی پێکهاتبوو. بەیعەت بە (المعتصم) درا بۆ خیلافەت.

ئەوەبوو لەو ساتەی مەئمون لە (مرو) دەرچوو، پەیوەندی نێوان عەباسیەکان و خۆراسانیەکان تێکچوو. شوێنەواری ئەوەش، لە لەناوبردنی بنەماڵەی سەهل -کە پێشینەیەکی فارسیان هەیە- و راپەڕینی بزوتنەوەکانی دژ بەدەوڵەت، دەرکەوت، بۆیە، ئەستەم بوو ئاواتی خۆراسانیەکان و بەرژەوەندی عەباسیەکان لەگەڵ یەکدا بگونجێ. ومتمانەی (المعتصم) بە فارسەکان بەرەو لاوازی دەچوو. لەلایەکی دیکەوە،

---

[1] سەر چاوەی پێشوو : ل٨٦، ٨٧.

[2] العمرو : ل ٣٦٠، ٣٦١.

[3] الیعقوبی : ب ٢ ل ٤٣٨.

(المعتصم) پشتی به ڕەگەزی عەرەبی نەبەست و متمانەی بە عەرەب نەبوو، بەهۆی زۆر هەڵگەڕانەوەیان و ئاژاوە نانەوەیان و ڕاپەڕینیان دژی خەلیفەکان، سەرەڕای ئەوەی کە زۆر لە بنەماکانی هێزی سیاسی و سەربازیان لە دەستدابوو، بۆیە مەترسیان کەمتر بووەوە و ڕۆڵیان لاواز بووەوە.

ئەم دەرئەنجامانە وای لە(المعتصم) کرد پاسەوانی خۆی بە گروپێك لە ڕەگەزی تورکی بسپێرێ، جێی باسە کە خوڕەوشتی و سیفاتی جەستەی لە قایمی و ئازایەتی و پتەویدا هاوشێوەی خاڵە تورکەکانی بوو، کە نەتەوەیەکی توندو تیژو جەنگاوەرو زەبرو زەنگن. وای لێهات ڕەگەزی تورکی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی، هەرچەندە تورکەکان خاوەن شارستانیەتێکی دێرین نەبوون. پاسەوانی تورکی بووە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی خیلافەت لە ڕۆژانی حوکمڕانی ئەمدا.

لەڕاستیدا تورکەکان، لەسەردەمی ئەمەویدا لەئەنجامی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی ئیسلامی بۆ وڵاتی دوای ڕوبار هاتنەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە، بەلام هیچ کاریگەریەکی سیاسیان لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەبوو. بەلام ئەوان، لەوکاتەی کە چوونە ناو جەرگەی ژیانی ئیسلامیەوە لە سەردەمی عەباسیدا ژمارەیان بەرە بەرە زیادی دەکرد و بە ڕوونی لە گۆڕەپانی ڕووداوەکاندا لە بەغداد دەرکەوتن لەسەردەمی مەئموندا کەوا لەناو سوپادا بەکاری هێنان بۆ ئەوەی جۆرە هاوسەنگیەك بەدی بێنێ لە نێوان هەردوو ڕەگەزی عەرەب و فارس.

(المعتصم) ئەم کۆمەڵە دەمارگیرە تازە گەشە کردووەی لەخۆگرت تا بەهرە سەربازییەکانیان بە کاربهێنێ بۆ پاراستنی دەوڵەتەکەی و مانەوەی خیلافەتەکەی، لە سایەی ململانێی عەرەبی ـ فارسیدا.

بۆیە بەشێوەیەکی بەرفراوان تورکەکانی لەسوپادا بەکارهێنا و خستنیە ژێر فەرمانی سەرکردەکانی خۆیان، بەمەش لێدانێکی توندی ئاراستەی سەرکردە و سەربازەکانی عەرەب و سیاسەتی تەقلیدی مەنسور کرد کەوا دەبویست لە سوپادا

هاوسەنگی لە نێوان گروپە عەجەمەکان و گروپە عەرەبەکان بپارێزی ([1])، سەبارەت بە سەرچاوەی ئەم تورکانە، ئەوا (المعتصم) لەهەرێمەکانی دوای رووبار هێنایانی، وەکو سەمەرقەند و فرغانە و ئەشروسنە و شاش و خەوارزم، ئەمەش لەرێگەی کڕینیان، یان لەرێگەی دیلگرتنیان لەجەنگەکاندا، یان لە رێگەی ئەو دیارییانەی کە فەرمانڕەوای ئەم هەرێمانە بەشێوەی کۆیلە بەخەلیفەکان پێشکەشیان دەکرد. پاشان وای لێهات ولاتی دوای رووبار بووە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ کۆیلەی تورك([2])

(المعتصم)، تورکەکانی لەولات جێگیرکرد، لەخۆی نزیکی کردنەوە، بە دەسەلات تایبەتی کردن، سەرکردایەتی سوپاکانی پێ سپاردن، لە بواری سیاسەتدا پلەو پایەی بۆ دانان، لە سامەرا نیشتەجێی کردن کە تایبەت بۆ ئەوان دروستی کرد بوو. لەلایەکی دیکەوە، عەرەبی بێبەش کرد لە سەرکردایەتی کردنی سوپاکان، لە دیوانەکان ناوی سڕینەوە و بە خشینیشی لێ بڕین.

ئەم سیاسەتەی (المعتصم) دا، ئەنجامی هەنووکەیی و دووریشی هەبوو.

لەرووی ئەنجامە هەنووکەییەکانەوە، ئەوا ئەم سیاسەتمەدارانی عەرەبی تووڕەکرد، دژی دەسەلاتی (المعتصم) راپەڕین، هەروەها بە رابەرێتی (عوجەیفی کوڕی عونبس) و (ئەلعەباسی کوڕی مەئمون)، پلانیان دانا بۆ تیرۆرکردنی، بەلام پلانەکەیان سەری نەگرت.

کاردانەوەی (المعتصم) یش ئەوە بوو ئەلعەباسی لە ناوبرد هاوکات عوجەیف کۆچی دوایی کرد، پاشان وردە وردە عەرەب و فارسەکانیشی دوورخستەوە و لە پێدانی بەخشیندا ناوی سڕینەوە([3]).

لەرووی ئەنجامە دوورەکانیەوە، ئەوا ئەم سیاسەتە بووە هۆی زەرەرو زیانێکی زۆر و مەترسیدار بۆ دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، چونکە لە رێبازی عەرەبی - فارسی، دەرچوو، بۆیە دەسەلاتی خەلیفەی لاواز کردەوە، رەنگە پەیدا بوونی دەوڵەت گەلێکی

---

[1] الدوري : ل١٧٧-١٧٨.

[2] العبادي : ل١١٧.

[3] اليعقوبي : ب ٢ ل ٤٣٧.

جیاخواز لەسەر تاپای دەوڵەت لەسەردەمی عەباسی دووهەمدا، یەکێك بوو بێت لەم ئەنجامانە، بەڵام لە سەردەمی (المعتصم) بە روونی دەرنەکەوت، لەپاشتر روون دەبێتەوە، لە کوشینی ئەلموتەوەکلەوە لە ساڵی (٢٤٧ك/٨٦١ن).

## لەناوبردنی ئەفشین

هەندێ لە سەرکردە تورکەکانی دەوڵەتی عەباسیدا، پۆستەکانیان و دەسەڵاتیان لەناو دەوڵەتدا بۆ هێنانە دیی ئاواتەکانیان بەجیا بوونەوە لەدەوڵەت، قۆستەوە. لەو سەرکردانەی کە مەیلی سەربەخۆیی هەبوو، سەرکردەی تورکی ئەفشین، کەوا ویستی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنێ لە (ئەشروسنە)، بۆیە کەوتە رێخۆشکردن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی بەم هەنگاوانەی خوارەوە:

– هەوڵیدا خەڵکی بۆلای خۆی راکێشی تا لە فەرمانڕەوای عەباسی دوور بکەونەوە و پشتگیری لە بانگەشەکەی بکەن.

– هەوڵیدا عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر فەرمانڕەوای خۆراسان کە لە رووی وەستا، دووربخاتەوە.

– مازیار و منکجوری فرغانی، هاندا شۆڕش دژی دەسەڵاتی (المعتصم) هەڵگیرسێنن.

ئەفشین شکستی هێنا لە هێنانەدی ئامانجەکەی، پاش ئەوەی کە پیلانەکەی ئاشکرا بوو ([1]). بۆیە سیاسەتی خەلیفە بەرامبەری گۆڕا، ئەویش لەلایەنی خۆیەوە هەستی بەم گۆڕانە کرد و وای لێکرد بیر لە لەناوبردنی خودی خەلیفە بکاتەوە، بەڵام دەستی بەسەرا گیرا و (المعتصم)یش دادگایی کرد، بەڵام راپۆرتی لێپرسینەوەکە ئاماژەی بەپیلانی کوشتنەکە نەکرد، بەڵکو کۆمەڵی تۆمەت بوو مەبەست لێی سەلماندنی ئەوە بوو کە ئەفشین بەراستی نەهاتۆتە ناو ئاینی ئیسلامەوە و هێشتا توندڕەوە بۆ ئاگرپەرستی، هەوڵدەدا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەناوبەرێ. لەوانەیە

---

[1] الیعقوبی: ب٢ لا ٤٣٩.الطبری : ب ٩ لا ١٠٤.

مەبەستی (المعتصم) ئەوە بوو گومان و دووبەرەکی نەکەوتیتە ناو سەرکردەکانی تری تورک. لەساڵی (٢٢٦ك/٨٤١ز) ئەفشین لە ناو زیندانەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد ([1])

## پەیوەندییە دەرەکییەکان لە سەردەمی (المعتصم)دا

### پەیوەندی لەگەڵ (بێزەنتی)یەکاندا

لەئەنجامی سەرقاڵبوونی خیلافەت بە لەناوبردنی شۆڕشی بابەکی خوڕەمی، لەساڵانی یەکەمی خیلافەتی (المعتصم) دا شەڕ ڕاگیرا. لەکاتێکدا (پیوفیل) ئیمپراتۆری بێزەنتی سەرقاڵبوو بە هێنانەوەی دوورگەی (صقلیە) لەنێو دەستی موسڵمانەکاندا، بۆیە ناوچە سنوورییەکان ئارامیەکی نیمچە تەواوی بەخۆوە بینی. بەڵام ئەوەندەی نەمابوو چوار ساڵ بە سەر خیلافەتی (المعتصم) دا تێپەڕبێ (پیوفیل) وابینی بگەڕێتەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا لەسەر سنوری رۆژهەلاتی ئیمپراتۆرییەتەکەی، جا سەرکەوتنی دانوستانەکەی لەگەڵ بابەکدا کەوا بەڵێنی پێدا ببێ بە گاور لە بەرامبەر یارمەتیدانی لە جەنگاندنی موسڵمانەکاندا، زیاتر هانیدا لەسەر ئەوە، بە بۆچوونی خۆی دەیتوانی سەرکەوتنی سەربازی بە دەست بێنێ، بۆیە هێرشی کردە سەر ناوچەی بەرزایی یەکانی فورات بۆ ئەوەی پەیوەندی کردن بە خوڕەمیەکان لە ئەرمینیا و ئازەربێنجان مسۆگەر بکات، سەرە رێگەی (زبگرە)شی داگیرکرد، کە زێدی لە دایکبوونی دایکی خەلیفەیە، موسڵمانەکانی بە دیل گرت، هەروەها هێرشی کردە سەر (سمیساط و ملطیة) و ئاگری تێ بەردا ([2]).

(المعتصم) ئەم هێرشە بێزەنتیەی بە تەحدا کردنی خودی خۆی دانا پێش ئەوەی تەحدایەك بێ بۆ خیلافەتی عەباسی، رازی بوو بەو تەحدایە و بریاری دا تۆڵەی (زبگرە) بکاتەوە. هەر کە تەواو بوو لە دامراکاندوەی شۆڕشی بابەکی خوڕەمی لە ساڵی (٢٢٣ك/٨٣٨ز)، سوپایەکی چڕوپڕی ئامادەکرد بەمەبەستی ئاراستە کردنی لێدانێکی پشت شکێن بۆ ئیمپراتۆریەت، تا سامی ئیمپراتۆریەت نەهێلێ. بەم سوپایە

---

[1] الطبری : هەمان سەر چاوە لا ١١٤.

[2] الطبری: ب ٩ لا ٥٦.

بەرەو (عەموریە) کەوتەڕێ، زێدی لە دایکبوونی خانەوادەی (پیوفل)، بەنیازی وێرانکردنی. شایانی باسە داگیرکردنی عەموریە بە هەنگاوێك دائەنرێ بۆ گەیشتن بۆ (قسطنطینیة). ([1])

خەلیفە بە ئامادە باشیەکی تەواوەوە (سامەرای) بە جێهێشت و (ئەنقەرە)شی کردە یەکەم ئامانجی شاڵاوەکەی، (ئەشناس)ی تورکی بۆ سەرکردایەتی پێشەوەی داناو (ئیتاخ) بۆ لای ڕاست، (جەعفەری کوڕی دینار)یش بۆ لای چەپ و (عوجەیفی کوڕی عونبس) لەناو جەرگە، ئەفشین-یش لەم شاڵاوە بەشداری کرد و لەسەر تیمێکی سەربازی بوو، بڕیاریدا لە سێ شوێنەوە بچێتە ناو خاکی بێزەنتیەوە. سوپای ڕۆژهەڵات بە سەرکردایەتی ئەفشین بەرەو شاری (سروج) بەرێکەوت بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکی دیاریکراودا و لە میانەی ڕێی (الحدث) بچێتە ناو خاکی بێزەنتیەوە ([2])، سەبارەت بە سوپای ڕۆژئاوا کە بە سەرکردایەتی ئاشناس-ە، ئەوە دەبوو بە چیای تۆرۆس-ەوە بۆ شاری (صفصاف) پێشکەوێ کە دەکەوێتە نزیکی قەڵای (لوئلوئە) تا لەگەڵ سوپای ڕۆژهەڵات لەدەشتی ئەنقەرەدا یەك بگرن. خەلیفەش بەشی سێهەمی سوپاکەی بەڕێوەبرد و ڕاستەوخۆ بەرەو ئەنقەرە کەوتەڕێ. خەلیفە وا پلانە تەکتیکیەکەی داڕشت کە هەر سێ بەشەکە لەلای نشێوی ئەنقەرە کۆببنەوە تا هێرش بکەنە سەر شارەکە ([3]).

لەم کاتەدا (پیوفیل) ئیمپراتۆری بێزەنتی، کە زانی خەلیفە پلانی بۆ ئەنقەرە و عەموریە داناوە، (قسطنطینة)ی بەجێهێشت و لە (دوریلیوم) ڕاوەستا کە سێ میل لە (عەموریە)وە دوورە و فەرمانیدا ئەم شارە قایم بکرێ و کۆمەکی بۆ ناردن. دەربارەی پلاندانانی بۆ شەڕکردن، ئەوا وای دانا بوو لەکاتی کشانی هێزی ئیسلامی بەرەو باکوور بە ئاراستەی ئەنقەرە، هێرش بکاتە سەریان، لەپێناو ئەمەش لەسەر ڕووباری (هالیس) سەربازەکانی ڕاگیر کردو خۆی ئامادەکرد بیپەڕێنێ تا لە پرێکدا بێتە سەر

---

[1] هەمان سەرچاوە : ٧ ٥٧

[2] فازیلییف: [illegible] ١٣٣.

[3] الطبری: ب ٥٧٦٩ ـ ٥٨.

موسڵمانەکان، ئەو وای دەزانی کە ئەم هێزانە لە ڕێی (کیلیکیا)وە بۆ ئەنقەرە دێن، ئەگەرچی هیچی دەربارەی سوپای ئەفشین نەدەزانی ([1]).

ئەوجا ئەوە روویدا کە خەلیفە فەرمانی دەرکرد سوپا راوەستێ تا دەنگوباسی سوپای بێزەنتی بزانێ، نامەیەکی بۆ ئەشناس نارد، جا لەوکاتەدا گەیشتبووە مێرگی ئەسقەف کە نزیکی لوئلوئەیە، ئاگاداری دەکردەوە بە گۆڕانی هەڵویستی سەربازی، فەرمانی پێدا راوەستێ تا پاشەکی سوپاکە پێی بگات چونکە کەرەستەی جەنگی پێیە. ([2])

وادیارە (پیوفیل) بە هاتنی سوپای رۆژهەڵات کە بە سەرکردایەتی ئەفشین بوو، زانی، بۆیە پلانەکەی گۆڕی، ناچار بوو سوپاکەی بکابە دوو بەشەوە، خۆی سەرکردایەتی بەشی یەکەمی کرد تا رووبەڕوی ئەفشین ببێتەوە، بەشی دووهەمیشی بۆ بەرەنگاربوونەوە سوپای خەلیفە هێشتەوە تا نەهێڵێ پێشکەون، ئەوەش هەوڵێکە بۆ بەیەك نەگەیشتنی هەردوو سوپای ئیسلامی ([3]) جا (المعتصم) کە بەپلانی (پیوفیل) ئاگادار بووەوە، ویستی ئەفشین، بە کەوتنە ڕێی ئیمپراتۆر بۆ لای وریا بکاتەوە. بەڵام ئەوکاتە ئەفشین گەیشتبووە ناو ئاسیای بچووك، بۆیە هیچ نوسراوێکی پێ نەدەگەیشت. سەبارەت بە ئەشناس ئەوا بەردەوام بوو لە کشانی بەرەو ئەنقەرە و خەلیفەش بە ماوەی یەك رۆژ لە دوایەوە بوو، بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن لە بارەی چارەنووسی ئەفشین([4]).

لەو کاتەی کە سوپای خەلیفە لە ئەنقەرە نزیك دەبووەوە، ئەفشین لە(سیواس) دەپەڕیەوە بۆ (توقات)، جا ئەو کاتە چاری ناچار بوو لەگەڵ ئیمپراتۆردا بجەنگێ. شەڕەکە لەساتە یەکەمەکانی بەیانی رۆژی بیست و پێنج لە (مانگی شەعبان

---

[1]. Bury: op.cit. p ٢٦٤

[2] الطبری: ب ٧٩ ٥٨.

[3]. Bury: op.cit. p ٢٦٤

[4] الطبری: ب ٥٩٧٩،٦٠.

ساڵی٢٢٣ك/مانگی تەمموز ساڵی٨٣٨ز) دەستپێیکرد، هەرچەندە سەرەتا بێزەنتیەکان سەرکەوتنیان بە دەستهێنا، بەڵام سوار چاکی موسڵمانەکان هەڵویستەکەیان لە دۆرانەوە بۆ سەرکەوتن گۆڕی. کاتێك هەواڵی کوشتنی ئیمپراتۆر بڵاو بووەوە و شەڕەکەش بەردەوامە، شڵەژاوی کەوتە ناو ریزی سوپای بێزەنتیەوە، بۆیە هەڵهاتن بەبێ ئەوەی لابکەنەوە. ئیمپراتۆریش پاش رەنج و کۆششێکی کەم گۆڕەپانی شەڕەکەی بەجێهێشت و رۆیشت تا گەیشتە شاری (خلیوکومن). کە دەکەوێتە باکووری ئەماسیا، پاشماوەی سوپاکەی کۆکردەوە و گەڕایەوە بۆ سەربازگەکەی لەسەر رووباری هالیس، یەکێك لە سەردارەکانی بۆ ئەنقەر نارد تا بەرگری لێ بکات، بەڵام کات بەسەر چوو بوو. چونکە ئەوەی کە روویدابوو سوپا جیابووەکانی ئیسلام لە دەشتی ئەنقەر کۆببووبوونەوە و شارەکەیان وێران و کاول کرد بوو ([1]).

(پیوفیل)پاش دۆرانی و روخاندنی ئەنقەرە هیچی پێنەکرا جگە لەوەی بنێرێ بۆ لای (المعتصم) و داوای لێبوردنی لێ بکات لەو کوشتارەی کە لە (زبطرة) ئەنجامیدا و پەیمانی دا سەر لەنوێ ئاوەدانی بکاتەوە و دانیشتووەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە و بە دیلگیراوی موسڵمانەکانیش بەربدات، بەڵام خەلیفە ئەم پێشنیارەی رەتکردەوە و بەردەوام بوو لە کشانی بەرەو عەموریە..سەبارەت بە (پیوفیل) ئەوا بەرەو (دوریلیوم) چوو و چاوەڕێی دەکرد بزانە چی بەسەر عەموریە دێ و چارەنووسی چۆن دەبێت ([2]).

خەلیفە پاش روخاندنی ئەنقەرە بەرەو عەموریە کەوتەڕێ و بەحەوت رۆژ گەیشتە لای و گەمارۆیدا، هەرچەندە ئەم شارە قایم و پارێزراو بوو، بەڵام لە پاش دوو هەفتە لە گەمارۆدانی لە حەڤدەی (مانگی رەمەزان ساڵی٢٢٣ك/مانگی ئاب ساڵی ٨٣٨ز) رادەست بوو ([3]).

موسڵمانەکانیش خەڵکێکی زۆریان لێ بە دیل گرت و دەستکەوتێکی باشیان دەستکەوت، (المعتصم) پەرژینەکانی رماند، لە بەرامبەردا فەرمانی کرد بە نۆژەن

---

[1] هەمان سەرچاوە: لا ٦١ - ٦٢.. Bury: op.cit. p ٢٦٥

[2] الیعقوبي: ب٢ لا ٤٣٦.

[3] هەمان سەر چاوە : لا ٤٣٧.

کردنەوە (زبگرە) و قایم کردنی.

شاڵاوەکەی (المعتصم)، لاوازی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دەرخست، ئەمەش خەلیفەی هاندا بەردەوام بێ لە کشانی بەرەو (قسطنطینیة)، کەوا رێگە بۆی کراوە بوو، بەڵام ناچاربوو بۆ عێراق پاشەکشێ بکات چونکە پلانێکی ئاشکراکرد لەلایەن سەربازەکانیەوە بۆ بەرژەوەندی ئەلعەباس([1])، هەرچۆنێك بێت، شاڵاوەکەی (المعتصم) بۆ وڵاتی بێزەنتیەکان جیاوازە لە شاڵاوە پێشووەکانی دیکە کەوا قەراغی دەوڵەتەکەیانی بە ئامانج کردبوو. چونکە عەموریە دوورە لە ناوجەرگەی ئاسیای بچوکەوە و (الطبري) وای دانا کە (( مەزنترین شارە لە وڵاتی رۆمدا بچی بۆی)) ([2]) ئەو کارەساتانەی کە لە ئاسیای بچوك روویدا لە ئەنجامی هێرشی (المعتصم) و پێشکەوتنی موسڵمانەکانی ئەفریقیا لەدوورگەی (صقلیە) و ئەو زیانەی کە موسڵمانەکان لە دوورگەی (کریت) بە ئیمپراتۆریەت گەیاندیان، هەموو ئەمە (پیوفیل) ی قایل کرد کە ئیمپراتۆریەت توانای بەرەنگار بوونەوەی هێزی روو لەزیادبووی موسڵمانەکانی نیە، بۆیە مەیلی ئاشتبوونەوەی کرد.سەرئەنجام لەساڵی (٢٢٧ك/٨٤٢ن) جەنگڕا گرتن لە نێوان هەردوولا راگەینرا ([3]). ئەوە بوو هەر یەك لە (المعتصم) و(پیوفیل) لە هەمان ساڵدا کۆچی دواییان کرد. (الواثق) خیلافەتی گرتە دەست، هاوکات بەراسپێری (تیودورای)دایکی، میخائیلی سێهەم ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی گرتە دەست.

---

[1] الطبري: ب ٩/٧١-٧٧.المسعودي ؛ ب ٢ لا ٤٧٢.

[2] هەمان سەر چاوە : لا٥٧-٥٨.

[3] Canb. Mad. Hist:lv p ١٢٠

### مەرگی (المعتصم)

لە رۆژی یەکەم لە (مـانگی موحـەرەم سـاڵی ٢٢٧ك/مـانگی تـشرینی یەکـەم سـاڵی ٨٤١ز) (المعتصم) کەڵەشاخی گرت، لە پاش ئـەوە توشـی ئـەو نەخۆشـیە بـوو کـە لـە ناوی برد، هەشت شەو بەسەر چوو بوو لـەمانگی رەبیعـی یەکـەم کۆتاییـەکانی مـانگی کانونی یەکەم لەساڵی ٨٤١ز، هـارونی کـوڕی کـرد بـوو بـە جێنـشینی خـۆی و کەسـی نەکردبوو بە هاوبەشی لە فەرمانڕەوایەتیدا ([1]).

### ئەبو جەعفەری هارون (الواثق) ٢٢٧.٢٣٢ك/٨٤١.٨٤٧ز

### ناساندنی (الواثق)

هارونی کوڕی (المعتصم)، پێی دەوترێ ئەبو جەعفەر. دایکی بەس کوڕی هـەبووە، ناوی (قراگیس)ە. بـە راسـپێری بـاوکی لـەو رۆژەی کـە تێـدا مـرد، رۆژی چوارشـەممە هەشت شەو بەسەر چووبوو لە مانگی رەبیعی یەکەم، بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت.

(الواثق) ناسرا بە گەورەیی عەقڵی و باش هەڵسو کـەوتکردنی سیاسـی لـە سـەردەمی باوکیدا، ئەمەش وای لە باوکی کرد لە کاتی نەبوونی لە بارەگای خیلافـەت پـشتی پـێ ببەسـتێ، پاشـان کـردی بـە جێنـشینی خـۆی. خولیـای زانـست و ئـەدەب بـوو. ئـەو شاعیربوو شیعری جوانی هەیە و دەستبڵاو بوو لەگەڵ شاعیرە ناودارەکانی سـەردەمی خۆیدا، لە کۆشکەکەی دانیشتگەیەکی بـۆ وتوێـژی هـزری تایبـەت کـرد بـوو، لەمەشـدا پەیڕەوی مەئمونی دەکرد و پێی دەوترا ((مەئمونی بچووک))، شوێنی باوکی کەوت لـە پشتبەستن بە رەگەزی تورکی و لەپۆستەکانی سەرۆکایەتیدا تورکـەکانی خـستە جێـی عەرەبەکان.([2])

---

[1] الطبری : ب ٩ لا ١١٨، ١١٩.

[2] بۆ ناشنابوون بە ژیاننامەی (الواثق)، بگەڕێوە بۆ لای (ابن الكثیر) ب ١٠ لا ٢٠٨، ٢٦٧، ٣١٠ و محمدبن شاکر الكتبي: فوات الوفيات ب ٤ لا ٢٢٨، ٢٣٠.

## ڕەوشی ناوخۆ لەسەردەمی(الواثق)دا

سەردەمی(الواثق) بەماوەی گواستنەوە دادەنرێ لە نێوان دوو سەردەمی جیاواز لەسەردەمەکانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا. زۆر لەو دیاردانەی کە لەسەردەمی مەئمون و (المعتصم)ی باوکی باوو بڵاو بوو لەکاتی ئەمیشدا دووبارە بووەوە.

(الواثق) لەسەرەتای خیلافەتەکەیدا بەرەنگاری بزوتنەوەی عەرەبە بیابان نشینەکان بووەوە لە بنەماڵەی سەلیم و ئەو دەشتەکیانەی کە ئاژاوەیان لەدەوروبەری مەدینەدا دەنایەوە، ئاسایشی سەپاند بەسەر ڕێگاو بانە بازرگانیەکاندا لە باکووری دوورگەی عەرەب ([1]). (الواثق) بیروباوەڕی موعتەزیلەی لەخۆگرت کە باسی خولقاندنی قورئان دەکات و سیاسەتی باوکی گرتەبەر لەسەرخستنی و پاڵپشتی کردنی، توندڕەو بوو لە سەپاندنی بیروڕا ئاینیەکانی بەسەر خەڵکدا، لەئەنجامی ئەمەشدا خەلکی سادە و فەقێکان هەستیان بە بێزاری کرد و خەڵکی بەغداد پیلانیان دژی گێڕاو هەوڵیان دا لەسەر حوکم لایبەرن، بەڵام وادیارە ئەو پێش مردنی، لەم بیروباوەڕەی هەڵگەڕایەوە([2]).

ئیدارەی (الواثق)، لاوازی و کۆنترۆڵکردنی لەلایەن فەرمانڕەواکانی دەوروبەری پێوە دیار بوو، لە سەردەمیدا بەرتیل بڵاو بووەوە و گەندەڵی زۆر بووەوە. ئەم خەلیفەیە سیاسەتی توندڕەوی گرتەبەر لە بەرامبەر فەرمانڕەوا و نوسەرەکانی، بەوەش شوێنی هارون ڕەشیدی باپیری کەوت و وتە ناوبانگەکەی ئەوی دووبارە دەکردەوە ((....دەستەوسان ئەو کەسەیە زۆرداری نەکات)). ئەوە بوو بەڵاو چورتەمی هێنایە سەر نوسەرکانیدا و پارە و پوولەکانی لێ سەندنەوە بەتۆمەتی ئەوەی کە ئێوە لەسەر حیسابی دەوڵەت دەوڵەمەند بوون ([3])، فەرمانڕەوای هەرێمەکان لەسەردەمی (الواثق)دا دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی تاهیری کوڕی ئەلحوسەین سەربەخۆیانە خۆراسان و (گبرستان) و کرمانی

---

[1] الطبری : ب ۹ ۱۲۹۷ ـ ۱۳۱.

[2] ابن کثیرب ۱۰ ۳۰۹.

[3] الطبری: ب ۱۲۵۷۹. ۱۲۸.

بەڕێوە دەبرد([1]).خەلیفە حوکمڕانی جەزیرە و شام و میسر و مەغریبی بە (ئەشناس) سەرکردە تورکەکەی راسپارد، هەروەها (ئیتاخ)ی تورکیشی کرد بە فەرمانڕەوای خۆراسان و سند و ناوچەکانی دیجلە([2]).

## مەرگی(الواثق)

مانەوەی (الواثق) لەسەر تەختی خیلافەتی عەباسی شەش ساڵ کەمتری خایاند، شەش ڕۆژی مابوو لە (مانگی - ذي الحجە - ساڵی٢٣٢ک/ مانگی ئاب ساڵی ٨٤٧ز) بە نەخۆشی (الاستسقا – ئاوبەنگ) کۆچی دوایی کرد بێ ئەوەی جێنشین دانێ لە دوای خۆی. لەکاتی نەخۆشیەکەی و نزیکبوونەوەی مەرگی داوای لێکرا خیلافەت بە کوڕەکەی بسپێرێ، ئەگەرچی رازی نەبوو و وتی : (( من بەرپرسیارێتی ئێوە هەڵناگرم نە بە زیندوویی و نە بە مردوویی)).

---

[1] هەمان سەر چاوە : ١٣١٧.

[2] اليعقوبي: ب ٢ لا ٤٤١.

## سەردەمی عەباسی دووهەم

## سەردەمی دەسەڵاتی تورکی ٢٣٢-٣٣٤ك/٨٤٧-٩٤٦ز

خەلیفەکانی سەردەمی عەباسی دووهەم و ماوەی خیلافەتی هەر یەک لەوان:

| | |
|---|---|
| أبوالفضل جعفر المتوكل | ٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٧-٨٦١ز |
| أبوجعفر محمد المنتصر | ٢٤٧-٢٤٨ك/٨٦١-٨٦٢ز |
| أبو العباس أحمد المستعين | ٢٤٨-٢٥٢ك/٨٦٢-٨٦٦ز |
| أبو عبدالله محمد المعتز | ٢٥٢-٢٥٥ك/٨٦٦-٨٦٩ز |
| أبو إسحاق محمد المهتدى | ٢٥٥-٢٥٦ك/٨٦٩-٨٧٠ز |
| أحمد المعتمد | ٢٥٦-٢٧٩ك/٨٧٠-٨٩٢ز |
| أبو العباس أحمد المعتچد | ٢٧٩-٢٨٩ك/٨٩٢-٩٠٢ز |
| أبو محمد المكتفي | ٢٨٩-٢٩٥ك/٩٠٢-٩٠٨ز |
| أبوالفضل جعفر المقتدر | ٢٩٥-٣٦٠ك/٩٠٨-٩٣٢ز |
| أبو منصور محمد القاهر | ٣٢٠-٣٢٢ك/٩٣٢-٩٣٤ز |
| أبو العباس أحمد الراضي | ٣٢٢-٣٢٩ك/٩٣٤-٩٤٠ز |
| أبو إسحاق جعفر المتقي | ٣٢٩-٣٣٣ك/٩٤٠-٩٤٤ز |
| أبو القاسم عبدالله المستكفي | ٣٣٣-٣٣٤ك/٩٤٤-٩٦٤ز |

## سروشتی سەردەمی عەباسی دووهەم

سەردەمی عەباسی دووهەم لە زۆر دیاردەکانی لەسەردەمی عەباسی یەکەم جیاوازە. سەردەمی یەکەم ناسرا بە بەهێزی خیلافەت و سپاردنی دەسەلات بەو خەلیفانەی کە ناسراو بوون بە لێهاتوویی سیاسی. توانیان پەیوەندی پتەوی خۆیان لەگەڵ ئەو گەلانە بپارێزن کە لەماوەی خۆئامادەکردن بۆ شۆرش پاڵپشتی کردن. هەروەها ئازایەتیەکی دەگمەنیان نیشاندا لە سەرکوتکردنی حەزو ئارەزوی ئەو کەس و نەتەوانەی کە بە تەمای دەسەلات بوون، جگە لەوەی کە لە ئەندەلوس و هەندێ لە هەرێمەکانی باکووری ئەفریقیا روویدا(١).

توانیان جۆرە هاوسەنگیە لە نێوان رەوتە سیاسیە جیاجیاکان دروست بکەن کەوا لەپاش دامەزرندنی دەوڵەت سەریان هەڵدا.

ئەوە بوو ئەم دیاردانە لەسەردەمی عەباسی دووهەمدا گۆڕا کاتێك دەوڵەت لەمەرکەزی بوون بۆ نامەرکەزی بوون گۆڕا لەسیستەمی حوکمڕانیدا، گەلێ دەوڵەتی سەربەخۆ دامەزرێنرا چ سەربەخۆییەکی تەواوەتی یاخود نیمچەیی لەگەڵ دانپێنان بە دەسەلاتی رۆحیی خیلافەتدا.(❁)

گەل و نەتەوەی دیکە هاتنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە و توانیان بگەن بە دەسەلات و خەلیفەکان کەوتنە ژێر دەسەلاتیان، ئەمەش وایکرد رۆڵی سیاسیان کەم بێتەوە، بۆیە ئەو رێزەیانە نەما کە خەلیفەکانی پێشوویان لەسەردەمی عەباسی

---

(١) عەبدولرەحمانی داخل. ئەندەلوسی جیا کردەوە. عەبدەلرەحمانی کوری حەبیب یش -فەرمانرەوای ئەفریقیا- شۆرشی هەڵگیرسان دژی ئەمەویەکان و. عەباسیەکان وەکو میرێکی سەربەخۆ دانیان پێنا. مەغریبیش دامەزراندنی دەوڵەتی رۆستەمی لە (تاهرت) بە خۆوەبینی، دەوڵەتی (الادارسە) لە مەغریبی دوور و دەوڵەتی (الاغالبە) لە تونس.

❁ لەدیاردەکانی دانپێنانی دەوڵەتە جیاخوازەکان بە دەسەڵاتی ئاینی خەلیفە:

١. پاڕانەوە بۆ خەلیفە لەسەر مینبەرەکان.

٢. نەخشاندنی ناوی خەلیفە پێش ناوی میر لەسەر دراوەکان.

٣. ناردنی بەشێك لەباجەکان بۆ (بیت المال)ی خیلافەت. بگەڕێوە بۆ : العش، یوسف : تاریخ عصر الخلافة العباسية: ل١٣٨.

یەکەمدا هەیانبوو([1]).

وادیارە هۆی ئەم گۆڕانکاریە دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کەوا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەسەردەمی عەباسی یەکەمدا گوزەراندی و تۆوی جیابوونەوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت.

خاکی دەوڵەت، بەرفراوانییەکی زۆری بەخۆوە بینی بەشێوەیەك مەحاڵبوو لەناوەندی خیلافەتەوە بەڕێوە ببرێ، ئەوەش بەهۆی پێشنەکەوتنی هۆیەکانی گواستنەوە لەگەڵ ئەم بەرفراوانیە لەلایەکەوە، بەهۆی پەیدابوونی هەستی رەگەز پەرستی لەلایەکی دیکەوە.

بەرامبەر ئەم واقیعە، دەوڵەت پەنای بردەبەر پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی پێچەوانە کە لەسەر بەش بەش کردن هەستابوو. ئەوە بوو هارون رەشید دەوڵەتی لەنێوان هەردوو کوڕەکەی ئەمین و مەئموندا دابەش کرد. بەشی یەکەم شارەکانی مەغریبی عەرەبی دەگرێتەوە، بەشی دووهەمیش رۆژهەڵات، جا نەریت وابوو خەلیفە جێنشینێتی بە دوو کەس بسپێری لە دوای یەکتر. ئیدارەی مەغریب بە جێنشینی یەکەم سپێردرا و ئیدارەی رۆژهەڵاتیش بە جێنشینی دووهەم. ئەوە بوو لە دوای هارون رەشید خەلیفەکانیش ئەم سیاسەتی بەش بەش کردنەیانە پەیڕەوکرد.

سەرئەنجامی ئەم بەش بەش کردنە دوو دیاردەی دژ بە یەك هاتەکایەوە. دیاردەیەك هەوڵدەدات دەسەڵات بەهێزبێت و یەکگرتوویی دەوڵەت بپارێزێ، دیاردەیەکیش کاردەکات بۆ جیابوونەوەی هەرێمایەتی کەوا تێکچوونی رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووریی خەڵکی بەهەلزانی بۆ جیابوونەوە. جامەسەلەکە بەسەرکەوتنی ئارەزوی جیاخوازی تەواو بوو کە رێی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ خۆشکرد.

سەرەڕای ئەمەش، ئەوا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەکاتی دامەزراندنیدا تۆی ئەم جیابوونەوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، ئەوەش کاتێك نەتەوەکانی تر چاوەڕوان بوون بنەمای یەکسانی تەواوەتی لەگەڵ عەرەبدا دەستبکەوێ بەپێی بنەماکانی شەریعەتی

---

[1] محمود و الشريف: لا ٢٨٥.

ئیسلامی، پاش ئەوەی لە قۆناغەکانی پێشوو لێی بێبەش بوون. جا خیلافەتی عەباسیش کاری کرد بۆ جێبەجێکردنی ئەم داخوازیە، بۆیە گیانی نەتەوپەرستی لەلای نەتەوەکانی بەهێز کرد و هانیدان دەوڵەتی سەربەخۆ و رەگەزپەرست دامەزرێنن، بەڵام لەهەمان کاتدا وڵاتی خۆیان بۆ خیلافەت پاراست و دانیان بە دەسەڵاتی رۆحی خەلیفە نا. لەسەر ئەوەش. داخوازی ئەم نەتەوانە بە جێبەجێکردنی بنەمای یەکسانی، ئامانجی سیاسی لە دواوە بوو.

شێوازی حوکمڕانی لە ویلایەتە دوورەکاندا رۆڵی هەبوو لەزاڵکردنی هەستی جیاخوازی. ئەوە بوو خەلیفەکانی بنەماڵەی عەباس، بە تایبەتی لەسەردەمی بەهێزبوونی دەسەلاتی تورکەکاندا، بەئەنقەست هەندێ لەسەرکردەکانیان وەکو فەرمانڕەوا لەم هەرێمانەدا دامەزراند، هاوکات چاودێری کردنیان ولێپرسینەوەیان پشتگوێ خست. بەحوکمی تێکچوونی رەوشی گشتی لە ئیدارەی ناوەندیدا، ئەمانە جێگریان بۆ خۆیان دانا بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکان و خۆشیان لەپایتەخت مانەوە و بەشداریان دەکرد لە نەخشەکێشانی سیاسەتی باڵای دەوڵەت و بەشدار دەبوون لە پیلانگێڕان و ژیانێکی خۆشیان لە ناو کۆشك و تەلارەکاندا دەگوزراند.

بێگومان، لەم بارودۆخە نائاساییەدا، جێگرەکان هەوڵ بدەن بۆ کۆکردنەوەی پارەو پوول بەمەبەستی رازیکردنی خەلیفە و سەرکردەکان و تەنانەت خۆشیان. بە ئەنقەست باجیان زیاد کرد و بە زۆر دەیانسەند، خەڵکی ستەمی لێکرا و چاوەڕوانی کەسێك بوون ئەم زوڵم و ستەمەیان لێ هەڵگرێ و باری ئابوورییان باشتربکات. وای لێهات پیاوی بەهێز لە ویلایەتەکاندا دەرئەکەوت و ئەم رەوشە شڵەژاوەی بەهەل دەزانی و بەڵێنی باشکردنی باری ئابوری و کۆمەلایەتی دەدا، خەڵکیش پاڵپشتیان دەکرد و ئەویش جیابوونەوەی خۆی رادەگەیاند.

بزوتنەوەی زەنج کە لەساڵی (٢٥٥ك/٨٦٩ز) راپەری، قۆناغێکی یەکلایی کەرەوە بوو بۆ مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، چونکە هێزە جیاخوازەکان زۆر بەهێزەوە بوون بە شێوەیەك دەوڵەتی عەباسییان پارچە پارچە کرد. ئەوە بوو باکووری ئەفریقیا دەمێکە لە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی جیا بووبوەوە، لە جەنگی

درێژخایەن لەگەڵ زەنجەکاندا و لەپاشی بەماوەیەکی کەم وڵاتی زۆری دیکە لەلەشی دەوڵەتی خیلافەت جیابووەوە، ئەو بارو دۆخە گرانەی کە خەلیفەکان خۆیانیان تیا بینیەوە دەرفەتی بە سەرکردە تەماحکارەکاندا حکومەتی سەربەخۆی خۆیان دامەزرێنن لە شوێنی جیاواز لە دەوڵەتدا. وادیارە سەرکەوتنەکانیان گونجاو بوو لەگەڵ حەزو ئارەزووی ئەو چینەی کە زوڵم و ستەمی لێکرا لەو وڵاتانە وێڕای چینی مامناوەند لەجوتیار و پیشەدار و بازرگان و خاوەن موڵکەکان. چونکە گەشەسەندنی پیشەسازی هێندە خێرا نەبوو هەموو دەستی کار لەخۆبگرێ و کشتوکاڵیش ئاستی دابەزی بەهۆی شەڕو ئاژاوە و دزی و جەردەیی، هەروەها جموجوڵی جهادیش زۆر کز بووەوە، بۆیە ژمارەی بێکارانیش زیادی کرد، لە ئەنجامدا گەنج لە هەموو شوێنێکدا پەیدا بوو و چوونە ناو بزوتنەوە جیاخوازەکان. زیادبوونی دزی و تالانی و بڵاو بوونەوەی جەردەیەتی ترسی لەلای چینی مامناوەند پەیدا کرد، بۆیە وای لە تاکەکانی کرد پاڵپشتی ئەو فەرمانڕەوایانە بکەن کە بتوانن ئەمن و ئاسایش سەقامگیر بکەن کە پێویستە بۆ چالاکی کۆمەڵایەتیان و پاراستنی سەقامگیریان.

جا کاتێك شۆڕش هەڵگیرسا هێشتا و یلایەتە هەرێمیەکان لەژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی خەلیفەکان بوون یاخود دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دڵسۆزەکانیان. لە کاتی شۆڕشدا هەموو شتێك گۆڕا. چونکە بیرۆکەی – کۆکردنەوەی جیهانی ئیسلامی لەژێر یەك سەرکردایەتی سیاسی – گرنگی نەما، بیرۆکەی – بەدیهێنانی بەرژەوەندی هەرێمی بۆ گەلە جیاجیاکان کەوا هەموویان چوونە ژێر ئالای خیلافەت – جێی گرتەوە، بە شێوەیەك کە هەموو گەلێك هەست بە رەگەز و کەسایەتی خۆی بکات و هەوڵ بۆ گەشەپێکردنی بدات و وردە وردە جیابێتەوە، تائەوەی کاتی خۆی هات کە هەموو رەگەزێك حوکمڕانی خۆی بکات. – هەندێ لایەنی ناوخۆیی هانی ئەم رووکارە رەگەزپەرستیەیانە دەدا وەکو بەرهەڵستکاری عەلەوی و بەرهەڵستکاری خەواریج. خیلافەتیش بێ دەسەڵات لە بەردەم ئەم رەوتانە وەستابوو و چاری نەدەکردن.

بەڵام خیلافەت وەکو سیستەمێکی سیاسی، لە دیدەی موسڵمانەکاندا بەگشتی پێویستیەکی ئاینی بوو بۆ بەردەوامبوونی یەکێتی ئیسلامی گشتی. چونکە وەکو

هێمایەکە بەشە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامی بە یەك دەبەستێتەوە، وە ئەو گەلانەی کە سووربوون لەسەر جیابوونەوەی سیاسی بیریان لە جیابوونەوەی ئاینی نەکردۆتەوە، جگە لە پرسی خیلافەتی (فاگمی) کە هەر دانی بە ماف عەباسیەکان لە خیلافەتدا نەنا.

لەلایەنی خۆشیەوە خیلافەت ئەم دیاردەیەی گرتەخۆ، هەوڵیدا هاوسەنگی دروستبکات لە نێوان ئاواتی گەلەکان و داواکاریە سیاسی و ئابووریەکانیان و لە نێوان بنەمای یەکێتی. بەڵام نەیتوانی هاوسەنگی لە نێوان هێزی ناوەندی لە بەغداد و نێوان هێزە نامەرکەزی گەشە کردوەکان لە هەرێمەکاندا بەدی بێنی، بۆیە کۆمەڵێ دەوڵەتی سەربەخۆ دامەزرا. ئەوە بوو لە رۆژهەڵات دەوڵەتی (گاهری) و (صەفاری) و (سامانی) سەریان هەڵدا، هەروەها لە میسر دوو دەوڵەت دامەزرێنرا ـ(تۆلۆنی) و (ئەخشیدی). باکووری ئەفریقیاش بەمەزهەب کاریگەربوو و سەرئەنجام دەوڵەتی عوبەیدی (فاگمی) تێدا دامەزرا.

لە بەرامبەر ئەم راستیەدا خەلیفە عەباسیەکان چاریان نەبوو جگە لەوەی دانی پیا بنێن، هەموو گەلێك لەم راستیە نوێیەدا دەرفەتی بۆ رەخسا ئاییندەی خۆی لە چێوەی شارستانیەتی ئیسلامیدا دروست بکات، بە هەر شێوەیەك بێت بە پێی توانای خۆی بەشداری بکات لە بنیاتنانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی.

لەو سەردەمە کە نامەرکەزیەت بەسەر کاروباری حوکمڕانیدا زاڵ بوو، جیاوازیەکی سیاسی دەبینین لە نێوان رۆژهەڵاتی ئیسلامی و رۆژئاوایدا. لەکاتێکدا هەرێمەکانی رۆژهەڵات، هەر چەندە گەشەیان بە رووکاری رەگەزپەرستی جیاخوازی دەدا، سوور بوون لەسەر ئەوەی بمێننەوە لە ناو بازنەی خیلافەتداو رێزیان لێ دەگرت و دانیان بە دەسەڵاتە رۆحیەکەی دەنا و دەکۆشان بۆ ئەوەی دامەزراندنی هەرێمەکانیان بەپشتگیری ئەو بێ، وەکو بەڵگەیەك لەسەر هەبوونی سەروەری باڵای عەباسی، دەوڵەتە جیاخوازەکانی رۆژئاوا بەرەو سەربەخۆیی تەواوەتی دەچوون، بەوەش بەدەنگی داواکاریە رەگەز پەرستیەکانی پارتە بەرهەڵستکارەکانەوە دەچوون.

وڵاتە جیاخوازەکان بەرپرسیارێتی بەرگریکردن لە جیهانی ئیسلامیان گرتە ئەستۆ،

هەریەك لە شوێنی خۆی، بەمەش ئەم ئەركەی لەسەر شانی خیلافەت هەڵگرت، هەروەها دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامیی گەیاندە شوێنی تازە، پێی دەچێ خیلافەتی ناوەندی نەیدەتوانی ئەوە بهێنێتە دی. هەروەها بەرەنگاری ئەو هێرشانە بوونەوە كە دەكرایە سەر جیهانی ئیسلامی.

ناوچەكانی سەر سنوور وەكو یەكەی ئیداری مایەوە جارێك بەهێزەوە دەبوو و جارێك لاواز، بەپێی گۆرانكاریەكانی جیهانی ئیسلامی و پێویستی بۆ بەرگریكردن یاخود هێرشكردن، ئەمەش بەندە بە مەترسی دەرەكی و هێزی خیلافەت، ئەوە بوو دەوڵەتی (حەمدانی) لە ناوچەكانی سەر سنووری شام و جەزیرە دامەزرا. سەبارەت بە ناوچە سنوریەكانی دوای رووبار ئەوا ئەركی بەرگری لێكردنی كەوتە سەر شانی ئەو وڵاتە جیاخوازانەی كە لە رۆژهەڵات دامەزران.

سەبارەت بە عێراق، ئەوا رەوشێكی تایبەتی هەبوو، چونكە پەیوەست بوو بە خیلافەت كەوا راستەوخۆ حوكمڕانی دەكرد یاخود بەناویەوە حوكمڕانی دەكرا كە مشتی نەتەوەكانی تر لەدەسەڵات بەهێز بوایە، تاوەكو لە كۆتاییدا بە تەواوەتی خەلیفە دەسەڵاتی خۆی لەپایتەختدا لە دەستدا لە بەردەم بەهێز بوونەوەی دەسەڵاتی توركەكان، وەكو چۆن پێشتر لە هەرێمەكاندا لەدەستی دا و وای لێهات پۆستی خیلافەت تەنها هێمایەك بوو دەوڵەت لە دەوروبەری كۆدەبووەوە.

لە كۆتاییدا سەردەمی عەباسی دووهەم ناسرا بە دابەزینی ئاستی پەیوەندیەكانی نێوان خیلافەت و نێوان سەرچاوەكانی بەهێز بوونی لە هەرێمەكاندا([1]).

بۆیە خیلافەتیش لاواز بووەوە خەلیفە سیفەتی خۆی لە دەستدا وەكو سەری قووچەكی ئەو سیستەمە كە زاڵ بوو بە سەر ژیانی ئیسلامی لەسەردەمی عەباسی یەكەمدا، سەرئەنجام سامی لەلای خەڵكی نەماو تووشی سووكایەتی پێكردن بوو.

---

[1] ئەم پەیوەندییانە بە هۆی هۆكاری ناوخۆیی تایبەت بە ناوماڵی عەباسی و ململانێی خانەوادەیی لاواز بووەوە، بە هۆی هۆكاری دەرەكیەوە كەوا رەگەز پەرستی تەشەنەی كرد بوو لە هەرێمەكاندا هاوكات رەگەزی عەرەبی رۆڵی كز دەبووەوە بەهۆی بڵاو بوونەوەی عەرەب لە وڵاتەكاندا و تێكەڵبوونیان بە ئەو گەلانەی كە ملكەچیان بوون و بەهۆی پەیدا بوونی دەمارگیری لە نێوانیاندا. خیلافەت پشتگیری رەگەزی عەرەبی لەدەستدا. هەروەها رەگەزی فارسیش. پاش ئەوەی لە تەنگی پێهەڵچنین.

## بەندی حەوتەم

### ڕەوشی ناوخۆی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

**پەیوەندی لەگەڵ تورکەکاندا – دەرکەوتنی سیستەمی (إمرة الامراء) – بزوتنەوەی زەنج – پەیوەندی لەگەڵ عەلەویەکاندا.**

### ا–پەیوەندی لەگەڵ تورکەکاندا

پایتەختی خیلافەت لە بەغدادەوە بۆ سامەرا گوێزرایەوە، کەوا نزیکەی پەنجا ساڵ بەشارستانیەتی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی مایەوە و بووە بارەگای نوێ بۆ دەمارگیری تورکی. لەسەردەمی (المعتصم)دا چەندین کەسایەتی تورکی لەسەر شانۆی ژیانی سیاسی هاتنە دەرکەوتن کە بەگشتی ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە ژیاندا، ڕەنگە ئەفشین و ئەشناس و ئیتاخ و (وصیف) و (سیمای دیمەشقی) ناودارترینیان بن. ئەوە بوو خزمەت و پاڵپشتی دەوڵەتیان کرد لە شەڕە ناوخۆییەکانیدا دژی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی. بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار تورکەکان کەوتنە پێکهێنانی قەوارەیەکی تایبەت بە خۆیان چ لەسایەی خیلافەت بێ یاخود بەجیا، هەروەها هەندێکیان کە زانیان خیلافەت ناتوانێ دەستبەرداری خزمەتەکانیان بێ تەماحیانکرد تاکڕەوی لە دەسەڵاتدا بکەن لە پایتەختدا.

خیلافەتی (الواثق)ی کوڕی (المعتصم) (٢٢٧ـ٢٣٢ك/٨٤٢ـ٨٤٧ز) بەماوەی گواستنەوە لە نێوان دوو سەردەمدا دادەنرێ. یەکەمیان سەردەمی زاڵبوونی تورکەکانە بە سەر پۆستەکانی دەوڵەت لەگەڵ مانەوەی سامی خیلافەت. دووهەمیان زاڵبوونی تورکەکانە لەگەڵ نەمان سامی خیلافەت و دابەزینی پلە و پایەی خەلیفەکان([1])

تورکەکان لە سەردەمی (الواثق) دا پێی خۆیان لە دەسەڵاتدا جێگیر کرد و

---

[1] محمود و الشریف : سەرچاوەیەکی پێشوو : لا ٢٢٩.

سەرۆکەکانیان زۆر دەستیان دەرۆشت، تەنانەت خەلیفە ناچار بوو نازناوی سولتان ببەخشێ بە ئەشناس و کۆمەڵێ ماف پێ بدا لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەرکە سەربازیەکانی، بەوەش بووە یەکەم خەلیفە سولتان بۆ خۆی دانێ[1]. کاروباری جەزیرە و وڵاتی شام و میسری خستە ژێر دەسەڵاتی، هەروەها ویلایەتی خۆراسان و سند و ناوچەکانی دەوروبەری دیجلەی بە ئیتاخ راسپارد [2].

لەئەنجامی ئەم فراوانخوازیە لە دەسەڵاتدا، تورکەکان زاڵبوون بەسەر پایتەختی خیلافەت و سەرجەم هەرێمەکانیان کۆنترۆڵ کرد، ئەوجا هەنگاوێکی تریان نا تا دەسەڵاتیان بەردەوام بێ، کەوا دەبێ بەسەر خودی خەلیفەشدا زاڵبن چونکە ئەو سەرچاوەی ئەم دەسەڵاتەیە. بۆیە دەوروبەریان گرت و چاودێری جموجوڵیان دەکرد و بەشدار دەبوون لە وتوێژە سیاسیەکاندا و نەرۆیشتن بۆ ویلایەتەکانیان بەڵکو جێگریان بۆ خۆیان لەناویا دانا[3].

ئەم تەگبیرەش هەنگاوێکی سیاسی بوو بەرەو جیا بوونەوەی ویلایەتەکان لە ئیدارەی ناوەندی. چونکە بریکارەکان تەماحی ویلایەتەکانیان کرد، جا لاواز بوونی دەسەڵاتی ناوەندی و بێ ئاگایی خەلیفە لەوەی کە لە ویلایەتەکاندا روودەدات بە هۆی دڵنیابوونی لەو تورکانەی کە حوکمیان دەکرد، بەهەلزانی و جیایان کردەوە.

هەروەها تورکەکان هەنگاوێکی تریان نا، بۆ ئەوەی مشتیان لەسەر خیلافەت توند بکەن، ئەوە بوو دەستیان وەردا لە هەڵبژاردنی خەلیفەکان و دامەزراندنیان. جا (الواثق) دواین خەلیفە بوو کە لەسەر پەیڕەوکردنی شێوازی کۆن دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەوجا (الواثق) کە مرد، موحەممەدی کوڕی نەکرد بە جێنشینی خۆی بەهۆی بچووکی تەمەنیەوە، بۆیە ململانێ لە نێوان دوو گروپی سەرەکی دەستیپێکرد دەربارەی هەڵبژاردنی خەلیفە گروپی یەکەم پێکهاتبوو لە گەورە پیاوانی دەوڵەت لە کوڕەکانی ماڵی عەباسی و (موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیک ئەلزەیات)ی وەزیر و

---

[1] السيوطي : تاريخ الخلفاء: ٢٤٠.

[2] اليعقوبي : ب ٢ لا ٤٤١.

[3] المسعودي : ب ٤ لا ٣.

گەورەی دادپرسان (ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود)، ئەوە بوو موحەممەدی کوڕی (الواثق)یان کاندید کرد بوو، گروپی دووەم بریتی بوو لە هێزی گەشە کردووی تورك کەوا کاری بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی خۆی دەکرد بە رابەرێتی (وصیف)ی تورکی، جا جەعفەری کوڕی (المعتصم)یان کاندید کرد بوو. ئەوە بوو ئەم گروپە سەرکەوت لەسەپاندنی کاندید کراوی خۆی بۆ خیلافەت. بەوەش پۆستی خیلافەت بە جەعفەر سپێردرا و نازناوی ((المتوکل)) ی لێنرا. ([1])

ئەم بەسەرهاتە پێشینەیەکی مەترسیدار بوو لە دامەزراندی خەلیفەکانی دواتر، ئەوەبوو سەرکردە تورکەکان بوونە خاوەن دەسەڵاتی راستەقینە، کەس بە خەلیفە نەدەکرا ئەگەر ئەوان پەسەندی نەکەن و رازی نەبن لەسەری، هەر پیاوێك خۆیان بیانەوێ، کاندیدی دەکەن و بەپێچەوانەوە. بەوەش مشتیان لەسەر کاروباری خیلافەتدا توند کرد بە ئارەزووی خۆیان ئاراستەیان دەکرد.

خەلیفەکان بە ئاسانی ملکەچی دەسەڵاتی تورکی نەبوون بەڵکو بە توندی بەرەنگاری بوونەوە، هەوڵیاندا ((سازێنەری خەلیفەکان)) لەناو بەرن. بەڵام ئەوەندە بەهێز نەبوون بتوانن رووبەرووی ئەم دەسەڵاتە زۆردارە ببەنەوە.

(ئەلموتەوەکل) لە (٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٧-٨٦١ن) بە پشتیوانی تورکەکان خیلافەتی گرت دەست و هەستیانکرد خیلافەت ناتوانێ دەست بەرداری خزمەتەکانیان بێ، ئەمەش وایکرد توند و رەقتر رەفتار بکەن. زۆری پێنەچوو ئەم خەلیفە هەستی بە فشاری ئەوان لەسەر خیلافەت کرد، هەروەها بە زۆرداریان لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا و رێز نەگرتنیان لە خودی خەلیفە. بۆیە بڕیاریدا دەسەڵاتیان کەم بکاتەوە و بە ئیتاخ دەستی پێکرد و توانی لە پۆستەکانی دووری بخاتەوە و خستیە زیندانەوە، لەساڵی (٦٣٥ك/٨٥٠ن) لە ناو زینداندا کۆچی دوایی کرد ([2]).

بۆ ئەوەی رێگە لە تورکەکان بگرێ دەست وەرنەدەن لە هەڵبژاردنی جێنشین بۆی، ئەلموتەوەکل بە ئەنقەست بەیعەتی دا بە هەر سێ کوڕەکەی بۆ جێنشینێتی،

---

[1] الطبري: ب ٩لا١٦٨.١٦٩.

[2] الطبري: ب ٩لا١٦٨-١٦٩.

(محمد المنتصر)، و (أبو عبد الله المعتز) و (ابراهيم ا لمؤيد)، ولاتی له نێوان کوڕەکانیدا دابەش کرد، (المنتصر)ی کرد بە فەرمانڕەوای هەموو مەغریب، (المعتز)یشی کرد بە فەرمانڕەوای هەموو ڕۆژهەلات، (أجناد حمص) و دیمەشق و فەلەستینیشی رادەستی (المويد) کرد، پاشان لەساڵی (٢٤٠ك/٨٥٤ز) خەزنکردنی پارە و پوول لە هەموو ولاتدا و خانەکانی دراو و چاپکردنیشی بە (المعتز) سپارد و فەرمانیدا درهەم بە ناوی چاپ بکرێ[١].

جا ئەو کاتەدا تورکەکان مەترسی و ڕەهەندی ئەو کارەیانە زانی، زیاتر رقیان لە خەلیفە هەلگرت، دوورخستنەوەیان لە پۆستەکانیان بە یەکەم هەنگاو دانا بۆ لە ناوبردنیان، بۆیە کەوتنە پیلانگێڕان و تەڵەکەبازی، (المتوكل) لەم کەشە خنکێنەرەدا هەستی بە دڵتەنگی و جارسی کرد. لە بەرئەوەی بوونی لەسامەرا دەیخاتە ژێر دەسەلاتیان و نەیدەتوانی داخوازیە زۆرەکانیان بۆ پارە دەستکەوتن جێبەجێ بکات، هەوڵیدا خۆی لەچنگیان رزگار بکات ئەوەش بە ڕۆیشتنی بۆ دیمەشق و کردنی بە شارنشینی خۆی، بەشکو کەسانێکی تیا بدۆزێتەوە لەرەگەزی عەرەبی پاڵپشتی بکەن، بەلام هەلومەرجی ناوخۆیی یارمەتی نەدا بمێنێتەوە و پاش بەسەربردنی سێ مانگ لەوێ ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ سامەرا[٢].دوژمنایەتی نێوان خەلیفە و تورکەکان لەم قۆناغەدا گەیشتە خاڵی نەگەڕانەوە، دەبوو یەکێکیان ئەوەیتر لە ناو بەرێ. ئەوە بوو تورکەکان خێراتر جولانەوە و بە هاوکاری (المنتصر) کەوا رقی لە باوکی هەلگرت و پەست بوو لێی چونکە هەوڵیدا جێنشینێتی بگۆڕێ ئەوەش بەپێشخستنی (المعتز) لەپێش ئەم، سەرەڕای لەیەك نەچوونی رای سیاسییان سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ (طالبي)یەکاندا[٣].

کوشتنی (المتوکل) یەکەم ڕووداوی دەستدرێژکردن بوو لەسەر خەلیفە

---

[١] الطبري : ب ٩: ■ ١٨٠.١٧٥.

[٢] هەمان سەرچاوە: ل ٢١٠.

[٣] (المنتصر) بە هۆی دڵڕەقی باوکی لەگەل ـ طالبي ـ یەکاندا، تووڕە بوو لێی، چونکە ئەو هاوسۆز بوو لەگەڵیاندا وبە خزم تەماشای دەکردن و نەدەبوو لەپیرۆزیان کەم بکاتەوە.

عەباسیەکان. چونکە ئەوان پێشتر کەسیان لێ نەکوژراوە جگە لەئەمین ئەوەش پاش دۆڕاندنی لەجەنگدا، ئەمەش پێی تورکەکانی لەدەسەلآتدا جێگیر کرد، هەروەها وریاکردنەوەیەك بوو بۆ هەر عەباسیەك بیەوێ بچێتە سەر تەختی خیلافەت کەوا دەبێ دوو شت هەلبژێرێ: یان دەبێ بە تەواوەتی ملکەچی حەزو ئارەزووەکانیان بێ، یان دەکوژرێ. ڕووداوی کوشتنەکە شەپۆلێکی رق و کینەیی ووروژاند دژی زالبوونی سەربازی تورکی. ئەوە بوو لە سالی(٢٤٨ك/٨٦٢ن) لە سامەرا خۆنیشاندانێکی میللی سازکرا نکولی هاولاتیانی دەربڕی بەهۆی گالتە و سوکایەتی کردنیان بە خیلافەت ([1]).

شتێکی ئاسایی بوو (المنتصر) (٢٤٧ــ ٢٤٨ك/٨٦١ــ٨٦٢ن) کەوا تورکەکان بەیعەتیان پێدا و کردیان بە خەلیفە، ملکەچی دەسەلآتی ئەوان بێ، هیچ شتێکی لەدەست نەبوو جگەلە ناوەکەی، ئەوەش لەسەر دراو ناوی هەبوو و لە وتارەکاندا ناو دەبرا. ئەوجا لەوە ترسان (الموعتز) و (المويد) دوو کوڕەکەی (المتوکل)، یەکێکیان خیلافەت بگرنە دەست لە پاش (المنتصر) و تۆلەی خوێنی باوکیان لێیان بکەنەوە، بۆیە فەرمانیان بە (المنتصر) کرد هەر دووکیان لە جێنشینێتی لابەرێ. خەلیفە نەیوێرا بەرهەلستیان بکات و بە ناچاری ملکەچی داواکەیان بوو، هەردوو براکەی ناچار کرد خۆیان لابەرن([2]).

ئا بەم شێوەیەدا (المنتصر) درکی بە مەترسی زالبوونی تورکەکان کرد، بۆیە رقی هەستا و هەولی دا رابەرەکانیان لەناو بەرێ، ناوی ((بکوژانی خەلیفەکان))ی لێنان، تورکەکانیش وریای ئەم مەترسیە بوونەوە، بۆیە لە رێگای (پزیشکی تەیفوری) کەوا بە نەشتەرێکی ژەهراوی کەلەشاخی گرت و لە ناویان برد([3]).

تورکەکان پەیمانیاندا قسەیان یەکێ بێ لە هەلنەبژاردنی هیچ کوڕێك لە کوڕەکانی (المتوکل) نەبادا تولەی خوێنی باوکیان بکەنەوە، رێککەوتن لەسەر دانانی(

---

[1] الطبري ؛ ب ٩:٢٥٦٧، ٢٥٨.

[2] هەمان سەرچاوە : ٧ ٢٤٤.

[3] الطبري ؛ ب ٩:٢٥١٧.

ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی-المعتصم) و نازناوی ((المستعین))یان لێنا، دابەشبوونە سەر پۆستە گەورەکانی دەوڵەتدا. ئەوە بوو خەلیفە، (ئەحمەدی کوڕی-الخصیب)ی خستە سەر نووسین، میسر و مەغریبی رادەستی (ئەتامش) کرد و کردی بە وەزیری خۆی، هەروەها (شاهك)ی کرد بە خزمەتکار لەسەر ماڵ و بەرزە وڵاخ وپاسەوان و کاروبارە تایبەتەکانی و خۆی و (ئەتامش)ی پێش هەموو خەڵکی دانا ([1])

سەردەمی (المستعین) (٢٤٨_٢٥٢ك/٨٦٢_٨٦٦ز) بەپەشێوی و یەکتر هاڕین لەسەر دەسەڵات دەستپێکرد. ئەوە بوو لە سامەڕا شۆڕشێك بە ناوی (المعتز) هەڵگیرساو هاوڵاتیان و تورکەکان هاتن بەیەکە لە شەقامەکاندا و بە سەرکەوتنی تورکەکان کۆتایی هات. لە ئەنجامی زۆر و ستەمیان، خەڵکی لەبەغدادا هەڵچوو و گردبوونەوە و دەستیانکرد بەهاوار و بانگەشەکردن بۆ شەڕ([2])، بەڵام تورکەکان بارودۆخەکەیان کۆنترۆڵ کرد.

وادیارە یەکڕیزی تورکەکان بەردەوام نەبوو. ئەوان پاش ئەوەی بەسەر هاوڵاتیاندا سەرکەوتن دوو بەرەکی کەوتە نێوانیان، (المستعین)یش ئەم ناکۆکیانەی بە هەلزانی و کەوتە لەناو بردنی رابەرەکانیان، (ئەحمەد -الخصیب)ی دەربەدەر کرد بۆ دوورگەی (کریت).([3]). ئەتامش و باغری-یشی کوشت ([4]) پاشان هەڵهات بۆ بەغداد بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ بە خەڵکی بەغداد ([5]).

ئەو کاتەش تورکەکان لابردنیان راگەیاند و بەیعەتیان بە (المعتز)دا کەوا زۆربەی سەرکردەکانیان لەدەوری کۆبوونەوە، لەکاتێکدا خەڵکی بەغداد و هەندێ لەسەرکردە تورکەکان کەوا هەڵهاتن بۆ ئەم شارە، پاڵپشتی خەلیفە (المستعین)یان کرد. ئەوجا شەڕ لە نێوان هەردوولا لە بەغداد و دەوروبەری هەڵگیرسا بەڵام تورکەکان یەکڕیزی خۆیان گەڕانەوە، بۆیە هەڵویستی (المستعین) لاواز بوو. میری بەغدادیش

---

[1] هەمان سەرچاوە : ٧/٢٥٦-٢٢٠، ٢٥٧.

[2] الطبري : ب ٩:٧/٢٦٢-٢٦٣.

[3] هەمان سەرچاوە : ٧/٢٥٩.

[4] هەمان سەرچاوە : ٧/٢٦٣-٢٧٨، ٢٦٤-٢٨٠.

[5] سەرچاوەی پێشوو.٧ ٢٨١.

(موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر) کە زانی ئەو لە هەڵوێستێکی تەنگانەیە وازی لێهێنا، ئەویش بەباشی زانی دەست لەخیلافەت هەڵگرێ، هەرچەندە خەڵکی سادە پاڵپشتیان دەکرد. لەساڵی (٢٥٢ـ٢٥٥ك/٨٦٦ـ٨٦٩ز) بەیعەت درا بە (المعتز) بۆ خیلافەت. (المستعين)یش دەربەدەر کرا بۆ بەسرە، بەڵام تورکەکان ترسان لەوەی بە زیندوویی بمێنێ، بۆیە ئەنقەست کوشتیان([1]).

بارودۆخی خیلافەت لەسەردەمی (المعتز)دا زۆر باش نەبوو. چونکە خەلیفە گەڕایەوە بۆ سامەڕا و کەوتە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی تورکی. لەلایەکی دیکەوە، زۆر و ستەمی تورکەکان زیاتر بوو و ئاژاوەنانەوە و پارە داواکردنیان زیادی کرد، خەلیفەش نەیتوانی بەدەمی داواکاریەکانیان بچێ بۆیە لایان بردو (المويد)ی برایان خستە جێگەی. بەڵام خەلیفە براکەی ناچار کرد خۆی لابەرێ وپاشان کوشتی، هەندێ لە رابەرە تورکەکانیشی کوشت وەکو ـ(وصيف) و (بغا)، چونکە ئەم دووانە بەرپرس بوون لە شەڕی ناوخۆی لەنێوان خۆی و (المستعين)دا. ([2])

تورکەکان نیازی خەلیفەیان زانی بۆیە کەوتنە جوڵە بۆ پاراستنی ژیان و دەستکەوتەکانیان، ئەوە بوو خەلیفەیان ناچار کرد خۆی لابەرێ و خیلافەتیان رادەستی (موحەممەدی کوڕی الواثق) کرد و نازناوی (المهتدى)یان لێنا، (المعتز)یشیان رادەستی کەسانێك کرد ئازار وئەشکەنجەی بدەن تاوەکو گیانی لەدەستدا.([3]).

(المهتدى)، (٢٥٥ـ٢٥٦ك/٨٦٩ـ٨٧٠ز) کەسێکی خۆپارێز و لەخواترس بووە([4]) زۆر حەزی لە چاکسازی بوو. بۆیە بەخۆی دەستی پێکرد. لە کەش و فشی ژیان دوورکەوتەوە، فەرمانی بەچاکە دەکرد و جڵەو گیری لە خراپە، مەی خواردنەوەی حەرام کرد، گۆرانی بێژی ئافرەتی یاساغ کرد و دادگەری نواند، هەموو هەینییەك لە

---

[1] المسعودي : ب ٤ لا ٧٩.

[2] اليعقوبي : ب ٢ لا ٤٦٨ـ٤٧٠.

[3] الطبري : ب [illegible] لا ٣٨٩ـ٣٩٠.

[4] ابن عمراني، محمد بن علي بن محمد : الانباء في تاريخ الخلفاء لا ٩٨.

مزگـەوتی گـشتی ئامـادە دەبـوو و وتـاری دەخوێنـدوە و پێـشنوێژی دەکـردن، سەرپەرشتی دیوانەکانی کرد و دەستیکرد بە گوێگرتن لەسکاڵای خەڵکی و گومەزێکی بۆ ئەم مەبەستە دروست کرد بە چوار دەرگاوە و ناوی گومەزی (قبە المظالم – گومەزی سکاڵانامەکان)ی لێناو بۆ خەڵکی پلەدار و سادە، تێیدا دادەنیشت([1])، مانەوەی لە پۆستی خیلافەتدا بووە مایەی بێزاری خەڵکی سادە و پلەدار.

(المهتدی) چاوەڕوان بوو سیاسەتی چاکسازیخوازی، بە سوودبەخش و بەرهەمدار بێ، بەڵام رەوشی گشتی ناوەوەی دەوڵەت و دەرەوەی رێگەی پێ نەدا، ئەوە بوو خەڵکی لە بەغداد دژی دەسەڵاتەکەی راپەڕین، پاشان سەربازەکانیش شوێنیان کەوتن بەهۆی دواکەوتنی مووچەکانیان([2])، (طالبی)یەکانیش لەزۆربەی هەرێمەکاندا ئاگری شۆڕشیان هەڵگیرساند([3])، شۆڕشی (زەنج)ەکانیش بەرپا بوو کەوا بۆ ماوەی چواردە ساڵ هەڕەشەی لە بوونی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دەکرد، (خەواریج)ەکانیش لە موسڵ راپەڕین، هەروەها (ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی ئەلشەیخ) یش – فەرمانڕەوای فەلەستین–و ئەردەن– راپەڕی.

بەڵام دەردی راستەقینەی خیلافەت زاڵبوونی تورکەکان بوو بەسەریدا، لە ناوبردنیان پێویستیەکی سەرەکی بوو بۆ چاکسازی کردن و هێنانەوەی سامی خیلافەت. بۆیە خەلیفە بڕیاریدا سەرکردە تورکەکان بدابە گژ یەکدا. بەڵام هەوڵەکەی شکستی هێنا و تورکەکان رێککەوتن لەسەر لەناوبردنی ([4]) لەپاش کوشتنی (المهدی)، تورکەکان بەیعەتیان بە (ئەبو لەعباس ئەحمەدی کوڕی – المتوکل) داو ناوی ((المعتمد))ی لێنرا (٢٥٦–٢٧٩ك/٨٧٠–٨٩٢ز) ([5]).لەئەنجامی ناکۆکی ناوخۆیاندا، تورکەکان داوایان لەخەلیفە کرد یەکێك لەبراکانی خۆی بکاتە سوپا سالار، ئەویش (أبو

---

[1] المسعودي : ب ٤ لا ٩٦.

[2] الطبري : ب ٩:لا٣٩٩،٣٩٢، ٤٠٦،٣٩٣.

[3] هەمان سەرچاوە : لا٤١٠،٤٢٣.

[4] سەبارەت بە لابردنی ئەلمەهدی پاشان مردنی بگەڕێوە بۆ هەمان سەر چاوە : لا٤٥٦،٤٦٩. چونکە بەوردی باسکراوە.

[5] الطبري : ب ٩:لا٤٧٤

أحمد گلحه الموفق)ی هەڵبژارد. ئەم پیاوە بەچرای بوژانەوەی خیلافەت دادەنرێ لەسەردەمی (المعتمد)دا. ئەم پیاوە هەموو کاروبارەکانی خستە ژێردەستی خۆی، وتار دراو و ناوی (أمیر المؤمنین)ی بۆ خەلیفە هێشتەوە. بەوەش پشتی تورکەکانی شکاند، بەتایبەتی پاش دۆڕانەکانیان لەبەردەم زەنجەکان و دەستەوسانیان لەبەرامبەر بڵاو بوونەوەی هەستی جیاخوازی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ.

بەڵام (الموفق) لەساڵی (٢٧٨ك/٨٩١ز) کۆچی دوایی کرد ([1]) خیلافەتیش پێویستی بە پیاوێکی بەهێز بوو پارێزگاری لەدەستکەوتەکانی بکات، بۆیە، (المعتمد)، (المفوض)ی کوڕی لە جێنشینێتی لابرد –پاش ئەوەی کە بێ دەسەلاتی خۆی نواند لە ململانێی نێوان خیلافەت و ناحەزکانیدا– و بەیعەتی بە کوڕەکەی (الموفق) دا (أبو العباس المعتضد)، پاشان زۆری نەخایاند خەلیفە دوای چەند مانگێك لە ناکاوە، کۆچی دوایی کرد ([2])

(المعتضد) (٢٧٩-٢٨٩ك/٨٩٢-٩٠٢ز) ڕێبازی باوکی گرتەبەر لەشەڕەکان و کارە ئیداریەکانیدا بە مەبەستی بەردەامبوونی بوژانەوەی خیلافەت و هێنانەوەی سامی، جا لەسەردەمی ناوبراو، دەسەلاتی تورکەکان بەردەوام کەم دەبووەوە. (المعتضد) لەپاش مردنی، (المکتفی) کوڕی خستەجێی خۆی (٢٨٩-٢٩٥ك/٩٠٢-٩٠٨ز) ([3])، پرسی بزوتنەوە جیاخواز و شۆڕشگێڕەکان وەکو (ئیسماعیلی) و (قرمطی) و (عوبەیدی)یەکان گەورە بوو، خەلیفەش هەوڵێکی زۆریدا بۆ سەرکوتکردنیان، ئەوە بوو بەڵاو چورتەمی بەسەر (قرمگی)یەکاندا هێنا و دەسەلاتی خیلافەتیشی سەپاندە سەر وڵاتی شامدا، دەسەلاتی (تۆلونیەکان)ی لە میسردا نەهێشت و گەڕانیەوە بۆ ئامێزی دەوڵەت.

(المکتفی) تەمەنی زۆر درێژ نەبوو، هێشتا شەش ساڵ بەسەر خیلافەتەکەیدا تێپەڕ نەبوو بوو کۆچی دوایی کرد، جا خیلافەت لەپاش ئەو گەڕایەوە بۆ لاوازی،

---

[1] هەمان سەرچاوە : لا ١٠ ٪١٠ ٢٠ ، ٢٢.
[2] المسعودي : ب ٤ لا ١٤٢.
[3] الطبری : ب ١٠ لا ٨٧.

بەهۆی ناکۆکی لەناو ماڵی خێزانی عەباسی و سەرهەڵدانی بزوتنەوە جیاخوازەکان، ئەمەش دەرفەتی بۆ تورکەکان رەخساند جارێکی تر هێز و دەسەڵاتی خۆیان بگەرێننەوە و رێبازی پێشوویان بگرنەبەر لەهەڵبژاردنی خەلیفەی لاواز تا دەسەڵاتیان بەردەوام بێ، بۆیە کاندید کردنی (عبد الله بن المعتز)یان رەتکردەوە چونکە بە توانا بوو و (أبو الفضل جعفر بن المعتضد) یان هەڵبژارد جا هێشتا لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا بوو خیلافەتیان رادەست کرد و نازناوی ((المقتدر)) ی لێنرا ([1]).

ئەلموقتەدیر لەئاستی ئەو رووداوە تێک ئاڵاوانە نەبوو کە لەدەوروبەریدا بوو، کاتێکیش پێگەیشت خەریکی حەزو ئارەزووەکانی بوو، بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی بۆ (موئنس)ی تورکی بەجێهێشت، لەسەردەمیدا دیاردەی دەستێوەردانی ئافرەتان لە کاروباری دەوڵەتدا دەرکەوت، ئاشوب لە ناوەوە و دەرەوە بڵاو بووەوە. ئەوە بوو بەهۆی تێکچوونی رەوشی ناوخۆ و گەندەڵی دەسەڵات، سەرانی سوپا هەڵچوونە گیانی و لەسەر تەختی خیلافەت لایانبرد و بەیعەتیان بە (عەبدوڵڵای کوڕی ئەلموعتەز) دا و نازناوی ((الراضي))یان لێنا. ([2])، وادیاردە هەندێ لەو سەرکردە تورکانەی کە هێشتا لایەنگر و دڵسوزی (المقتدر) بوون وەکو موئنسی خزمەتکار و موئنسی گەنجینەوان وغەریبی خاڵی (المقتدر) سەرکەوتن لە هێنانەوەی بۆ دەسەڵات و (عەبدوڵڵای کوڕی ئەلموعتەز)یان خستە زیندانەوە([3]).

وەکو جاران بارودۆخ گەڕایەوە بۆ شڵەژاوی و زیادەڕەوی لەپارە خەرج کردندا لەلایەن داروەدەستەوە، هەروەها زاڵبوونی ئافرەت زیادیکرد، سوپاش کەوتە سکاڵا کردن و نارەزایی دەربڕین لەم بارودۆخەدا و دابڕان کەوتە نێوانی خەلیفە و موئنسی خزمەتکار و کێشەکە بە کوشتنی خەلیفە و بەیعەتدان بە (موحەممەدی کوڕی – المعتضد) بۆ خیلافەت کۆتایی هات و نازناوی ((القاهر)) ی لێنرا، جا دوو شەوی مابوو لە (شەوال لەساڵی ٣٢٠ک/ تشرینی دووهەم ساڵی ٩٣٢ز. ([4])

---

[1] هەمان سەر چاوە : لا ١٣٩.

[2] الطبري : ب ١٠ لا ١٤١. المسعودي : مروج الذهب : ب ٤ لا ٢١٤.

[3] ابن عمراني : لا ١٢١.١٢٢.

[4] المسعودي : ب ٤ لا ٢١٤، بۆ وردە باسي ئەم رووداوانە بطەرێوە بۆ لاي : مسكوية : تجارب الامم ب ١ لا ٢٣٣ـ٢٤١.

خیلافەتی کورتی ئەلقاهر (٣٢٠_٣٢٢ك/٩٣٢_٩٢٤ز) لەخیلافـەتی (المقتـدر) باشـتر نـەبوو، چـونکە گێـرە شـێوێنی سـەربازەکان بـەردەوامبوو و بـۆ جـارێکی تـر پۆسـتی خیلافەت بووە جێی سووکایەتی پێکردن، مونئسی خزمـەتکار هەوڵـیدا لەگـەڵ (کـوڕی موقلەی) وەزیر رێککەون لەسەر یاخی بوون لەخەلیفە، بـەڵام (ئـەلقاهیر) کـەوا پێـی وابوو سەرکردە تورکـەکان دوژمـنی دەوڵەتەکـەین تـوانی ئـەم سـەرکردە تورکـە لـەناو بەرێ([1]).

وێـڕای بـەهێزی ئـەلقاهیر و دڵـڕەقێتی، سـەرئەنجام سـەرکردە تورکـەکان توانیـان دەستگیری بکەن و لەسەر خیلافەت لایبەرن وهەردوو چـاوی کـوێر بکـەن، پـێش ئـەم، لەخەلیفەکاندا کەس چاوی کوێر نەکراوە، لەساڵی (٣٢٢_٣٢٩ك/٩٣٤_٩٤٠ز) بەیعـەتیان بە خەلیفە (الراضي) دا ([2]).

ب – دەرکـەوتنی سیـستەمی (إمـرە الامـراء – مـیری میرەکـان):(٣٢٤–٣٣٤ك/٩٣٦–٩٤٦ز)

لە سەردەمی خەلیفە (الراضي) گۆڕانکاریـەك لـە کاروبـاری حوکمڕانیـدا روویـدا کـە پەیوەند بـە ناوەنـدی خیلافـەت و وەزارەت و رەوشـی تورکـەکان. ئـەم گۆڕانکاریـەش بەدەرکـەوتنی پۆسـتی ((إمـرە الامـراء – مـیری میرەکـان)) کۆتـایی هـات، کـەوا هەرکەسـێك وەریگرتبایـە کاروبـاری دەوڵـەتی هـەموو بـەڕێوە دەبـرد و دەسـەڵاتی دەگەیشتە باج وەرگرتن و ئیدارە، ئـەم پۆسـتە بەسـەر خیلافەتـدا زاڵ بـوو و خەلیفـە تەنها وەکو هێمایەکی لێهـات و هـیچ دەسـەڵاتێکی راستەقینەی نـەبوو لەحوکمڕانیـدا، هـەروەها دەسـەڵاتی وەزیرەکانیـشی نەهێـشت، ململانـێش لـە نێـوان خیلافـەت و تورکەکاندا کەوا بـۆ ماوەیـەکی زۆر، سـەردەمی عەباسـی دووهـەمی سـەرقاڵ کردبـوو، راوەستا.

ئـەم پۆسـتە لەسـاڵی (٣٢٤ك/٩٣٦ز) هاتـە دەرکـەوتن لەسـەر حیـسابی پۆسـتی وەزارەت. چـونکە (الراچـی) لـە بـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەوڵەتـدا پـشتی بـە چـەند

---

[1] السیوطي : تاریخ الخلفا، ل ٣٨٦.

[2] المسعودي : ب ٤ ل٢٣١، ٢٢١.مسکویه : ب ١ ل ٢٨٦.٢٩١، بەوردی باسکراوە.

وەزیرێکی لاواز بەست و نەیانتوانی ئەرکەکانی وەزارەت راپەڕێنن و دەسەڵاتیان لەدەستداو دوچاری تەنگ پێهەڵچنین زەوتکردنی سامانیان بوون، لەلایەکی دیکەوە، دەسەڵاتی تورکەکان، بەهۆی دوویەرەکی و پێشبرکێ لەسەر پلەو پایە و بڵاوبوونەوە ئیرەیی لە نێو سەرکردەکانیاندا، کەم بووەوە.

لەئەنجامی ئەم رەوشە خراپە، خەلافەت هەستی بە لاوازی وەزیرەکان و بێ دەسەڵاتی تورکەکان و چۆڵبوونی گەنجینەکان کرد، بۆیە چاوی بۆ فەرمانڕەوای میرنشینەکانی نزیکی عێراق تێبڕی بۆ ئەوەی چارەسەرێکی ئەم کێشەیە بکەن کە گەیشتە ئاستێکی زۆر خراپ و مەترسیدار. ئەوە بوو خەلیفە (الراضي)، (موحەممەدی کوڕی رائق) میری واست و بەسرە، بانگهێشت کردو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی رادەست کرد و دەستی لەسەرجەم دەسەڵاتەکانی دەوڵەت بەردا و نازناوی ((میری میرەکان)) ی لێنا([1]).ئەم پۆستەش بریتیە لە گواستنەوەی هەموو دەسەڵاتەکانی خەلیفە بۆ سەرکردەیەك کە سیفاتی سەرۆکایەتی مەدەنی و سەرکردایەتی سەربازیی تیا کۆ ببێتەوە([2]).

(ابن الاثیر) باسی رەوشی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دەکات لەسەردەمی (الراضي)دا، دەڵێت: ((....وە خەلیفە هیچی بە دەستەوە نەما جگە لەبەغداد و کاروبارەکانی، ئەوەش بەدەستی ئیبن رائق بوو. سەبارەت بە شارەکانی تر، ئەوا بەسرە بە دەستی ئیبن رائق بوو و خوزستان بە دەستی ئەلبەریدی، فارس بەدەستی (عماد الدولە بن بویهی) بوو و کرمان بە دەستی ئەبو عەلی موحەممەدی کوڕی ئەلیاس، رەی و ئەسفەهان و شاخەکان بەدەستی (رکن الدولە بن بویە) و شمکیری برای مرداویج بوو و ململانێیان لەسەر دەکرد، موسڵ و دیاربکرو (مچر) و رەبیعە بەدەستی بنەماڵەی حەمدان بوو، میسر و شام-یش بەدەستی موحەممەدی کوڕی (طغج)، مەغریب و ئەفریقیا بە دەستی ئەبو لقاسم (القائم بأمرالله بن المهدی العلوی) بوو و پێی دەوترا ((أمیر المومنین))، ئەندەلوس-یش بەدەستی عەبدولرەحمانی

---

[1] مسکویه : ب١ل٣٥٢،٣٥١. ابن عمراني : سەر چاوەی پێشوو ل١٢٨.

[2] مسکویه : هەمان سەر چاوە ل٣٥١. باسی دەسەڵاتی میری میرەکان دەکات. محمود و الشریف ل٣٦٨.

کوڕی موحەممەد کە ناونراوبوو بە (الناصرالاموی)، خۆراسان و ناوچەکانی دوای ڕوبار بەدەستی نەسری کوڕی ئەحمەدی سامانی بوو، (طبرستان) و جرجان–یش بەدەستی دەیلەمەکان. بەحرەین و یەمامە–ش بە دەستی ئەبو تاهیری – قرمگی)) ([1])، وادیارە دەسەلاتی ئیبن رائق لەساڵی (٣٢٦ك/٩٣٨ز) بەهۆی ڕکابەرێتی میرەکان لەسەری لاواز بووەوە. ئەوەبوو ئەبوعەبدوڵڵای بەریدی فەرمانڕەوای ئەهواز دژایەتی دەکرد، یەکێك لەسەرکردەکانی خۆشی کە ناوی (بجکم)ە لەدەسەلاتی یاخی بوو و لەساڵی (٣٢٧ك/٩٣٩ز) چووە ناو بەغدادەوە و بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەتدا زاڵبوو و پۆستی ((میری میرەکان))ی گرتە دەست. سەبارەت بە ئیبن رائق ئەوا بۆ وڵاتی شام هەڵهات([2]). (بجکم) نزیکەی سێ ساڵ لەپۆستەکەیدا مایەوە و ڕەوشی گشتی گەیشتە ئەوپەڕی شڵەژاوی و خراپی ([3]). لەساڵی (٣٢٩ك/٩٤١ز)، (بجکم) بەدەستی یەکێك لە تورکەکان کوژرا ([4])، پێش کوشتنی (بجکم) بە چوار مانگ خەلیفە (الراضي) لەتەمەنی سی و دوو ساڵیدا لە بەغداد کۆچی دوایی کرد. جا ماوەی خیلافەتەکەی نزیکەی حەوت ساڵ بوو([5])، پیاو ماقوڵانی دەوڵەت و تاکەکانی ماڵی عەباسی ڕاوێژیان لەناو یەکتریدا کرد دەربارەی هەڵبژاردنی کەسێکی گونجاو بۆ خیلافەت. ئەوە بوو (جەعفەری کوڕی– المقتدر)یان بۆ ئەم پۆستەیە هەڵبژاردو لە (مانگی ڕەبیعی یەکەم ساڵی ٣٢٩ ك/مانگی کانونی دووهەم ساڵی ٩٤٠ ز) بەیعەتیان پێدا و نازناوی ((المتقي)) لێنرا([6]).

(المتقي)، (٣٢٩-٣٣٣ك/٩٤٠-٩٤٤ز) تەنها گەمەیەك بوو بە دەستی ئەو سەرکردانەی کە ڕکابەرێتیان لەسەر دەسەلات دەکرد بەتایبەتی ئەبوعەبدڵلا لبەریدی و ئیبن رائق و

---

[1] ابن الاثير: ب ٦ ل ٢٥٤،٢٥٥.

[2] مسكويه: ب١ ل ٣٩٣،٣٩٦. ابن عمراني: ل ١٣٠.

[3] (الصولي) باسی ڕەوشی گشتی بەغداد دەکات لە کاتی حوکمی (بجکم)دا : اخبار الراضي بالله و المتقي بالله ل١٠٦.

[4] (٣)مسكوية: ب ٢ ل٩،١٠، ابن عمراني : ل ١٣٣،١٣٤.

[5] ابن الاثير: ب٦ ل٢٧٦.

[6] هەمان سەر چاوە : ل ٢٢٧،٢٧٨.

حەمدانیەکان. لەسەردەمی (المتقی)دا دەسەلاتەکانی پۆستی ((میری میرەکان)) کەوتە دەستی (ئەلبەریدی) کەوا لەپاش کوشتنی (بجکم) دەرکەوت بێ ئەوەی خەلیفە بەفەرمی ئەم پۆستەیەی پێ بسپێرێ، ئەوەش بە هۆی هەلویستە گۆڕاوەکانی، تەنها کردی بە وەزیر([1]) بەلام ویڕای ئەم پۆستە مەدەنییە، ئەو سەرکردایەتی سوپاشی گرتە دەست و ئەوەندەی میری میرەکان دەسەلاتی هەبوو.

وادیارە ئەو نەیتوانی بەدەنگی پێداویستیی سەربازەکان و داواکارییە زۆرەکانیانەوە بچێت، بۆیە بووە ئامانجێك بۆ تەلەکەبازیان.

بارودۆخی بەغداد تێکچوو و ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ بەسرە ([2]). ئەو جا ئیبن رائق بۆ جاری دووهەم پۆستەکەی گرتە دەست ([3]) پاش ئەوەی کەبانگهێشت کرا لەولاتی شام و لەگەلێ (ئەلبەریدی)دا ڕێککەوتن و پۆستی وەزارەتی پێدا([4]) ماوەیەك کارەکە ئاوەها مایەوە و پاشان ئەم دوو پیاوە تێکچوون و ئیبن رائق هەستا دەرکردنی ئەلبەریدی لەپۆستەکەی. ئەمیش سوپاکەی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر بەغداد، خەلیفە و ئیبن رائق- یش ناچار بوون هەلبێن و پەنایان بردە بەر بنەمالەی حەمدان لەموسل، ئەلبەریدی پۆستی میری میرەکانی زەوتکرد و بۆ جاری دووهەم چووە ناو بەغدادەوە([5]).

بەلام ئەلبەریدی و گروپەکەی خۆشەویستی خەلکیان بە دەست نەهێنا بەهۆی خەریکبوونیان بە تالانی و دزی کردن، لەلایەکی دیکەوە خەلیفە، (ناصرالدولە)ی حەمدانی کرد بەمیری میرەکان و لەسالی (٣٣٠ك/٩٤٢ز) لەسەر لەشکرێکی بێ شوماردا ناردی بۆ جەنگاندنی ئەلبەریدی، ئەوە بوو لە بەغداد دەریکرد و خەلیفەش لەهەمان ئەو سالەدا گەڕایەوە ([6]).

---

[1] مسکویە: ب١ل٢٣٢.
[2] ابن عمرانی : ل ١٣٤.
[3] مسکویە: ب ٢ ل٢٢.
[4] سەر چاوەی پێشوو : ل٢٥،٢٣. ابن الاثیر: ب ٦: ل ٢٨٤،٢٨٣.
[5] هەمان دوو سەر چاوە ل٢٧،٢٥، ل٢٨٥.
[6] مسکویە. هەمان سەر چاوە : ل ٢٨.

ئـا لـەم رووداوانـە، سـەرکردەیەکی تـورکی نـوێ دەرکـەوت نـاوی (تـۆزۆن)ە، (المتقی)ش پۆلیسی بەغدادی پێ سپارد و پاشان کردی بە میری میرەکان [1].

لەم کاتەدا حەمدانیەکان زاڵبوون بەسـەر بـەرێوەبردنی کاروبارەکـان لەبەغـداد-دا. بەڵام رەوشـی گشتی بـاش نـەبوو بـەهۆی بـەردەوامبوونی ململانێـی نـاوخۆیی[2] جـا ئەمانەش ناچار بوون پایتەختی خیلافەت بەجێ بهێڵن، بەتایبـەتی پـاش ئـەوەی ئـەو شـەڕەیانە دۆڕانـد کـە لەگـەڵ (تـۆزۆن)دا کردیـان، لەگـەڵ خەلیفەیـە گەڕانـەوە بـۆ موسڵ[3].

تـۆزۆن بـە بـەهێزترین مـیر دادەنـرێ لـەناو ئـەو میرانـەی کـە کاریـان گرتەدەسـت لەسەردەمی عەباسی دووهەمدا. چونکە ئـەم پیـاوە تـوانی دەسـت بەسـەر دەسـەڵاتدا بگـرێ لەکاتێکـدا دوو رکابـەری بـەهێزی هـەبوو کـە بـریتی بـوون لـە حەمدانیـەکان و بەریدیەکان. ترسا لەوەی خەلیفە هەوڵبدات لـە ئەخـشیدیەکان نزیکبێتـەوە لـە میـسر، بۆیـە فێڵـی لێکـرد تـا ئەوەنـدەی کـە جـارێکیتر بـۆ بەغـداد گەڕایـەوە، بـە رووکـەش گوێڕایەڵی خۆی بۆ خەلیفە نواند و ژێر بە ژێریش ئامـاژەی بـە هەنـدێ لـە هاوەڵـەکانی کرد دەستگیری بکەن و ناچاریان کرد دەست لەخیلافـەت هـەڵبگرێ و پاشـان هـەردوو چاویان کوێر کرد ئەمەش لە (مانگی سەفەر ساڵی ٣٣٣ک/مانگی تشرینی یەکەم ٩٤٤ز) روویدا، بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ زیندانیان کرد تا لە ساڵی (٣٥٧ک/٩٦٨ز) کۆچی دوایی کرد. تـۆزۆن، عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەلموکتـەفی وەکـو خەلیفـە هەڵبـژاردو نازنـاوی ((المستکفی)) لێنا. [4].

خیلافەتی (المستکفی) زۆری نەخایاند (٣٣٣-٣٣٤ک/٩٤٤-٩٤٦ز) ئەوە بوو سـاڵێك و چوار مانگ حوکمی کرد کـە تیایـدا تـۆزۆن دەسـەڵاتی پاوانـە کردبـوو، ئـەوجا (کـوڕی شێرزاد) جێی گرتەوە و لە پۆستی میری میرەکان مایەوە تا ئەوکاتەی (معز الدولە بـن

---

[1] هەمان سەرچاوە: ب ٢ ل ٤٤.

[2] سەبارەت بەغداد لەم ماوەیەدا بگەڕێوە بۆ : الصولی ل ٢٣٤، ٢٣٧.

[3] السیوطی: ل٢٩٥، ٢٩٦.

[4] ابن عمرانی : ل ١٤١.

بویە) دەستی بەسەر بەغداد–دا گرت و پۆستی میری میرەکانی هەڵوەشانەوە([1]).

لەراستیدا دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی سوودی لەم سیستەمە نەبینی کەوا (الراضي) بۆ رزگارکردنی خیلافەت لە گرفتەکانی داینا. بەڵکو بارودۆخی خراپترکرد، هەرکەسێك لەسەردەمی (الراضي) و (المتقي) و (المستكفي) بکۆڵێتەوە دەبینێ بریتی بووە لە زنجیرەیەك لەململانێی نەبچڕاو لە نێوان پیاوانی دەوڵەتی عەباسی کەوا هەموو یەکێکیان کاری دەکرد بۆ زەوتکردنی دەسەڵات و گرتنە دەستی پۆستی میری میرەکان([2]).

## ج. بزوتنەوەی زەنج : (٢٥٥_ ٢٧٠ك/٨٦٩_ ٨٨٣ن)

### سروشتی ئەم بزوتنەوە و ئامانجەکانی

ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە، بزوتنەوەی زەنج کەوا لەساڵی ٢٢٥ك دامەزرا و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیی ماندوو و شەکەت کرد پێش ئەوەی لە ناوی بەرێ، جێی سەرنجە توێژەر بۆ چارەسەرکردنی بانگهێشت دەکات لەمیانەی ناسینی سروشت و ئامانجەکانی و هۆی پشتگیری کردنی خەڵك لێی. بۆ زانینی سروشتی بزوتنەوەکە پێویستە لەسەرمان بکۆڵینەوە لەو رەگەز و گروپانەی کە پشتگیریان لێکرد و بەشداریان تیا کرد.

ئەوەی راستی بێ کۆڵەکەی ئەم بزوتنەوەیە، لەسەرەتای دەستپێکردنی، هەندێ عەرەبی سەرچڵ بوو، وەکو موهەلەبیەکان و حەمەدانیەکان و هەروەها هی تریش. سەبارەت بەو گروپانەی کە بەشداریان لەم بزوتنەوەیە کرد، ئەوە جۆراوجۆر بوون : زەنجەکان، خەڵکی گوندەکان، عەرەبە لاوازەکان، چەند هۆزێکی عەرەبی هەڵچوو لە دەسەڵات. سەبارەت بەو کەسایەتیەی کە سەرۆکایەتی ئەم کۆمەڵەی دەکرد، ئەوا عەلی کوڕی موحەممەد بوو بەڕەسەن فارس ([3]).

---

[1] مسکویه : ب ٢ ل ٨١، ٨٤، ٨٢_ ٨٥.

❁ زەنج: نەوەیەکی سودانیین. الحموی ، یاقوت: معجم البلدان: ب ١ ل ١٥٣.

[2] حسن: ب٢ ل ٣٥.

[3] ئەو لە گوندی (وەرزنین)ە، کە یەکێکە لە گوندەکانی (رەی)، نزیکی تارانی ئێستا.

ناوبراو کەسایەتیەکی سەرسامکەرە، چونکە توێژەر گەلێ ناڕەحەتی دەبینێت لە ناسینەوەی رەگ وڕەچەڵەکی، ئەوەش بە هۆی زۆر هەڵگەڕانەوەی بەپێی ئەو بارودۆخەی کەپێدا تێپەڕ دەبوو. ناسراو بوو بە پیاوێکی ئاواتبەرز و زۆر بەهرەدار و دونیا ویست، چونکە بەشدار بوو لە تالآن و دزی کردن.

وادیارە ناوبراو ژیانی ئاسایی نەبووە، ئەو وەکو شاعرێك لە کۆشکی خەلیفە لە سامەڕا دەستی پێکرد، پاشان هەوڵی دا دژی رژێم راپەڕێ لە بەحرەین-دا بە مەبەستی گەیشتن بە دەسەلآت، بەلآم سەرنەکەوت لە بەدیهێنانی مەبەستەکەی. ئەوجا رێبازێکی دیکەی گرتەبەر و وەکو سەرکردەیەکی ئاینی و پێشبین و پێغەمبەر دەرکەوت، رەچەڵەکی خۆی بۆ عەلەویەکان گەڕانەوە([1]) بۆ ئەوەی هاوسۆزی و پشتگیری شیعەکان بە دەستبێنێ، شوێنکەوتووانی پلەی پێغەمبەریان پێدا تەنانەت باجیشی بۆ کۆکرایەوە([2]).

وادیارە خەڵکێکی بێ شومار لەبەحرەین نکۆڵیان لێکرد، بۆیە بە جێیهێشت و رووی کردە بیابان نشینەکان بۆ راکێشکردنی عەرەبەکانی. وای بانگەشە کرد کە ئەو بەرەچەڵەك شیعەیەو ئەو (یەحیای کوڕی عەمری ئەبو لحوسەین) ە، هەندێ لە عەرەبەکان شوێنی کەوتن، جا سوودی لێوەرگرتن بۆ زاڵبوونەوەی بەسەر بەحرەین-دا، بەلآم دواتر دۆڕا و بۆ بەسرە هەڵهات([3]). لەو ماوە کورتەی کە لە بەسرە مایەوە تێبینی هەلومەرجی ناوەکی و سیاسی و کۆمەلآیەتی ئەو شارەی کرد، جا کۆمەڵگەی بەسرە دابەش بووبوو بەسەر خۆیدا ([4]). هەوڵیدا ئەم ناکۆکیە بۆ بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە بەلآم شکستی هێنا. لەهەمان کاتدا، ژیانی ئەو کۆیلانەی کە لەزەلکاوەکانی نزیکی بەسرە کاریان دەکرد بەهەلێك زانی بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانی. بەلآم ئەو

---

[1] وای بانگەشە کرد کە ئەو عەلی کوڕی ـ الفضل- ی کوڕی حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەلعەباسی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب-ە.

[2] الطبری : ب ٩ لا ٤١٠.

[3] لە شوێنێك دۆڕا ناسراوە بە (ردم). دەربارەی ئەم رووداوانە بڕوانە بۆ: الطبری:ب ٩لا ٤١٢.

[4] بەسرە لەو کاتدا بە دەستی دوو گروپی دژ بە یەك، بیلالی و سەعدی، دەینااڵاند. هەمان سەرچاوە: لا٤١١.

دەرکرا لەوێ و بەرەو بەغداد رۆیشت ([1]) لەبەغداد رەچەڵەکێکی عەلەوی نوێی هەڵبژارد، خۆی گەڕانەوە بۆ ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی زەید([2]). پاشان رەوشی تێکچووی پایەختی خیلافەتی بەهەلزانی و هەوڵیدا هەڵمەت بەرێ بۆسەر دەسەڵات. نەیتوانی، بەهۆی زاڵبوونی تورکەکان بەسەر رەوشەکەدا، بۆیە لەساڵی (٢٥٥ك/٨٦٩ز) گەڕایەوە بۆ بەسرە تا رابەرێتی بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێر بکات، بەبانگەشەی ئەوەی خوا بۆ ئازادکردنی بەندە و رزگارکردنیان لە چارەڕەشی و بەدبەختی ناردوویەتی، هەروەها وا بانگەشەی کرد کە ئەو (علم الغيب) دەزانێ و خۆی کرد بە پێغەمبەر([3]).

لە راستیدا بیرۆکەی (مەهدی چاوەڕوانکراو) لەگەڵ (عەلی کوڕی مەحەممەد) هەر مابووەوە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی سیاسیدا و زیرەکانە سودی لێوەرگرت، ئەو بەناساندنی خۆی وەکو مەهدی، هەستی عەلەویەکانی دەجوڵاند کەوا بە دەستی تاڵی ژیانەوە دەیان ناڵاند، جا بەهیوابوون مەهدیەکی فریادڕەس بێ ولەم خەم و خەفەتە و لەم رۆژەڕەشە دەربازیان بکات ([4]). زۆر جەختی کردە سەر رەسەنێتی رەچەڵەکی خۆی و لەسەر دراوەکەی نەخشاندی و ناوی خۆی نا ((عەلی کوڕی موحەممەدی مەهدی فریاد ڕەس)). هەروەها لەیەکێك لەقۆناغەکانی ژیانیدا مەزهەبی خەواریجی راگەیاند کەوا بنەماکانی گونجاو بوو لە گەڵ مەیلی شۆڕشگێڕی هاوڵەکانی، ئەوەبوو لەپێناوی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی جەنگا ([5])، بە هەردوو رەنگی سەوز و سوور دروشمەکانی لەسەر ئاڵاکان نووسی، ئەم دوو رەنگەش رەنگی عەلەویەکان و رەنگی خەواریجەکانە. بیرو بۆچونی عەلی کوڕی موحەممەد دەربارەی خیلافەت لەگەڵ تێڕوانینی شیعەکاندا پێچەوانە بوو، ئەمان لە سەر(ورایە) جەختیان دەکردەوە، ئەویش بۆچوونی خەواریجەکانی لەخۆگرتبوو کە لەسەر (شوری – راوێژکردن)

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل٤١٢٧.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] الطبري:ب ٩ل ٤١٢.

[4] علبي، احمد: ثورة الزنج و قائدها علي بن محمدل٥.

[5] ئەوە لە سەر بەیداخەکەی ئایەتی سەدو یانزەی نووسی لە سورەتی تەوبە، ئەمەش باشترین ئایەتە بە لای خەواریجەکانەوە، هەروەها لە سەر دراوەکانیشی نەخشاندی.بگەڕێوە بۆ علبی:ل ٥٨.

هەستابوو، بۆیە عەرەبە دەشتەکیە سادەکان و عەرەبی بەسرە و ئەهواز و واست و ناوچەکانی دەوروبەری لێی دوور کەوتنەوە، هەروەها (قرمگ) رازی نەبوو پەیوەندی ئاینی لە گەڵیا دروست بکات، سەبارەت بە توندوتیژی و دڵڕەقی بەرامبەر دوژمنەکانی، ئەوا کردی بە خەواریجێکی توندڕەو، سەرەڕای ئەمەش، ئەوە وەکو کۆیلە لەگەڵ بەدیلگیراوەکانی جەنگدا مامەڵەی دەکرد، بەڵێنی بە هاوەڵەکانیدا بیانکاتە خاوەنی ماڵ و خزمەتکار، واتە گۆڕینی ژیانی زەنجەکان لە کۆیلاتیەوە بۆ خاوەن کۆیلە([1])

ئەم لەیەکنەچوونەش لەبیروباوەڕی بزوتنەوەکەی دووری دەخاتەوە لەوەی کە بیروباوەڕێکی تایبەتی هەبێ بەڵکو وەکو بزوتنەوەیەکی چەکداری دژی رژێم دەری دەخات، هەروەها خۆشی وەکو پیاوێکی سەرچڵ و بەتەمای دەسەڵات نیشان ئەدات([2]) ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە، ئاواتە سیاسیەکانی عەلی کوڕی موحەممەد کە بریتیە لە –دەسگرتن بەسەر دەسەڵاتدا– بە پاڵنەری راستەقینە دادەنرێت بۆ راپەڕینی بزوتنەوەکەی، ئەمەش رادەیەکی زۆر لەجۆش و خرۆشی کەم کردەوە و تەنها بە گروپێك لە زەنجەکان تایبەتی کرد و وردە وردە ئەو گروپەکانیتری دوورخستەوە کە لەگەڵیا بەشدار بوون[3]).

## پاڵنەرەکانی بەدەنگەوە چوونی ئەم بزوتنەوەیە

کۆمەڵێ پاڵنەری جیاواز ئەو گروپانەی جوڵاند بۆ ئەوەی پشتگیری لە عەلی کوڕی موحەممەد بکەن، لەوانەش :

– تەحەداکردنی حکومەتی ناوەندی بە مەبەستی دەرچوون لەبازنەی بەدبەختی و چارەڕەشی.

– بەدەستهێنانی (دەست کەوت) لە رێگەی دزی و تاڵانەوە.

---

[1] عمر، فاروق :التاریخ الاسلامی ■ فکرالقرن العشرین :لا ۳۳۵.

[2] )هەمان سەرچاوە.

[3] عمر :لا ۳۳۵.

- رزگار بوون له کاری قورس یاخود له سەختی ژیان([1])

سەبارەت بەو پاڵنەرانەی کە هێشتی ژمارەیەکی زۆر لە کۆیلەکان بەدەنگی ئەم بزوتنەوەیە بچن، ئەوە بریتیە لە: پاڵنەری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

لەرووی پاڵنەری سیاسیەوە([2]) ئەوا پێش سەرهەڵدانی بزوتنەوەی زەنج، تورکەکان دەسەڵاتێکی گەورەیان هەبوو بەسەر خیلافەتدا. ئەوان زیاتر بژێویخواز بوون، بەپێی ئەو هۆکارانەی چالاکیان دەکرد کە پێی بتوانن لەدوژمن و رکابەرەکانیان بدەن، تاکرەو بوون لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا ([3])، ئەمەش بووە هۆی زۆر بوونی پیلانی سیاسی و کودەتای سەربازی، بۆیە خیلافەتی لاوازکردەوە و خەلیفەکانی بێ دەسەڵات کرد.

لەئەنجامی تێکچوونی رەوشی سیاسی، مشتی بەرهەڵستکارەکان قایم بوو، بەتایبەتی بەرهەڵستکاری شیعی، ئەوە بوو دەسەڵاتی عەلەوی فراوان بوو و لەناو خەڵکیدا تەشەنەی کرد، جا بزوتنەوە بەرهەڵستکارەکانیش هەر لەسەرەتای سەدەی سێهەمی کۆچییەوە کەوتبوونە جموجوڵ، بۆیە بزوتنەوەکانی دژ بە دەسەڵاتی ناوەندی زۆرەوە بوون و بزوتنەوە جیاخوازەکان فرەوە بوون، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ناوەندی خیلافەت. کەواتە، بەشێوەیەکی گشتی رەوشی سیاسی لەباربوو بۆ پیاوە سەرچڵەکان تا دەسەڵات ببەنەوە، لەکاتێکدا شەڕ لەوپەڕی گەرمیدا بوو لە نێوان حکومەتی ناوەندی و بەرهەڵستکارانی عەلەوی، سەرەڕای سەرهەڵدانی چەند فەرمانڕەوایەك لەهەندێ لە ویلایەتەکان کە تەنانەت هەر بەناویش دانیان بە دەسەڵاتی خیلافەت نەنا و کەوتنە گوزارشتکردن لە هیوا و ئاواتەکانی ئەم گروپە بەرهەڵستکارانە، لەگەڵ ململانێیەکی شارەوە لە نێوان دەرەبەگیەکان و کۆیلەکاندا کە دەرفەتێکی بۆ خۆی بەدیکرد لە بانگەشەکەی عەلی کوڕی موحەممەد

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل۳۲۸.

[2] بگەڕێوە بۆ علبی: ۱۹۸۷،ل۲۰۱.

[3] عمر: ل۳۳۲.

کە بە تەمای دەسەڵات بوو.

لەرووی پاڵنەری ئابوورییەوە([1])، ئەوا دوو دیاردەمان بۆ دەرئەکەوێ، دیاردەی ڕەوشی تێکچووی دارایی، دیاردەی چین چینایەتی لەکۆمەڵگەی عەباسیدا.

سەبارەت بە دیاردەی یەکەم، ئەوا لە نیوەی یەکەم لە سەدەی سێهەمی کۆچی، دارایی دەوڵەت بەرەو خراپی دەچوو بەهۆی زیادەڕەوی خەلیفە و سەرکردە تورکەکان لە خەرجکردن بە سەرخۆیاندا. سیستەمی پابەند بوون یاخود مسۆگەرکردن یەکێك بوو لەو دیاردانەی کە نیشانەی دواکەوتنی دارایی دەوڵەت بوو.([2]) وادیارە بووە سیستەمێکی باو و بڵاو. ئەوەی کە ڕەوشی دارایی زیاتر خراپکرد، جیاکردنەوەی (بیت المال)ی موسڵمانان بوو لەخەزێنەی تایبەتی خەلیفە، لەگەڵ بەهێزبوونی دەسەڵاتی تورکەکان کەوا دەستیان خستەسەر (بیت المال)، لەکاتێکدا خەلیفەکان پەرەیان بەداهاتی خەزێنە تایبەتەکانی خۆیان دەدا.

سەبارەت بە دیاردەی دووهەم ([3])، ئەوا کۆمەڵگەی عەباسی لەسەدەی سێهەمی کۆچیدا پێکهاتبوو لە سێ چینی کۆمەلایەتی، ئەوانەش:

١- چینی دەرەبەگی: پێکهاتووە لە خانەوادەی خەلیفە و سەرکردە تورکەکان و وەزیرە دەوڵەمەنەکان و خاوەن پۆستەکان، ئەمانەش خاوەن زەوی و زارن و پشت بە کشتوکاڵی دەبەستن وەکو سەرچاوەیەك بۆ سەروەت و سامانەکانیان. ئەوە بوو باری ئابووریان زۆر گەشەی کرد و بەرەو فراوانی و چڕبوون دەچوو، بۆیە پێویست بوو ژمارەی کۆیلەکان کەوا لە کێڵگەکان کاردەکەن، زیاد بکرێن، بە تایبەتی لە باشووری عێراق.

٢- چینی بازرگانان

---

[1] بگەڕێوە بۆ علبی:لا ٩٩،٨٩.

[2] بۆ نموونە بنەماڵەی تاهیر لەو کاتەدا پابەند بوون بە باجی خۆارسان و دەوروبەری.

[3] ئیسلام، بەلایەنی کەمەوە لە رووی (نظري)یەوە، پۆلینکردنێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، تەنها لە چێوەی ئەو ئەرکانە نەبێ کە خەڵکی لە کۆمەڵگەدا جێبەجێی دەکرد، هەروەها چەمکی چین چینایەتی لەسەر ئەو هەڵنەسابوو ئەگەر هەروا لە بنەچەیەکی ئۆرستوکراتی بێت ئەوە وەکو باو باپیرانی ماڵەکانی پارێزراون، بەڵکو شەرعیەتی شتەکان خۆی پێوانەی راستەقینە بوو لە دیاریکردنی چینەکان، سعد، فهمي: العامة في القرنين الثالث و الرابع للهجرة: ١٢٥،١٢٤.

### ٣- چینی کرێکاران

ناوەڕاستەکانی سەدەی سێهەمی کۆچی، زیادبوونی ڕۆڵی دەریەگەکانی بەخۆوە بینی ([1]) بە تایبەتی لە بەسرە، چونکە زەنجەکان لە زەویە مردووەکان کاریان دەکرد و پێویست بوو چاکی بکەن و وشکی بکەنەوە، بۆیە پێویستی کرد زیاتر پشت بە ئەو کۆیلانە ببسترێ کە لەڕۆژهەلاتی ئەفریقیاوە هێنراون، چونکە ئەوان دەستی کاری هەرزانن و لەشیان بە هێزە و بۆ کارکردن لە زەویە شۆرەکاتەکاندا دەگونجێن([2]). ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ زیادبوونی ڕۆڵی بازرگانی. ئەوە بوو بازرگانەکان هەستان بەکڕینی کۆیلەکان بە هەرزان بایی و دەیانفرۆشتەوە بە خاوەن زەویەکان لە بەسرە کەوا لەو ناوچەیە کۆیان کردبوونەوە.

بە تێپەر بوونی ڕۆژگار، کەلێنی نێوان ئەمان و نێوان چینی دەرەبەگی گەورەتر بوو، ناهاوسەنگی کۆمەلایەتی گەیشتە ئەوپەڕی، ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆیان بەدەنگی ئەو شۆڕشەوە بچن کە عەلی کوڕی موحەممەد بانگەشەی بۆ دەکرد.

لەڕووی پاڵنەری کۆمەلایەتیەوە([3]) ئەوا ئەو کۆمەڵە کۆیلانە ژیانێکی سەخت و ناڕەحەتیان دەگوزراند، دەبوو ئەوان لە وشکردنەوەی زەلکاوەکان کاریان بکردایە و شۆرەکاتی زەوییەکانیان لابردایە پاشان خوێکەیان بە وڵاخ بگواستایەتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تێدا دەخرێتە ڕوو و دەفرۆشرێ، ئەم هەموو کارەیان دەکرد بەرامبەر ژەمێ خواردن لە( قاوت) (حەڵوایەکە لە ئارد و خورما دروست دەکرێ) ([4]) و مرۆڤی تێر نەدەکرد، هەروەها لە چەند خێوەتگایەك کۆکرابوونەوە مەرجە گشتیەکانی تەندروستی تێدا دابین نەکرا بوو، بۆیە تووشی نەخۆشی کوشندە بوون، هەروەها تووشی فشاری دەروونی قورس بوون چونکە سەڵت بوون، ژندارەکانیشیان دوور لە

---

[1] مسکویە: ب ٢لا ٩٦.

[2] شۆرەکات: ئەو چینە خوێیەیە کە لە ناوی کەنداوی عەرەبیەوە دێت.

[3] بگەڕێوە بۆ علبی: لا ١٠٢-١٠٤.

[4] الطبري: ب ٩لا٤١٣. ناوچەی (شطالعرب) زەویەکی زەلکاویە وکە ناڵی زۆری تێدایە کەوا تووشی هەڵبەزو دابەزی ناوەکە دەبێت. بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار چینێکی خوێی زۆربەی زەویەکانی پۆشی بە شێوەیەك کشتوکاڵی تێدا مەحاڵ کرد. کاسبکارانی بەسرەش، بۆ لابردنی ئەم چینە خوێیە، دەستی کار لە زەنجەکانیان بەکار هێنا.

خێزانەکانیان دەژیان.

ئەوە بوو ئەم بارودۆخە کۆمەڵایەتیە خراپە وای لەم کۆیلانە کرد بە دەنگی بانگەشەکەی عەلی کوڕی موحەممەد-ەوە بچن کەوا بەڵێنی پێدان بەرەو ئازادی بیانبات و بیانکاتە خاوەن موڵك و بەدڵسۆزی بمێنێتەوە بۆیان تا کۆتایی، بیری خستنەوە بە سەختی و ناڕەحەتی ژیانیان، هیوای ئایندەیەکی گەشاوەی پێ بەخشین و خانوو کە تیایدا نیشتەجێ بن.

## پێکدادان لەگەڵ دەسەڵاتدا – کۆتایی بزوتنەوەکە

زەنجەکان بەردەوام بوون لەچوونە ریزی عەلی کوڕی موحەممەد تا ئەوکاتەی کە یەکەم رۆژی جەژنی رەمەزان هات، وتارێکی بۆ خوێندنەوە و نوێژی پێکردن، بیری خستنەوە بەو زۆر و ستەمەی کە بەدەستیەوە دەیان ناڵاند، هیوا و ئاواتی باشی پێ بەخشین، شاری (المختارە) کەوا دروستی کرد، کردی بە بنکەی دەستپێکردنی ([1]).

سەلماندی کە ئەو سەرکردەیەکی بە توانایە، چونکە هەڵمەتەکانی ناسرا بە شارەزایی لە کۆکردنەوەی هەواڵ، ئەوە بوو بەردەوام زانیاریی هەبوو دەربارەی جموجوڵەکانی سوپای خیلافەت. جا ئەو سیاسەتە جەنگیەی کە پەیڕەوی دەکرد و کەوا لەسەر بۆسەدانان هەستابوو، سەرکەوتنێکی پێ بەخشی بەسەر هێزەکانی خەلیفەدا. ئەوە بوو لەساڵی (٢٥٧ك/٨٧١ز) چووە ناو بەسرەوە و دانیشتوانەکەی کوشت و شارەکەی سوتاند.([2]) خیلافەت ئەو کاتەدا سەرقاڵ بوو بەشەڕی (یعقوب بن اللیپ الصّفار)، ئەمەش دەرفەتێکی دا بە عەلی کوڕی موحەممەد زیادەڕەوی بکات و دەسەڵاتی فراوان بکات و شارەکان کاول بکات، ئەوە بوو لەمیانەی دە ساڵدا (٢٥٥-٢٦٥ك/٨٦٩-٨٧٩ز) زاڵبوو بەسەر ناوچەیەکی بەرفراواندا کە لە نێوان ئەهواز و واست-دا درێژ بۆتەوە، بەغدادیش کەوتە بەر هەڕەشەی.

---

[1] لطبري:ب٩لا١٤٩-٤١٥.حسن:ب٣لا٢١١. ئەلموختارە دەکەوێتە سەر کەناڵی رووباری - ابی الخصیب - باشووری رۆژهەڵاتی بەسرە.

[2] الیعقوبي: ب ٢لا٤٧٤.الگبری: هەمان سەرچاوە لا٤٧١-٤٧٢.

ئەو کاتەش خەلیفە ئەلموعتەمەد، جەنگاندنی زەنجەکانی سپارد بە (أبو أحمد الموفق گلحە)ی برای. ئەم سەرکردەیە بە خۆی سەرۆکایەتی کارە سەربازیەکانی کرد، هەموو توانا سیاسی و ئابووری و سەربازییەکانی خستەگەڕ بۆ ئەوەی سەرکەوتن مسۆگەربکات، ئەوە بوو گەمارۆی ئابووریانی دا تا بێ هێزیان بکات، دانەوێڵە و ئازوخەکانی سوتاندن و نەیهێشت ئەو ئازوخەیانەن پێ بگات کە عەرەبە دەشتەکیەکان پێشکەشیان دەکرد. برسێتی بی هێزی کردن.

بۆیە ژمارەیەکی زۆریان خۆی رادەست کرد. لەرووی پێکدادانە سەربازیەکانەوە، ئەوا (الموفق) توانی لە ئەهواز دەریان بکات و شارەکەیان (المختارە) رزگار بکات، پاشان شارەکانی تریان یەك لەدوای یەك روخا تا لەساڵی (٢٧٠ك/٨٨٣ز) سەرکەوتنی کۆتایی هاتەدی. لەکاتی شەڕەکاندا عەلی کوڕی موحەممەد کوژرا و ئەو دوای شوێنکەوتووەکانی خۆیان رادەست کرد([1]).

بە دامرکاندنی ئەم شۆڕشە، پەردە بەسەر ئەم بزوتنەوەیە شۆڕکرایەوە کەوا خیلافەتی عەباسی هەراسان کردبوو، سەر و ماڵی زۆری پێشکەش کرد لەپێناوی کپکردنەوە، کەوا لەچواردە ساڵ زیاتر بەردەوام بوو (٢٥٥-٢٧٠ك/٨٦٩-٨٨٣ز).

## هەڵسەنگاندنی بزوتنەوەی زەنج

بزوتنەوەی زەنج لە ئەنجامی واقیعی پڕ ئازار و چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ژیان بردنە سەر لەنێو زەلکاوەکانی بەسرە و دەشتەکانیدا سەری هەڵدا. ئەوە بوو لەسەرەتای دەسپێکردنی، بزوتنەوەیەکی سەرکەوتوو بوو، ئامانجەکانی لەگەڵ کردەوەکانیدا هاوشێوە بوون، بەڵام ئەو هەستە ئاژاوە گێرییەی کە پەیڕەویان کرد لەکاتی گەیشتنیان بە لوتکەی بەرەنگاربوونەوەدا، بووە هۆی کەمبوونەوەی رەهەندە کۆمەڵایەتیەکانی، هەروەها بەرنامەیەکی شۆڕشگێڕی نەبوو ئاوات و ئامانجەکانی لایەنگرانی لەخۆ بگرێ و پەیوەندی لە نێوان سەرکردایەتی و

---

[1] الطبری: ب ٩: ل ١٦١٤، ٦٣١-٦١٥.

شوێنکەوتووانی روون بکاتەوە. دەشبینین پیاوەکانی، تۆڵەسەندنەوەیان کرد بە ئامانجی خۆیان نەك چاکسازی، کۆدەتای کۆمەڵایەتیان کرد بەمەبەست نەك راستکردنەوە، سەرکردەکەی نەیتوانی خۆی لە بیرۆکەی رابەرێتی قرشی رزگار بکات، سەرەڕای ئەوە شۆرشەکەی لە چوارچێوەیەکی خۆماڵی و سنورداردا بوو و ئاواتەکانی گشتگیر نەبوو، لێرەشدا بۆمان دەرئەکەوێ کە عەلی کوڕی موحەممەد سەرنەکەوت لە راکێشکردنی بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگەی عێراقی، وەکو جوتیارەکان و موڵکدارە گەورەکان و بازرگانەکان و پیشەدارەکان، تەنانەت (قرمگی) یەکانیش، بۆیە کۆیلەکان، هەرچەندە ژمارەیان زۆر بوو، لاواز بوون.

لەلایەکی دیکەوە، ئەوا خێرایی رووداوەکان و سوور بوونی عەباسیەکان لە لەناوبردنی ئەم بزوتنەوەیە، دەرفەتی بە سەرکردەکەی نەدا ریزی هێزەکانی رێك بخاتەوە و بتوانێ کۆمەڵگەیەکی سەقامگیر و خاوەن سیستەمێکی تایبەت، بنیات بنێ، لە بەر ئەوەش، زۆر ئاسایی بوو کە ئەم بزوتنەوەیە مۆرکی مرۆیی و شۆرشی خۆی لەدەست بدات و بەرەو کۆتایی بوونی بیبات، بەڵام ئەو بنچینە شۆرش ئامێزەی کە پەرش و بڵاو بووەوە، دواتر بووە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی (قرمگی)یەکان و توانی ببێتە یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی ([1]).

## د – پەیوەندی لەگەڵ (طالبي)یەکاندا

## زەیدیەکان

سەردەمی عەباسی دووەم بزوتنەوەی سیاسی و ئاینی زۆری بە خۆوە بینی کە کاریگەریەکی دووری هەبوو لە مێژووی ئەم سەردەمە و سەردەمەکانی دوای خۆی، ئەوە بوو شیعەکان بزوتنەوە گەلێکیان کرد لە ئەنجامدا زۆر لەبەشەکانی دەوڵەت جیابوونەوە، بنەماکانی شیعی بڵاو بووەوە، بەتایبەتی ئیسماعیلی و(قرمطي). جا ئەنجامی هەوڵی ئیسماعیلیەکان دامەزراندنی دەوڵەتی ( فاطمي) بوو لە وڵاتی مەغریب

---

[1] دەربارەی هۆکارەکانی شکستهێنانی بزوتنەوەی زەنج بگەڕێوە بۆ: علبي: ل ١٤٥،١٦٧.

لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عەلەوی و زەیدی لە ( طبرستان).

ئەوەی راستی بێ سەردەمی ئەلموتەوەکل ناسرا بە تەنگ هەڵچنین بە شیعەکان بە گشتی، جا ئەم خەلیفەش کاریگەر بوو بە بۆچوونەکانی (عوبیدەڵلای کوری خاقـان)ی وەزیـری، کـەوا نـاوی دەرکـرد بـە رقبـوونی لـەم گروپـە موسـڵمانە([1])، لەسـەردەمی ئەلموسـتەعین–دا زەیدیـەکان چـەند بزوتنەوەیـەکیان کـرد دژی دەسـەلاتی ناوەنـدی ئاشکراترینیان سەرهەڵدانی یەحیای کـوری عـەمری کـوری یـەحیای کـوری حوسـەینی کوری زەید بوو لە کوفە، وادیارە سـەرهەڵدانەکەی پەیوەنـدی راسـتەوخۆی هـەبوو بـە باشبوونی باری دارایی ([2]).

(یەحیا) ژمارەیەك لە عەرەبە دەشتەکیەکان و کۆمەڵەیەك لە دانیشتوانی کوفە لە دەوروبەی خوێدا کۆ کردەوە، پاش ئەوەی بانگەشەی بۆ رازیبوون لە ئال موحەممەد کرد چووە ناو ئەم شارەوە([3]). بەڵام بزوتنەوەکەی سەرکەوتنی بۆ نەنووسـرا، چـونکە (عەباسی ئەلحوسەینی کوری ئیسماعیلی کوری ئیبراهیمـی–مـصعب)ی سـەرکردەی، بەرەنگاری بووەوە و سەرکەوت بە سەریا و (یاحیا)ش لە شەڕەکەدا کوژرا. ([4]).

سەبارەت بە بزوتنەوەکەی تری زەیدی کەوا کاریگـەری هـەبوو، ئـەوا سـەرهەڵدانی ئەلحەسەنی کوری زەیدی کـوری موحەممـەدی کـوری ئیـسماعیل بـوو لـە دەوروبـەری (گبرستان) لە (مانگی رەمەزان ساڵی ٢٥٠ك/مانگی تـشرینی یەکـەم سـاڵی٨٤٦ن). بـەد رەفتــاری فــەرمانرەوا عەباســیەکان لــەو ناوچــەیەدا هۆکــاری ســەرەکی بــوو بــۆ سەرهەڵدانی، ئەمەش وایکـرد لەخەڵکەکـەی بـچنە ریـزی (گـالبی) یـەکان و بەیعـەتیان پێدا، هەروەها سەرانی (دەیلەم)یش بەیعەتیان پێدا، نازناوی ((داعی الخلق الی الحق)) ی لە خۆی نا یـاخود ((الـداعی الکـبیر))([5]). تـوانی لەمیانـەی سـێ سـاڵدا دەسـتبگرێ بەسەر هەموو (گبرستان) و بەشێکی گرنگ لە (دەیلـەم) و (رەی). ئـەوە بـوو (گـالبی)

---

[1] الاصفهانی: لا ٤٩٠، ٤٧٨.

[2] ابن الاثیر: ب ٥ لا ٣١٤.

[3] الاصفهانی: لا٥٠٦

[4] هەمان سەرچاوە: لا٥٠٩، ٥٠٧. ابن الاپیر: ب ٥ لا ٣١٢.

[5] واتە ((بانگکەری خەڵك بۆ حەق)). ((بانخوازی گەورە))

یەکان لە حیجاز وشام و عێراق یەك لـە دوای یـەك دەهـاتن بـۆ لای، پـاش ئـەوەی کـە ناوبانگی دەرکرد و پشتی قایم بوو([1]).

## (ئیسماعیلی)یەکان

لەو کاتەی کە بزوتنەوەی زەنج گیانی دەدا، بزوتنەوەی ئیسماعیلی سـەری هەڵدا، کـەوا مێـژووی ئامـادە بـوونی لەسـەر شانۆی سیاسـی دەگەڕێتـەوە بـۆ کۆتاییـەکانی سەردەمی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی، ئەوەش کاتێك ژمارەیەکی زۆر لـە زەیدیـەکان چوونە پاڵی گروپـی ئیمـامی لەلایـەنگرانی جەعفـەر (الـصادق)، پـاش مردنـی نـاوبراو، شیعەی ئیمـامی بـووە دوو بەشـەوە بـەهۆی جیـاوازی لـە بۆچـوونەکانیاندا لەچۆنێتی دیاریکردنی ماف (ورایی) بۆ هەڵبژاردنی ئیمام، یەکـەمیان ئیمامـەتی موسـەوی، دواتـر پێی وترا دوانزە ئیمامی، شوێنکەو تووانی باوەڕیان بە ئیمامـەتی (موسـی الكـاظم بـن جعفـر الـصادق) هـەبوو ئەمـەش ئیمـامی حەوتەمـە لـەلایان، دووهـەمیان ئیمامـەتی ئیسماعیلی کە باوەڕیان بە ئیمامەتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر (الـصادق) هـەبوو کـە لە هەموو کوڕەکانی باوکی گەورەترە، هەرچەندە کاتێك مرد بـاوکی لـە ژیانـدا مـابوو، بەڵام شوێنکەوتووانی ئیمامەتیان گواستەوە بۆ موحەممەد لمەستور، ئەمـەش ئیمـامی حەوتەمە لەلایان، لە پاشان ناوی (السبعیه) لەم گروپە نـرا، واتـە حـەوت ئیمـامی، بـۆ ئەوەی جیایان بکەنەوە لە دوانزە ئیمامی ([2]).

---

[1] إقبال عباس: تاريخ إيران بعد الاسلام: ل ٢١،٢٠٧.

[2] ئەو دووبەرەکیەی کە لە پاش مردنی (الصادق) کەوتە ناو شیعەکان، گەورەترین دابەشبوون بوو لە ناو ریزەکانیاندا، نەك لە بەر ئەوەی گروپی ئیسماعیلی تا ئەمڕۆش شوێنکەوتووانیان هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی توانی دەوڵەتێك دامەزرێنێ رۆژێك لە رۆژان گەورەترین دەوڵەت بوو لە سەردەمی عەباسی دووهەمدا، مەبەستیشم دەوڵەتی (فاطمي)یە، مەترسی ئەم دوو بەرەکیە تەنها بۆ ناکۆکی دەربارەی ئیمامەت لە دوای جەعفەر (الصادق) ناگەڕێتەوە. چونکە سەرهەڵدانی گروپی ئیسماعیلی بۆ هۆکاری زۆر دەگەڕێتەوە کە لە تۆمەتبار کردنی ئیسماعیلی بە مەی خواردنەوە یا خود مردنی لە کاتی مانەوەی باوکی لە ژیاندا، تێپەڕ دەکات. وادیارە ناتوانێ سەرهەڵدانی ئەم بزوتنەوەیە و دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی، لە یەك جیا بکرێتەوە، کەوا لە ژێر دروشمی ماف ئەهلی بەیت لە خیلافەتدا هەستا و پاشان کوڕەکانی عەباسی توانیان بۆ خۆیان زەوتی بکەن بێ ئەوەی - طالبي - یەکان بەشداری پێبکەن. وە لەو کاتەی (الصادق)، کەوا ئەم گۆڕانکاریەی بە چاو خۆی بینی و کەوا نائومێدیەکی تەواوی تیا بوو بۆ (طالبي) یەکان، دوور کەوتەوە لە رەوتە سیاسیەکان، جا ئیسماعیل پەیوەندییەکی پتەوی بە لایەنە

ناوبانگترین نوێنەری ئیمامەکانی ئیسماعیلی کەوا بۆ بڵاو کردنەوەی مەزهەبەکە کاری کرد و سەرکردایەتی بانگەشەکەی کرد (مەیمون ئەلقداح) بوو[1] کەوا بنچینەکانی مەزهەبی ئیسماعیلی دانا و ڕێی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی خۆش کرد کەوا لە (سلمیە) لە وڵاتی شام نیشتەجێ بوو بوو، بانگخوازەکانی لە ناوچە شڵەژاوەکاندا بڵاو بوونەوە بەمەبەستی قۆستنەوەی بێزاری کۆمەڵانێك لە خەڵکەکەی لە ئیدارەی عەباسی.

بانگەشەکە لە سێ یەکی کۆتایی لەسەدەی نۆیەمی زایینی لە وڵاتی یەمەن و لە عێراقدا ڕێکخرا ([2]).زیاتر بانگەشە کردن بۆ ئەم مەزهەبە لەپاش مردنی (حەسەن لعەسکەری) لە ساڵی (٢٦٠ك/٨٧٤ز) هاتە ئاراوە، ناوبراویش یانزەمین ئیمامە لە ئیمامەکانی شیعە ([3]). ئیسماعیلیەکان توشی چەوسانەوە بوون لەسەر دەستی دەسەڵات، بۆیە ناچار بوون پەنا بەرنە بەر ناوچەی دوور و پارێزراو کە عەباسیەکان نەتوانن بچنە ناوی. هەروەها بانگەشەکەیان بە نهێنی بڵاو کردەوە، هەوڵیاندا لایەنگر بۆ خۆیان پەیدا بکەن و لە (سلمیە)وە دەستیان پێکرد بۆ سەرجەم خاکەکانی دیکەی ئیسلام. بەڵام کارکردنی بزوتنەوەی ئیسماعیلی لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی نهێنی ڕێگەی لێنەگرت کاری سیاسیش بکات، ئەوە بوو هەر کاتێك بارودۆخ ڕێگەی بدایە، بیرۆکە نهێنیەکانیان بەکار ئەهێنا بۆ تەنگ هەڵچنین بە دەوڵەت.

## (قرمطي)یەکان

بانگەشەی ئیسماعیلی ئاراستەی سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگە کرا، بەڵام بەدەنگەوە چوونیان بۆی وەکو یەك نەبوو، لە کاتێکدا فارسەکان بە هەلێکی باش دایان نا بۆ دەربڕینی ڕق و کینەییان لە عەرەب، ئا بەو شێوەیە بانگەشەی ئیسماعیلی بووە بزوتنەوەیەکی گەورەی شۆڕشگێڕ کە چەندین لایەنی جیاوازی لە خۆدەگرت،

---

توندڕەوەکان هەبوو کەوا گروپێکی بەناوی ئەم هێنایەکایەوە ئەوە بوو جەعفەر(الصادق) ■ سەر کار لایبرد.

بگەڕێوە بۆ: صبحي، احمد محمود: نظرية الامامةالدي الشيعة الاثني عشرية:لا ٢٨٠-٢٨٣.

[1] میمون لقداح ـ ی کوڕی ـ دیحان: پیاوێکی فارسە، (ثنوي) مەزهەبە، بە موسڵمان خۆی نواند.

[2] کاهن، کلود: تاريخ الشعوب الاسلاميه:لا١٧٨.

[3] الخضری:الدولة العباسية:لا ٢٠٠.

ئاشكرا ترينيان :

- لايەنى كۆمەڵايەتى، بۆ چەسپاندنى دادپەروەرى كۆمەڵايەتى.
- لايەنى شيعى، كەوا بنەماكانى شيعە ئامانجى سەرەكى بوو بۆى.
- لايەنى رەگەز پەرستى فارسى، كەوا شوێنكەوتووانى بە گرنگيان زانى بنەماكانى (مزدەكى) بەجىٚ بهێنن.

بەڵام ئەم لايەنانە لەسەر بەديهێنانى يەك ئامانج كۆك بوون، ئەوەش خەونى خيلافەت. بەهۆى لەيەكنەچوونى ئامانجەكانيان ئەستەم بوو ئەو هەموو لايەنە بەشێوەيەكى تەواوەتى ئاوێتەى يەكتربن. ئەمەش هۆى گەشەكردنى قۆناغەكانى بانگەشەكە روون دەكاتەوە كەوا مۆركێكى جياواز ياخود دژ بەيەكى پێوە ديار بوو. ئەوە بوو لە مەزهەبى ئيسماعيلى دوو هێزى گەورە پێگەيى كە هەڕەشەيان لە دەوڵەتى خيلافەتى عەباسى كرد، يەكێكيان بزوتنەوەى(قرمطي) بوو كەوا بەڕاستى تەنگى بە عەباسيەكان هەڵچنى و لەناو ماڵى خۆياندا هەڕەشەى لێكردن، ئەوەى ديكەش دەوڵەتى (عوبەيدى) بوو كەوا لە (سلميە)وە دەستى پێكرد و لە وڵاتى مەغريب دامەزرا ([1]).

بزوتنەوەى (قرمطي) لەنيوەى دووەم لەسەدەى سێهەمى كۆچى سەرى هەڵدا، بزوتنەوەكەش بەردەوامبوونێكە بۆ بانگەشەى ئيسماعيلى وێڕاى ئەو قۆناغە سەختانەى كە پەيوەندى نێوان بزوتنەوەى دايك (ئيسماعيلى) و بزوتنەوەى تازەپێگەيشتوو (قرمگى)يەكان بەخۆيەوە بينى و گەيشتنى بۆ رووبەڕووبونەوەى چەكدارى. كاتێك دەگەڕێينەوە بۆ سەرچاوەكانى ئيسماعيلى، دەبينين وەكو گروپێك تەماشاى دەكات كە لە سەركردايەتيەكەى ياخى بووە و جيابووەتەوە.(❁)

---

[1] گروپى حەوت ئيمامى بوونە دوو بەشەوە: يەكێكيان لەلاى موحەممەدى كوڕى ئيسماعيل وەستان و چاوەڕوانبوون وەكو مەهدى بگەڕێتەوە ئەمانەش (قرمطي) يەكانن، ئەوەى ديكەشيان دانى نا بە زنجيرەيەكى نەبچڕاو لەو ئيمامانەى كە لە وەچەى ئيسماعيلن، ئەمانەش ئيسماعيلييەكانن كەوا دەوڵەتى(فاطمي)يان دامەزراند.عمر: ص ٢٩٩،٢٩٨.

❁ زكار ، سهيل: الجامع في اخبار القرامطة: ب١ ص ١٠٩

❁ العش، يوسف: تاريخ عصر الخلافه العباسيه: ص ١٥٥

لەساڵی (٢٦١ك / ٨٧٥ن) لەسەردەمی خلیفە(المعتمد)دا، بزوتنەوەیەك پەیدابوو هەموو عێراقی گرتەوە(ﷺ) پاشان وڵاتی شام وبەحرەین و یەمەن-یشی گرتەوە، ئەمەش لە هەلومەرجێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا هاوشێوەی هەلومەرجە کە بزوتنەوەی زەنج لەسایەیدا پەیدابوو، بەڵام وادیارە زیاتر رووکاری کۆمەڵایەتی — ئابووریەکەی زاڵتربوو بەسەر رووکارە ئاینیەکەی، هەرچەندە بانگخوازەکانی دەمارگیر بوون لە بۆچوونە ئاینیەکانیان کە پەیوەندە بە شەریعەتی ئیسلامی.(٣)

جا (حەمدانی کوڕی — الشعب) کە ناسراوە بە (قرمطی) و خەڵکی کوفەیە بەیەکێك لەبانگخوازە یەکەمینەکانی (قرمطي) دادەنرێ. بانگەشەکەی، لەپاش لەناوبردنی بزوتنەوەی زەنج هاتەکایەوە، رووی کردە ئەوانەی کە رزگار بوون لەو ناوچەیەی کەوا بزوتنەوەی ناو براوی تێدا بوو، جا جەماوەرێکی زۆری لە ریزی عەرەبە دەشتەکیەکانی بەدیکرد کەوا پەرۆش بوون بۆ (دەستکەوت)، هەروەها جوتیارانی لادێ نشینەکان و چینی هەژاران. وە شوێنکەوتووانی ناوی (قرمطي) یەکانیان لێنرا لەسەر ناوی خۆی ([1]).

ئەوە بوو بەهۆی ئەو ناکۆکیەی کە لە نێوان سەرۆکایەتیەکەی و سەرۆکایەتی بزوتنەوەی ئیسماعیلی روویدا، لە عێراق بزوتنەوەکە کپ بووەوە، سەرکردایەتی کردنیشی رادەستی (زکرویەی کوڕی مهرویە)ی فارسی، ئەمەش یەکێکە لە قوتابیانی حەمدان، کەوا چالاکیەکانی گواستەوە بۆ وڵاتی شام، دەشتی (سەماوە)شی گرتەوە.

هەردوو کوڕەکەی خۆی، یەحیای کوڕی زکرویە کە ناونراوە بە (خاوەن وشترەکە) و حوسەینی کوڕی زکرویە کە ناونراوە بە (خاڵدارەکە)، لە دوای یەك ئەرکی بڵاوکردنەوەی گرتە ئەستۆ، هەر یەك لەوان نازناوی (أمیر المومینن)ی لە خۆینا، هێرشیان کردە سەر شار و گوندەکان و ترس نیگەرانیان لەوڵاتی شامدا بڵاو کردەوە پێش ئەوەی دەوڵەت لە دوو ساڵی (٢٩٠و٢٩١ك/٩٠٣-٩٠٤ن) لە ناویان بەرێ([2]).

(زکرویە) هەستا بۆ ئەوەی تۆڵەی کوشتنی هەردوو کوڕەکەی بکاتەوە، بەڵام

---

[1] الطبري:ب١٠ل٢٥.

[2] الطبري:ب١٠ل٩٩-١٠٨، ١٠٠، ١١١.

لەساڵی (٢٩٤ك/٩٠٧ن) کوژرا[1]. بە کوشتنیشی پرسی (قرمگی)یەکان لە وڵاتی شامدا کۆتایی هات.

لە بەحرەین-دا بزوتنەوە (قرمطي) بەناوی (ئەبو سەعید لجەنابی) فارسی و (ئەبو تاهیری) کوڕی، بەندە، ئەوە بوو ناو برای یەکەمیان دەسەڵاتی تەواوەتی سەپاند بەسەر (هەجر) و (الاحساو) و (قگیف) و سەرتاسەری بەحرەین، دەوڵەتێکی سەربەخۆی دامەزراند پایتەختەکەی (المؤمنیە) بوو، لەساڵی (٣٠١ك/٩١٤ن) کوژرا. ئەوجا ئەبو تاهیری سولەیمانی کوڕی سەرۆکایەتی بانگەشەکەی گرتە دەست و سیاسەتێکی توند و تیژ بە شێوازێکی زۆر مەترسیداری پەیڕەو کرد. بەسرە و کوفە بە دەستی پەلامارە دڕەندەکانیەوە دەیناڵاند. هەروەها پەلاماری کاروانی حاجیانیشی دا، لەساڵی (٣١٧ك/٩٢٩ن) هێرشی برد بۆ مەککە، پارەی حاجێکانی تاڵان کرد و لەناو ماڵی خوا کوشتنی و بەردە ڕەشی لەکەعبە هەڵکەند و چەند ساڵێك لە (هەجر) زەوتی کرد[2] هەر چەندە ئەوە تەحەدایەکی گەورەیە بۆ هەست و سۆزی موسڵمانان. بەئاشکرا قسەی بە دوژمنەکانی دەوت لەئەهلی سوننە و بەهاوپەیمانەکانی لەکارەکانیدا -ئیسماعیلی و عوبەیدی-یەکان.

وادیارە دوو هۆکار هەیە وای لە (قرمطي) یەکان کرد ئەم ڕێبازە ئاینی و ئابووریە بگرنەبەر:

لە رووی ئاینیەوە، بەرپرسانی ئەم بزوتنەوەیە وەکو نوێنەرێك بۆ گروپی توندڕەوی (باطني)، هەوڵیاندا بیرو باوەڕێکی نوێ بدۆزنەوە کە ئیسلام لەگەڵ بیروباوەڕە کۆنەکان بگونجێنن، ئەوان دانیان بەئیسلام نەدەنا وەکو ئاینێك، هەرچەندە خۆیان بەپێچەوانەوە دەنواند، بەڵکو بیروباوەڕی (الحلول و تناسخ) و پیرۆزی ئیمامەکانیان هێنایە ناوی[3].

لەرووی ئابووریەوە، ئەوا (قرمطي)یەکان ویستیان حەج راگرن و هێرش بکەنە سەر کاروانە بازرگانیەکان، لەبەر ئەو قازانجە مادییەی کە بەدەستیان ئەکەوت لێی. هەروەها ئەو هێرشانەی کە بۆ سەر بەسرە دەیانبرد مەبەست لێی تێکدانی رەوشی

---

[1] هەمان سەرچاوە: لا ١٣٠-١٣٤.

[2] (قرمطي)یەکان لە ساڵی (٣٣٩ك) بەردە ڕەشیان بۆ مەککە گەڕانەوە، پاش ئەوەی کە بۆ ماوەی بیست و دوو ساڵ لەلایان مایەوە.

[3] عمر: لا٣١٢.

ئەمنی و شڵەژاندنی بوو تا بازرگانیەکەی بگوازێتەوە بۆ بەندەرەکانی ئەو کەنداوەی کە لە ژێر رکێفی خۆیاندا بوو پاش ئەوەی کە خەلیفە داوای ئەبو تاهیر لە رادەستکردنی ئەهواز و بەسرەی رەتکردەوە، سەرەڕای زاڵبوونی بەسەر بازرگانی دەریایی لە هند و پیشەسازی لە خوزستان ([1]).

هەر چۆنێك بێت ئەوا بزوتنەوەی (قرمطي) لە بەحرەیندا لەپاش مردنی ئەبو تاهیر لە ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٢ز) هێزی خۆی لەدەستدا، بەهۆی ململانێ لەسەر رابەرێتی، دەوڵەتی (قرمگی) سەرەڕای ئەوەی لەنێو کۆمەڵێ رەوتی ناحەز کە دەمارگیری ئاینی خۆی هێنایە کایەوە، بەڵام تا ساڵی (٤٦٩ك/١٠٧٦ز) بەردەوام بوو.

## دامەزراندنی دەوڵەتی عوبەیدی(فاطمي)

لەساڵی (٢٨٨ك/٩٠١ز) ئەلحوسەینی کوڕی حەوشەب بانگخوازی ئیسماعیلیەکان لە یەمەن، هەستا بەناردنی ئەبو عەبدوڵڵای شیعی بۆ وڵاتی مەغریب، بۆ ئەوەی لەم وڵاتەدا بانگەشەکەی بڵاو بکاتەوە، ئەمەش پاش مردنی هەردوو بانگخوازەکەی ئیسماعیلی تێدا، ئەلحەلوانی و ئەبو سوفیان، ئەم (ئەبو عەبدوڵڵا)یەش سەرکەوت لە راکێشکردنی کۆمەڵێ لەحاجیانی (کەتامە) و بردنی بۆ وڵاتی مەغریب و لەوێ بانگەشەکەی لە نێو خەڵکدا بڵاو کردەوە، خەڵکی شوێنی کەوت و پشتی قایم بوو و لەساڵی (٢٩٦ك/٩٠٩ز) دەستی بەسەر (قەیرەوان)دا گرت و دەوڵەتی (الاغالبە)ی نەهێشت. پاشان ناردیە شوێنی (عوبەیدڵڵا لمەهدی) لە (سلمیە) و بانگهێشتی کرد بێ بۆ ئەفریقیا تا کارەکە بگرێتە دەست، (عوبەیدڵڵا) پێشوازی لەم بانگهێشتەی کرد و (سلمیە)ی بە جێهێشت و بەرەو مەغریب چوو، لەساڵی (٢٩٧ك/٩١٠ز)گەیشتە ناوی و بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت، و نازناوی ((المهدی أمیر المومنین))ی لە خۆی نا، بەوەش ئەو بنەڕەتەی دانا کە دەوڵەتی خیلافەتی عوبەیدی لە سەری هەستا بوو([2]).

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل٣٠٧-٣٠٨.

[2] سەبارەت بە رەچەڵەکی خەلیفەکانی(فاطمي) بگەڕێوە بۆ: عنان، محمد عبدالله: الحاكم بامرالله و اسرار الدعوة الفاطمية ل٤٧-٧٥. سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتی(فاطمي)، ئەوە دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ کتێبی (تاریخ الدولة الفاطمية: دوکتۆر. حسن إبراهیم حسن. ل١٠-٥٠.

## بەندی هەشتەم

### ڕەوشی ناوخۆی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

**یەکەم: پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتە جیاخوازەکاندا لە ڕۆژهەڵات**

**دەوڵەتی تاهیری : ٢٠٥ـ٢٥٩ك/٨٢٠ـ٨٧٣ز**

**ناوی میرە تاهیرییەکان و ماوەی میرنشینی هەر یەك لەوان:**

| | |
|---|---|
| ١- طاهر بن الحسین بن مصعب | ٢٠٥ـ٢٠٧ك/٨٢٠ـ٨٢٢ز |
| ٢- طلحة بن طاهر | ٢٠٧ـ٢١٣ك/٨٢٢ـ٨٢٨ز |
| ٣- عبدالله بن طاهر | ٢١٣ـ٢٣٠ك/٨٢٨ـ٨٤٤ز |
| ٤- طاهر بن عبدالله | ٢٣٠ـ٢٤٨ك/٨٤٤ـ٨٦٢ز |
| ٥- محمد بن طاهر | ٢٤٨ـ٢٥٩ك/٨٦٢ـ٨٧٣ز |

دەوڵەتی تاهیری بە ویست وخواستی خیلافەت دامەزرا. تاهیری کوڕی ئەلحوسەین دایمەزراند، ناوبراویش یەکێکە لە سەرکردەکانی مەئمون و لەساڵی (٢٠٥ك/٨٢٠ز) کردی بە فەرمانڕەوای خۆراسان و لە بەغدادەوە کاروباری هەموو ڕۆژهەڵاتی پێ سپارد ([1])، زۆر جەختیشی نەکردەوە لە سەر ئەوەی کە لایەنگر و دڵسۆزی بێ.

تاهیر، نیسابوری کرد بە بنکەیەك بۆ خۆی و هەر لە سەرەتای دەسەڵات گرتنیەوە هەستی جیابوونەوەی هەبوو، ئەوە بوو لەساڵی (٢٠٧ك/٨٢٢ز) مەئمونی لەخیلافەت دەرکرد وپاڕانەوە بۆی لەمزگەوتەکان قەدەغەکرد، پاشان جلی ڕەشی لە بەری خۆی داکەند بەوەش جیا بوونەوەی خۆی لە بەغدا ڕاگەیاند ([2]).بەڵام دواتر تاهیر لەناکاوە مرد وخەڵکیش گومانیان بە خەلیفە دەکرد کە وا فەرمانی داوە ژهر خواردی بکەن

---

[1] الطبري:ب ٨ ل٥٧٧.تاهیرییەکان حوکمرانی خۆراسان وناوچەکانی لای ڕۆژهەڵات و باکووری کرد و تا سنووری هند وسنووری تورکەکان.

[2] الیعقوبی:ب٢ ل ٤١٣.

([1]).هەرچەندە مەئمون تەماحكاریەكانی تاهیری بەچاوی خۆی بینی ئەگەرچی ویلایەتی خۆراسانی رادەستی (طلحة)ی كوڕی كرد ([2])

لە لایەنی خۆیانەوە، تاهیریەكان، واتە جێنشینانی تاهیر سوور بوون لە سەر بەردەوامبوونی سیاسەتی هاریكاری لە گەڵ خیلافەتدا لەگەڵ دانپێنان بەدەسەڵاتەكەشی، ئەم سیاسەتەش روون بووەوە لە :

- (طلحة) هەستا بە جەنگاندنی خواریجەكان لە سیستان.
- عەبدوڵای كوڕی تاهیر، هەستا بەكۆتایی هێنان بە ئاشوب و ئاژاوە دەرەكیەكان لە میسر، وە بزوتنەوەكانی (طالبي) لە خوراسان كەوا دژی رژیم بوون، هەروەها هاریكاری خیلافەتی كرد بۆ لە ناوبردنی بزوتنەوەی مازیار لە (طبرستان).

عەباسیەكانیش ئەم خزمەتانەیانە بەرز نرخاند، ئەوە بوو (بنەماڵەی تاهیر)یان لە خۆیان نزیك كردەوە و لە ململانێیان لە گەڵ(صفار)یەكاندا پاڵپشتی كردن.

خوراسان لە سەردەمی ئەماندا، بەسەقامگیری وخۆشگوزرانی و گەشە كردن ناسرا، هانی كشتوكاڵیان دا و ئاودێریان رێكخست، بایەخیان بە خوێندن دا، بەشێوەیەك نیسلبور لەسەردەمیاندا بووە ناوەندێك لەناوەندەكانی رۆشنبیریەتی ئیسلامی.

سەبارەت بە پەیوەندیە دەرەكیەكان، ئەوا ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتیان لەپەلاماری توركەكان پاراست، خاكی ئیسلامیان فراوان كرد و دەسەڵاتی موسڵمانانیان چەسپاند بە لەناوبردنی یاخی بووەكان. بەڵام ئەوان دەستەوسان وەستابوون لە بەرامبەر پەرەسەندنی بزوتنەوەكانی (گالبی)، ئەوە بوو لە سەر دەستی (صفار)یەكان لە ناو چوون.

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الطبري: پ ٨ ل ٥٩٥.موڵكی تاهیریەكان هەرێمی هرات بەرەو باشوور ـ كەناری باشووری رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین ـ بەرەو رۆژئاوای گرتەوە، هەروەها بەرزاییەكانی دۆڵی روباری جیحون لە خوارووی چیاكانی هندو كوش بەرەو رۆژهەڵات، دەسەڵاتیان سەرتاسەری وڵاتی دوای رووباری گرتەوە.

## دەوڵەتی (صفاری): ٢٥٤ـ٢٩٨ك/٨٦٧ـ٩١١ز

**ناوی میرەکانی (صفاری) و ماوەی میرنشینی هەریەك لەوان:**

| | |
|---|---|
| ١- أبو یوسف یعقوب بن اللیث | ٢٥٤ـ٢٦٥ك/ ٨٦٧ـ٨٧٨ز |
| ٢- عمر بن اللیث | ٢٦٥ـ٢٨٧ك/٨٧٨ـ٩٠٠ز |
| ٣- ابو الحسن طاهر بن محمد بن عمر بن اللیث | ٢٨٧ـ٢٩٦ك/٩٠٠ـ٩٠٨ز |
| ٤- اللیث بن علی بن اللیث | ٢٩٦ـ٢٩٨ك/٩٠٨ـ٩١٠ز |
| ٥- أبوعلی محمد بن علی بن اللیث | ٢٩٨ك / ٩١١ز |

ئەم دەوڵەتە بەردەوامبوونێکە بۆ ئەو بزوتنەوە جیاخوازانەی کە لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا سەریان هەڵدا لەبەشێك لە بەشە جوگرافیەکانی ئێران کە بەشی باشووریەتی، (یەعقوبی کوڕی –اللیث الصفار) دایمەزراند ([1]) کەوا دەرفەتی لاواز بوونی خیلافەتی عەباسی –کە سەرقاڵ بوو بەشەڕکردن لەگەڵ زەنجەکاندا– قۆستەوە و بەسەر هەرێمەکانی باشووری ئێران زاڵبوو و وڵاتی فارسیشی خستەپاڵ خۆی، ئەوجا لەپاش لەناوبردنی دەوڵەتی تاهیری لەساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ز) فراوانکاریەکانی بەرەو خۆراسان ئاراستە کرد و پشتی قایم بوو، زاڵبوو بەسەر سیستان –کە دەکەوێتە ئەوپەڕی رۆژهەڵاتی ئێرانی باشور– و دۆڵی کابل و سەند ومکران ([2]).ئەوجا بە نووسراوەێك خەلیفەی بەدوا رەوشی رۆژهەڵات ئاگادار کردەوە. ئاسایش و ئاشتەوایی لەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی بوون بڵاو کردەوە و سوپا وابەستەی بوو و دانیشتوان پاڵپشتیان دەکرد.

وادیارە خەلیفە لە هەڵسوکەوتی یەعقوب و فراوانخوازیەکانی رازی نەبوو. دەوڵەتی

---

[1] ناوی (الصفار) ی لێنرا چونکە سەرەتای ژیانی بە پیشەی مسگەری دەست پێ کردوە واتە زەرد کردنی قاپ و مەنجەڵە مسەکان.

[2] الیعقوبی: ب٢ لا ٤٥٩-٤٦٠.ابن الاثیر: ب٥ لا ٣٣٧، ٣٣٨، ٣٣٦.

تـاهیری بـە بنـچینەو پاڵپـشتیەك دانـا بـۆ خیلافـەت لەرۆژهەڵاتـدا و لـەناوبردنی هەڕەشەیەكی راستەوخۆیە لەسەر خیلافـەت و مەترسـیە لـە سـەر بـوونی عەباسـی لـە ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتدا. بۆیە وەڵامی (المعتمد)ی خەلیفە لەسەر زیادبوونی دەسەڵاتی یـەعقوب خێـراو تونـدو تیـژ بـوو. ئـەوەبوو لەبـەردەم حاجیـانی خۆراسـان و رەی و (گبرستان) و جرجان نەفرەتی لێکرد([1]).

ئەم هەڵسوكەوتەی خەلیفە، بووە مایەی تـورەیی یـەعقوب و تەحـەدای دەسـەڵاتی دەوڵەتی ناوەنـدی كـرد و بـەرەو فـارس كشاو داگیری كـرد و بـەردەوامبوو لەكـشانی بەرەو عێراق تا گەیـشتە ئـەهواز. ئـەوجا داوای لەخەلیفـە كـرد بیكـا بـە فـەرمانڕەوای ولایەتەكانی رۆژهەڵات و هەردوو پۆلیسی بەغداد و سامەڕاش و نەفرەت كردنەكـەی لـە بـەردەم حاجیـەكان هەڵوەشـێنێتەوە ([2]) خیلافـەت هەسـتی بـە دەستەوسـانی كـرد لەبـەردەم ئـەم پـەلامارە (صـفار)یـە، بۆیـە مـەیلی جـەنگ ڕاگـرتنی كـرد و رازی بـوو داواكاریەكەی یەعقوی جێبەجێ بكات([3])، جا لەو كاتـەش سـەرقاڵی پێكدادان بـوو لـە گەڵ زەنجەكاندا.

ئەوەی راستی بێ خیلافـەت قـەت مـەیلی جـەنگ ڕاگـرتنی نـەكردوە تـەنها بـەپێی پێویـستی نـەبێ، بـۆ ئـەوەی هەناسـەیەك هەڵكێـشی و دەرفـەتێكی بـۆ بڕەخـسێ و سەفاریەكان لە ناو بەرێ، جا خیلافەت حكومەتێكی لایەنگر لەهەرێمی دوای رووبار بـە سەرۆكایەتی (نەسـری كـوڕی ئـەحمـەدی سـامانی) راپەرانـدبوو. بـەوەش لـە پـشتەوە هەڕەشەی لە دەوڵەتی سەفاری دەكرد.

(یەعقوبی كوڕی – اللیث) هەستی بە سیاسەتی شەڕەنگێزی خەلیفە كردبوو، بۆیـە بڕیاری دا سنوورێك بۆ ئەم بارودۆخە دانـێ ئـەوەش بـە زاڵبـوون بەسـەر بەغـداد–دا و خستنی خیلافەت بە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی. جارێكی تر دەستەوسانی خیلافـەت دەركـەوت، ئـەوە بـوو مـەیلی جـەنگ ڕاگـرتنی كـرد و بـۆ ئـەوەی هەنـدێ كـاتی دەسـتبكەوێ، نووسـراوێكی بـۆ (یـەعقوب) نـارد تێـدا كاروبـاری فـارس و خۆراسـان و

---

[1] ابن خلكان:ب ٦ لا ٤١٢

[2] الطبري: ٩لا٥١٤. ابن خلكان : ب ٦لا ٤١٣.

[3] هەمان سەرچاوە:لا ٥١٦.

کرمان و رەی و ئەسفەهانی پێ سپارد سەرەڕای هەردوو پۆلیسی بەغداد و سامەڕا، بەڵام یەعقوب نەخۆش بوو، رەتکردنەوەی بۆ پیلانەکانی خەلیفە کاریگەری نەبوو لەسەر بەسەرهاتەکانی دواتر، چونکە لەساڵی (٢٦٥ك/٨٧٨ز) کۆچی دوایی کرد ([1]) پاش ئەوەی ئاواتەکانی هێنایەدی لە شوێنکەوتەی بۆ خەلیفەی عەباسی بۆ جیابوونەوەی تەواوەتی لە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی.

(عەمر) بە هەڵبژاردنی لەلایەن سەربازەکانیەوە، جێی یەعقوبی برای گرتەوە([2]). بەسیاسەتمەدارێکی لێهاتوو ناسرا. ناوبراو لە ململانێی لەگەڵ خیلافەتدا پەنای بردەبەر شێوازێکی تر، سیاسەتی نەرم و نیانی و جەنگ ڕاگرتنی پەیڕەو کرد و گۆڕانی بارودۆخیشی لەبەرچاو گرت. بۆیە نووسراوێکی بۆ خەلیفە نارد تێدا گوێڕایەڵی خۆی ڕاگەیاند. (الموفق)یش ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی براکەیدا بوو رادەستی ئەمی کرد([3]).

ئەوجا کەوتە قایمکردنی پلەوپایەی خۆی و چەسپاندنی دەسەڵاتی لەناوەوە. سوپایەکی تایبەتی لەکۆیلە تورکەکان بۆ پاسەوانی خۆی پێکهێنا([4])، زۆربەیانی پێشکەش کرد بە سەرکردەکانی و بەپارە فریویدان بۆ ئەوەی بە نهێنی هەواڵی بۆ بێنن، ئەو هەواڵانەی کە بە ئاشکرا بە دەستی ناکەوێ.

ئەم پەیوەندییە باشە لەگەڵ خیلافەتدا زۆری نەخایاند، خراپ بوو. چونکە (المعتمد) لە تەماحەکانی عەمر و هەوەسی جیابوونەوەی ترسا. جا ئەو تازە بزوتنەوەی زەنجی لەناو بردبوو، بۆیە دەستی بەتاڵ بوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بزوتنەوە جیاخوازەکاندا. بڕیارێکی دەرکرد بەلابردنی لە سەر ئەو ویلایەتانەی کە کردی بە فەرمانڕەوای. ئەم لە سەرکار لابردنەی لەبەردەم حاجیەکانی خوراساندا رایگەیاندو نەفرەتی لێکرد، خوراسانی رادەستی موحەممەدی کوڕی تاهیر کرد کەوا خەلیفە لە بەندیخانە ئازادی کرد ([5]). پاشان بە سەرکردایەتی (الموفق) سوپایەکی بۆ ئەم شارە نارد بۆ جەنگاندنی، ئەوە بوو ناچاری کرد بەرەو سجستان پاشەکشێ بکات، بەڵام نەیتوانی بەسەر کرمان و سجستاندا زاڵبێ، بۆیە گەڕایەوە ([6]).

---

[1] ابن الاثير: ب٦، ل٢١٧

[2] ابن خلكان: ب٦، ٤١٩.

[3] ابن الاثير: ب٦، ل٢٢٧

[4] بە منداڵی دەیان کڕین و پەروەردەیان دەکردن و لە سەر کاری سەربازی رایان دەهێنان.

[5] الطبري :ب١٠، ل ٧

[6] الطبري:ب١٠ ل١٣٧ ابن الاثير:ب ٦ل٢٧٦.

کاتێــک (المعتــضد) لەســاڵی (٢٧٩ك/٨٩٢ز) خیلافــەتی گرتــە دەســت، عــەمر دەستپێشخەری کرد بۆ رازی کردنی و پشتیوانی خۆیی بۆ ڕاگەیاند و دیاریی بۆ نـارد و داوای ویلایەتی خراسانی لێکرد. خەلیفەش داواکەی پەسەندکرد و موحەممەدی کـوڕی تاهیری لەسەر خۆراسان لابرد ([1])، پاشان داوای لەخەلیفە کرد وڵاتی دوای رووباری پێ بسپێرێ بێ ئـەوەی ئـەو ئاستەنگانە لەبەرچـاو بگـرێ کـە دووچـاری دەبـن. لێرەشـدا خەلیفە دەرفەتی بۆ ڕەخسا بۆ لەناوبردنی هێزی بـەردەوام زیـادبووی (صـفار)یـەکان. بۆیە ویستی عەمر بەگژی هێـزی گەشـە کـردووی سـامانی بـدا. لەبەرئـەوەش داواکـەی پەسەند کرد، چاوەڕوانی پێکدادان بوو لە نێوان ئەم دوو هێزە بۆ بردنەوەی حوکمڕانی ئەم هەرێمە. ئومێدی خەلیفە هاتەدی، ئەوە بوو لـە سـاڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ز) سـامانیەکان بەگژی سەفاریەکاندا چوون و سەرکەوتن بەسەریاندا، عەمریش دیـل کـرا و بـۆ خـەلیفـە بردرا، ئەمیش زیندانی کرد و لە ساڵی (٢٨٩ك/٩٠٢ز) لـەناو زینـدانـدا گیـانی لەدەسـتدا ([2]).

خیلافەت دەستی کردە ناردنی سوپا لە دوای سوپا بۆ ویلایەتـەکانی رۆژهـەڵات بـۆ ئەوەی بە راسـتی کـۆنترۆڵی بکـات تـاوەکو تـوانی جێنـشینەکانی عـەمر لـەناو بـەرێ. ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی سامانی لەساڵی (٢٨٩ك/٩٠٢ز) توانی بەسەر سجستان-دا زاڵبێ ([3]) ئەوجا دەوڵاتی سەفاری لەئارادا نەما، پاش ماوەیەکی کورت لـە حوکمڕانیـدا هەرچـەندە سـوپایەکی بـەهێزی هـەبوو و وڵاتێکـی زۆر لـەژێر دەسـەڵاتیدا بـوو و سەرکردەکانی بەباشی کارەکانیان بـەڕێوە دەبرد، لەناوچـوو، هۆکـاری سـەرەکی بـۆ لەناوچوونی بریتیە لە هەرەشەکردنی لەخیلافـەتی عەباسـی و هەڵوێـستی شـەڕانگێزی خیلافەت لەبەرامبەری و ئەو هەوڵە زۆر و بەردەوامەی بۆ لەناوبردنی.

---

[1] هەمان سەرچاوە : ل٤٩٧-٥٠. ابن خلكان : ٦، ل٤٢٤-٤٢٥.

[2] هەمان دوو سەرچاوەی پێشوو: ل٧٦٢-٧٦٣-٤٢٦.

[3] الطبري: ب١٠ ل١٤٢-١٤٤.

## دەوڵەتی سامانی: ٢٦١ـ٣٨٩ك/٨٧٤ـ٩٩٩ز

### ناوی میرە سامانیەکان و ماوەی میرنشینی هەر یەك لەوان:

١- نصربن أحمد: (نصر)ی یەکەم ٢٦١ـ٢٧٩ك/٨٧٤ـ٨٩٢ز

٢- إسماعیل بن أحمد ٢٧٩ـ٢٩٥ك/٨٩٢ـ٩٠٧ز

٣- أحمد بن إسماعیل ٢٩٥ـ٣٠١ك/٩٠٧ـ٩١٣ز

٤- نصربن أحمد : (نصر)ی دووەم ٣٠١ـ٣٣١ك/٩١٣ـ٩٤٢ز

٥- نوح بن نصر: نوحی یەکەم ٣٣١ـ٣٤٣ك/٩٤٢ـ٩٥٤ز

٦- عبد الملك بن نوح : (عبدالملك)ی یەکەم ٣٤٣ـ٣٥٠ك/٩٥٤ـ٩٦١ز

٧- منصور بن نوح : منصورـ ی یەکەم ٣٥٠ـ٣٦٦ك/٩٦١ـ٩٧٦ز

٨- نوح بن منصور : نوحی دووەم ٣٦٦ـ٣٨٧ك/٩٧٦ـ٩٩٧ز

٩- منصور بن نوح : (منصور)ی دووەم ٣٨٧ـ٣٨٩ك/٩٩٧ـ٩٩٩ز

١٠- عبدالملك بن نوح : (عبدالملك)ی دووەم ٣٨٩ك/٩٩٩ز

سامانیەکان دەگەڕێنەوە بۆ یەکێك لە خانەوادە فارسە ڕەسەنەکان کەوا ئاینی زەردەشتی کردبوو بەئاینی خۆی. پاشان (سامان خوداه)ی باپیرەیان موسڵمان بوو، ناوبراو یەکێکە لەپایە بەرزانی شاری (بلخ) لەسەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك دا. چووە ریزی بانگەشەی عەباسی لە خۆراسان و لەگەڵ ئەبو موسلیم کاری کرد ([1]).

سامان کوڕێکی هەبوو ناوی ئەسەد بوو، بەخۆشی ناوی (ئەسەدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسری) ئەو ناوەی لێنا کە فەرمانڕەوای ئەمەویەکانە لەسەر خۆراسان، جا لەسەر دەستی ناوبراو موسڵمان بوو([2]) دەوڵەتی سامانی لە هەرێمی دوای ڕووبار دامەزرا و ئێرانی گرتەوە و خۆراسانی کۆنترۆڵ کرد و (طبرستان) و ڕەی و شاخەکان و

---

[1] إقبال : ١٣٣٦.

[2] ذبیح الله، صفا: تاریخ ادبیات در إیران، ب١ ٦ ٢٠٤.

سجستانی خسته ژێر رکێفی خۆی، هەوەسێکی جیاخوازی فارسی بەشێوەیەکی دیار نواند ئەوەش لەمیانەی زیندوو کردنەوەی زمان و رۆشنبیریەتی فارسی ([1]).

کوڕەکانی ئەسەد، نوح و ئەحمەد و یەحیا و ئیلیاس، رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لەدانانی سنورێك بۆ بزوتنەوەی (رافعی کوڕی –اللیپ–ی کوڕی –نصر–ی کوڕی سەیار) لە سەردەمی خەلیفە مەئموندا. ئەمیش خەلاتی کردن و لە پلەوپایەی بەرز کردن و کردنی بە فەرمانڕەوای گرنگترین شارەکانی دوای رووبار ([2]).

ئەم برایانە بە هاوکاری تاهیریەکاندا سەرکەوتن لە بەرەنگار بوونەوەی هێرش و پەلاماری تورکە بتپەرستەکان بۆ سەر ناوچە سنوریەکاندا، هەروەها لە ململانێی نێوان تاهیریەکان و سەفاریەکاندا بەشدار بوون، پشتیوانی کردن، ئەمەش وای لە تاهیریەکان کرد بەشێوەیەکی هەمیشەیی دانیان پێ بنێن لەسەر کارەکانیاندا.

کاتێك دەوڵەتی تاهیری لەناوچوو لەساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ز) سامانیەکان سەربەخۆیانە حوکمی هەرێمی دوای رووباریان کرد، راستەوخۆ بەناوی خیلافەتەوە حوکمڕانیان کرد. خیلافەتیش ئەم مانووبوون ودڵسۆزییەی لەبەرچاوگرت وئەم هەرێمەی لەهەرێمی خۆراسان جیاکردەوە و ویستی خەلاتیشیان بکات، لەلایەکی دیکەشەوە ویستی هێزێکی لایەنگر لە دوای ئەو ناوچەیەی کە لە ژێر دەسەلاتی سەفاریەکاندا بۆی بدۆزێتەوە تا بەکەڵکی بێت لە کاتی پێویستیدا.

سامانیەکان لەمیانەی ژیانی سیاسیاندا سوور بوون لەسەر: پابەند بوون بە گوێرایەڵی کردنی خیلافەتی عەباسی. سەرکەوتن لەبەدەستهێنانی دۆستایەتیان. لەراستیشدا ئەوان ئاواتەخواز بوون فراوانکاری بکەن بێ ئەوەی بچنەناو ململانێی ناوخۆییەوە لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامیەکانی تردا، بەمەش تەواوکەری ئەو ئەرکە بوون کە تاهیریەکان دەستیان پێکرد، پارێزەرانی ئاسایش و یاسا. ئەوە بوو دەسەلاتی جیهانی ئیسلامیان گەیاندە ئەو دیوی سنوورەکانی رۆژهەلات، بۆ ناوەڕاستی ئاسیا. جا فەتحەکانیان زیاتر لە تورکستان بوو –رۆژهەلاتی روباری جیحون.

---

[1] Brown:literary Hist. of Persia ,I,pp٣٠٦,٣٦٩,٣٩٩

[2] ابن الاثیر:ب٦ لا٤.

شارستانیەتی ئیسلامیان لەو وڵاتە بتپەرستە بڵاو کردەوە، ژمارەیەکی زۆریش لە تورکە بتپەرستەکاندا لەسەر دەستیان هاتنەناو ئیسلامەوە. بەمەش رەگەزێکی نوێیان بەجیهانی ئیسلامی پێشکەش کرد لە ئایندەدا رۆڵێکی کارا ئەگێڕێ لە ژیانی ئیسلامیدا.

لەلایەنی خۆیەوە، خیلافەت سامانیەکانی بە فەرمانڕەوایەکی دڵسۆز بینی بەڵام سەربەخۆ و سەروەریەکی تەواویان هەبوو لە ناو وڵاتی خۆیاندا. پشتی پێ دەبەستن لە چەسپاندنی دەسەڵاتی لە رۆژهەڵاتدا و لە لێدانی یاخی بووەکان. بۆ نموونەش، (نصر)ی دووهەم – کەوا لەسەردەمیدا، هێزی سامانیەکان گەیشتە لوتکە- بزوتنەوەکانی (شمکیری کوڕی زەییار) و (ماکانی کوڕی کالی) و هیتریش لەوانەی کە لەدەسەڵاتدا یاخی بوون، سەرکوت کرد. لەئاکامی سەرکەوتنەکانی بەسەریاندا، ئەبهەر و قەزوین و قوم و هەمەدان و نەهاوەند و دەینەوەری خستە ژێر رکێفی خۆی، گەیشتە حەلوان ([1]).

پەیوەندی سامانیەکان بە دراوسێ موسڵمانەکانی بە دوژمنایەتی ناسرا، ئەوەش بە هۆی دژایەتی کردنیان بۆ عەباسیەکان. ئینجا بەناچارییەوە چوونە ناو ململانێیەك لەگەڵ سەفاریەکانداو دەوڵەتەکەیانیان لەناوبرد هەروەها روبەرووی تاڵبیەکانیش بوونەوە. ئەوە بوو ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدی سامانی هەستا بەلەناوبردنی عەلی موحەممەدی کوڕی زەیدی عەلەوی میری (گبرستان)ی لەساڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ن)، پاش ئەوەی ئەم میرە تەماحی لە خۆراسان کرد([2]).

لەراستیدا بانگەشەی شیعی لە خۆراساندا نەبڕایەوە، چونکە بەشێکی زۆر لە دانیشتوانەکەی هاوسۆز بوون لەگەڵ تاڵبیەکاندا، بەتایبەتی پاش دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عوبەیدی لە مەغریبدا، چونکە بانگخوازە عوبەیدیەکان رێگای خۆیان بۆ ئەم ناوچەیە دۆزیەوە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەشەکەیان لەناویدا، توانیان میر (نصر)ی دووهەم کوڕی ئەحمەد بۆ لای خۆیان رابکێشن([3]).

---

[1] إقبال : ل١٤٦.

[2] ابن الاثير: ب ٦ ل ٩٦،٩٧.

[3] إقبال : ل١٤٣.

وادیاره بەهۆی ئەم رووتێکردنە، میر (نصر) دووچاری بەرهەڵستکاری بوو لەلایەن سەرانی پاسەوانی تورك و داروودەستە و پیلانیان گێرا بیکوژن، بەڵام شکستیان هێنا. لەلایەکی ترەوە هاوسۆزی سامانیەکان لەگەڵ رێبازی ئیسماعیلی کاتی بوو، ئەوە بوو لەپاش مردنی (نصر)، نوحی کوڕی لە کاردانەوەیەکی زیانبەخشدا مەزهەبی ئیسماعیلی لەناو برد([1]).

دەوڵەتی سامانی سەد و بیست و هەشت ساڵی خایاند، زۆرتریشی دەخایاند، ئەگەر ناوماڵی سامانی تووشی کێشەی ناوخۆیی و فشاری دەرەکی نەبوایە کە بووە هۆی لەناو چوونی.

لە ڕووی کێشەی ناوخۆیەوە، ئەوا ململانێی خانەوادەیی لەنێوان تاکەکانی ناوماڵی سامانیدا بەرپابوو، کە بووە هۆی ئاشوب و ئاژاوە، هەروەها سەرکردە و کاربەدەستانی هەرێمەکان یاخی بوون لێیان بە پاڵپشتی بنەماڵەی بوەیهی ([2]).

لە ڕووی فشاری دەرەکیەوە، ئەوا دەوڵەتی سامانی دووچاری فشاری بەردەوامبووی دەیلەم و تالیبیەکان و بوەیهیەکان و پیاو ماقوڵانی تورك و غەزنەویەکان بووەوە، ئەمەش بووە هۆی لاوازبوونەوەی و تەماحی دراوسێکانی، سەرئەنجام موڵکەکەی دابەش بووە سەر دوو هێزی گەشەکردوو، هێزی غەزنەوییەکان و هێزی خانەکانی تورك ([3]).

ئەوە دەمێنێ کە بڵێین، سامانیەکان رۆڵێکی شارستانی و سیاسی بەرچاویان گێرا. سەردەمی ئەوان ناسرا بە بوژانەوەی زانستی و ئەدەبی بەشێوەیەك بوخارای پایتەختیان کرد بە یەکێك لە گرنگترین ناوەندە زانستیەکانی ئیسلام. روویان کردە زیندوو کردنەوەی رۆشنبیریەت و ئەدەبی فارسی کەوا لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا کەوتە بوژانەوە، لەسەردەمیاندا نووسین بەزمانی فارسی ویڕای زمانی عەرەبی، دەرکەوت.

کتێبخانەکەی میر نوحی کوڕی (نصر)، ناوی دەرکرد، کەوا (ئیبن خەلەکان) دەربارەی دەڵێ: ((هاوتای نەبووە، لە هەموو هونەرێك کتێبی تیابووە، هەندێکی ناسراو بووە لەلای خەڵکی و هەندێکی تری لە هیچ شوێنێکی تر نەبووە و هەر ناویشی

---

[1] هەمان سەرچاوە پێشوو: ل١٤٤.

[2] دەربارەی ململانێی خانەوادەیی لەناو ماڵی سامانی بگەڕێوە بۆ : بارتۆلد: ل٢٧٢،٢٧١.

[3] دەربارەی هەرە سهێنانی دەوڵەتی سامانی بگەڕێوە بۆ : إقبال، ل١٦٢.

نەبیستراوە سەرەرای زانستەکەی)) ([1]).سەردەمی سامانی راپەرینێکی پیشەسازیشی بە خۆوە بینی کە لە دروست کردنی گلێنە و گۆزە و کاغەز و فەرش و چنراوی ئاوریشم، دەرکەوت.

لە رووی سیاسیشەوە، ئەوا سامانیەکان بەرگریان لەناوچەکانی سەرسنوری رۆژهەلات کرد و دەسەلاتی ئیسلامیان گەیاندە ولاتی تورك، رۆژێ لە رۆژان لە شوێنەکەوتەییان بۆ خیلافەتی عەباسی لە بەغداد دا دەرنەچوون، خۆیان بە ئامرازێکی گوێرایەل و جێبەجێکار بۆ فەرمانی خەلیفە عەباسیەکان دانا. وادەی حوکمرانیان بەسەردەمی زێرین دادەنرێ لە مێژووی ئیسلامیی ئاسیای ناوەراستدا.

## دووهەم: پەیوەندی لەگەل دەولەتە جیاخوازەکاندا لە میسر و ولاتی شامدا

### دەولەتی تۆلۆنی : ٢٥٤ـ٢٩٢ك/٨٦٨ـ٩٠٥ز

### ناوی میرە تۆلۆنیەکان و ماوەی میرنشینی هەریەك لەوان:

| | |
|---|---|
| ١ـ ئەحمەدی کوری تۆلۆن | ٢٥٤ـ٢٧٠ك/٨٦٨ـ٨٨٤ز |
| ٢ـ خیمارەوەی کوری ئەحمەد | ٢٧٠ـ٢٨٢ك/٨٨٤ـ٨٩٥ز |
| ٣ـ ئەبو لعەساکەر جەیشی کوری خیمارەوەی | ٢٨٢ـ٢٨٣ك/٨٩٥ـ٨٩٦ز |
| ٤ـ هارونی کوری خیمارەوەی | ٢٨٣ـ٢٩٢ك/٨٩٦ـ٩٠٤ز |
| ٥ـ شەیبانی کوری ئەحمەد. | ٢٩٢ك / ٩٠٥ز |

[1] ابن خلكان:ب ١٥٢٧.١٥٣.

## دامەزراندنی دەوڵەتی تۆلۆنی

دەوڵـەتی تۆلـۆنی، ئەحمـەدی کـوڕی تۆلـۆن دایمەزرانـد، نـاوبراو یەکێکـە لەکۆیلـە تورکەکان لەساڵی (٢١٤ك/٨٢٩ز) لەدایك بووە، تۆلـۆنی بـاوکی لەسـاڵی (٢٠٠ك/٨١٦ز) بەدیاری لەلایەن نوحی کوڕی ئەسەدی سامانی، فـەرمانڕەوای بوخـارا، پێـشکەش بـە خەلیفـە مـەئمون کـرا، لەسـاڵی (٢٣٠ك/٨٤٥ز) بـاوکی کۆچـی دوایـی کـرد. ئەحمـەد لەکەشێکی ئاینیدا پێگەیی، سەرزەنشتی تورکـەکانی دەکـرد لەسـەر ئەنجامدانیان بـۆ کـاری ناپەسـەند، ئـەو خێـری زۆر دەکـرد، بەخـشندە و دادپـەروەر بـووە لەگـەڵ هاوڵاتیاندا. سەرەتای ژیانی سیاسی و سەربازی لەناوچەی سـەر سـنووری (طرسـوس) بردەسەر. وادیارە ئەو هەر لەسەرەتاوە رێـزی تورکـەکان لەشارنـشینی خیلافەتـدا بـە دەستهێنا، هەروەها پشتگیری سەربازەکان و سەرکردەکانیان لـەهاوڕێیانی باوکیـشی، متمانەی خەلیفە (المتوکل)یشی دەستەبەر کـرد کـەوا ئـەوەی بـە دەسـتی بـاوکی بـوو پاش مردنی سپاردی بە ئەم، هەروەها متمانەی خەلیفە (المستعین) یش ([1]).

لەپاش مردنی باوکی، دایکی شووی بە میر (بایکبـاك)ی تـورکی کـرد کـەوا لەسـاڵی (٢٥٤ك/٨٦٨ز) خەلیفە (المعتز) کردی بـە فـەرمانڕەوای میـسر، ئـەوە بـوو ئەحمـەدی کوڕی تۆلۆنی نارد بۆ ئەوەی حوکمڕانی بکات لەجێی. جا سەر تاسـەری ویلایەتـەکەی بە دەستەوە نەبوو، بەڵکو پێشنوێژی و شارنشینی میسر ( فسطاط). بـەڵام ئـەو هـات بۆ میسر و گەلێ ئاواتی سیاسیی فراوانخوازی پێبوو ([2]).

هەلومەرجی سیاسی و باری تێکچووی ئابووری پاڵپشتی کرد پێـی لەمیـسر جێگیر بکـات. ئـەوە بـوو لەسـاڵی (٢٥٦ك/٨٧٠ز) بایکبـاك کـوژرا، بۆیـە ویلایـەتی میـسر بـە (بـارجوخ) سـپێردرا کـەوا پەیوەندییـەکی بـاش و ژن و ژنخـوازی بـە کـوڕی تۆلـۆن دەیبەستەوە. دانی بە دەسەڵاتەکەی نا، دەسەڵاتی زیاتریشی پێدا، هەموو میسری پێ سپارد([3])، جگە لـە (دارایـی) بەدەسـتی ئەحمـەدی کـوڕی ئـەلمودەبیر مایـەوە کـەوا

---

[1] البلوي : سيرة ابن طولون: ل٤٠.

[2] ابن الاثير: ب ٥ل٣٣٩.

[3] ابن الاثير: ب٥ ل٣٣٩.

ناوبەد بوو، ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆ ئەوەی كوڕی تۆڵۆن داوا لەخەلیفە (المهتدی) بكات لەسەر (دارایی) میسر لابیەرێ و رادەستی خۆیی بكات. خەلیفەش داواكەی پەسەند كرد، هەروەها كردی بە فەرمانڕەوای ناوچە سەر سنووریەكانی شام لە ئەنجامی تێكچوونی باروئۆخی ([1]).

كاتێك بارجوخ لەساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ز) مرد، ئەحمەدی كوڕی تۆڵۆن راستەوخۆ لەلایەن خیلافەتەوە بوو بە فەرمانڕەوای شەرعی میسر([2]) و سەرجەم كاروبارەكانی گرتە دەست. ئەسكەندەریە و بەرقە -ش هاتنە ژێر فەرمانی، میری گوندەكان ملكەچی و گوێڕایەڵی خۆیانیان بۆ نواند([3]). بەوەش كوڕی تۆڵۆن كاروباری ئیداری و دادوەری و سەربازی و دارایی هەموو میسری گرتە دەست، بۆیە هەردوو دەستی بەتاڵ بوو و دەستی كردە ئاوەدانكاری، ئەمەش نیشانەی زۆر گرنگی دانیەتی بەم وڵاتە و ئاواتی بە دامەزراندنی دەوڵەتێكی تایبەت بەخۆی و جیا لە خیلافەت، كاری راستەقینەی كرد بۆ پێشخستنی (فسطاط) بە مەبەستی گەیاندنی بە ئاستی بەغداد ناوەندی خیلافەت ([4]) ئەوە بوو لەساڵی (٢٥٧ك/٨٧١ز) لە ئەوپەڕی باكووری رۆژهەڵاتی (فسطاط) دەفەرێكی نوێی دروست كرد، خانوو و بازاڕ و گەرماو و دیوانەكانی حكومەتی لەخۆ گرتبوو، بەخشی بە سەربازەكانی، لەبەر ئەوەش دەفەرەكە ناونرا بە (القطائع - بەخشراوەكان)، مزگەوتێكی تیا دروست كرد كە تا ئەمڕۆ ماوە و لەتەنیشتیدا خانەی میرنشینی دامەزراند([5])، هەروەها نەخۆشخانەیەكی بۆ چارەسەركردنی نەخۆشەكان بیناكرد و دەرمانخایەكیشی پێ لكاند.

كوڕی تۆڵۆن هەستا بە قایم كردنی بەرەی ناوخۆیی لەمیانەی گەشەدان بە سەرچاوەكانی سامان و زیاد كردنی داهات لە بوارەكانی بەرهەمی كشتوكاڵی و

---

[1] ابن سعيد علي بن المغربي: المغرب في حلي المغرب، و المشرق في حلي المشرق:ب ١القسم الخاص بمصرل٧٩٦.الكندي : ل٢١٧. ابن تغري بردي : النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة :ب٣ :ل٧.

[2] ابن الاثير: ب٥ ل٣٦٧.

[3] ابن تغرى بردى : ب ل٧٣.

[4] زبود، محمد احمد: العلاقات بين الشام و مصر في العهدين الطولوني و الاخشيدي ل٢٦.

[5] لين بول : سيره القاهره : ل٨٢.

پیشەسازی و بازرگانی، کەناڵەکانی ئاودێریی چاککردەوە و میتری هەڵکەند، هەروەها بەنداوە روخاوەکانی چاککردەوە، هەڵسوکەوتی رەقی بەرپرسانی باج وەرگرتن لەگەڵ جوتیارەکاندا قەدەغە کرد، وەرگرتنی دیاری و یارمەتی دارایی لەسەر کارمەندەکانی یاساغ کرد، لەئەنجامی ئەم گۆڕانکارییەش رەوشی میسر باشترەوە بوو، کشتوکاڵ گەشەی کرد، بازرگانی چالاك بووەوە، جموجوڵی پیشەسازی زیادی کرد، ستەم لەسەر خەڵکی هەڵگیرا، خۆشگوزرانی سەرتاسەری وڵاتی گرتەوە و کوڕی تۆڵۆن خۆشەویستی میسرییەکانی بەدەستهێنا.

لەئەنجامی ئەم چاکسازییە، پارەیەکی زۆر و زەبەن بۆ کوڕی تۆڵۆن کۆ بووەوە، یارمەتی دا لەپێکهێنانی سوپایەکی بە هێز لایەنگری بوو و هاوکاری کرد لە بەدیهێنانی پرۆژەکانی و بەرگری کردن لێی.

ئابەم شێوەدا کوڕی تۆڵۆن دەرفەتی بۆ رەخسا و دەوڵەتێکی سەربەخۆی لەمیسر دامەزراند، بەڵام بە هەندێ رواڵەت پەیوەست بوو بە خیلافەت، لەوانەش:

- پاڕانەوە بۆ خەلیفە لە وتاری هەینیدا.
- نەخشاندنی ناوی خەلیفە لەسەر دراو.
- ناردنی بەشێك لە (دارایی) بۆ پایتەختی خیلافەت. (1)

## پەیوەندی ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن بە خیلافەتی عەباسی

رەنگە ئەو گرفتە گەورەیەی کە ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن دووچاری بوو و خەریکبوو دەستکەوت و ئاواتەکانی لە ناو بەرێ، بریتی بوو لە پەیوەندیی لەگەڵ میر (الموفق) ئەبو ئەحمەد، باوکی ئەحمەد (المعتضد)ی خەلیفە کەوا بەسەر کاروباری گشتی پایتەختی خیلافەتدا زاڵبوو، دەستی کردە چاکسازی کردن بەمەبەستی راپەڕاندنی دەسەڵاتی ناوەندی و بەهێز کردنی مشتی لەسەر ویلایەتەکاندا، بە میسریشەوە.

لەبەر ئەوەش بە جدی هەوڵیدا بۆ لە ناوبردنی دەوڵەتی تۆڵۆنی کەوا لە ئیدارەی

---

[1] العبادی: ١٢٩٧.

ناوەندی جیا بووەوە و سەربەخۆیانە حوکمی میسری کرد و چاوی بەرەو ولاتی شام تێ ئەبڕی، ناکۆکی لەنێوان هەردوولا بەروونی دەرکەوت، (الموفق)یش بۆ هێنانە دیی مەبەستەکەی لەسەر دوو تەوەر هەلسوکەوتی کرد:

الاول: هەولیدا کوڕی تۆلۆن لەسەر ولایەتی میسر لابەرێ لە میانەی (ئەماجۆر) فەرمانڕەوای ولاتی شام کەوا خۆشی لە تەماحەکانی کوڕی تۆلۆن و ئارەزووی فراونکردنی لەسەر حیسابی ئەم، ترسا.

هەرچەندە خەلیفە (المعتمد) هاوسۆز بوو لەگەڵ کوڕی تۆلۆن و هاوڕێتی و بەرژەوەندیەکی هاوبەش دەیبەستنەوە، بەلام زۆری لێکرا بانگهێشتی بکات بۆ بەغداد و دووری بخاتەوە لە میسر و بیخاتە ژێر چاودێری راستەوخۆی دەسەلات ([1]) و کوڕی ئەلمودەبیری گەڕانەوە بو سەر (دارایی) میسر ([2]). وادیارە (ئەماجۆر) خۆی ڕانەگرت لەبەردەم تۆلۆنیەکان، بۆیە گەڕایەوە بۆ ولاتی شام، هەروەها موسای کوڕی بغا-ش کەوا (الموفق) ملکەچکردنی ئەمانەی پێ سپارد، شکستی هێنا، پاش شکست هێنانی ئەماجۆر ([3]).

دیارە خەلیفە لەوە زیاتر بەگوێی (الموفق)ی نەکرد، بەتایبەتی ڕووداوە سیاسی و سەربازیەکان سەرنەکەوتنی ئەو سەرکردانەی سەلماند کە جێی کوڕی تۆلۆنیان گرتەوە لەکۆنترۆلکردنی بارودۆخەکە، ئەمەش وای لێکرد لە سالی (٢٦٢ك/٨٧٦ز) کوڕی تۆلۆن بۆ حوکمڕانی میسر بگەڕێنێتەوە([4]).

دووهەم: (الموفق) هەولیدا کوڕی تۆلۆن لەناوچە سەرسنوریەکانی شام دووربخاتەوە، بۆیە تۆمەتی درێغی کردن لەپاراستنی ناوچەکە لەهێرشی دوژمنانی بە تۆلۆنیەکان کرد، پرسەکە لەسەر دامەزراندنی کۆمەلێ فەرمانڕەوا لە دەرەوەی ناومالی تۆلۆنی یەکلایی بووەوە ([5]).

---

[1] البلوي : ل٧٧ه.

[2] اليعقوبي:ب ٢ ل ٤٧٤ ـ ٤٧٥.

[3] ابن الاثير: ب ٦ل١٣٦.

[4] البلوي : ل. ابن الاثير : ب٦ ل١٣٦.

[5] الطبري : ب٩ ل٥٣٢. ابن الاثير : هەمان سەرچاوە: ل ١٤،١٥.

بەلام کارەکە هێمن نەبووەوە، ئەوەش بەهۆی زاڵبوونی تورکەکان و بێ دەسەلاتیان لەهێورکردنەوە بارودۆخەکە.دانیشتوانی ناوچەکانی سەرسنور هەستیان بەم بۆشاییە سەربازیە و شڵەژاوە سیاسیە کرد، ئەمەش وای لەدانیشتوانی (لوئلوئە) کرد قەلاکە رادەستی بێزەنتیەکان بکەن([1]). خەلیفەش رقی هەستا و بە باشی بینی، ناوچەکە رادەستی کوڕی تۆلۆن بکاتەوە ([2]). ئابەم شێوەیە هەوڵ و تەقەلاکانی (الموفق) بۆ لەناوبردنی تۆلۆنیەکان سەرنەکەوت، کوڕی تۆلۆن بوو بە گرنگترین کەس لە نەخشەکێشانی سیاسەتی ولاتی شامدا، بەهۆی پەیوەندیی باشی بە خەلیفەوە و لوتکەی ململانێیدا لەگەڵ (الموفق)دا، ولاتی شامی پێسپارد سەرەڕای ناوچە سەر سنووریەکانی([3]).

لەساڵی (٢٦٤ک/٨٧٧ز) کوڕی تۆلۆن گەشتەکەی بۆ ناوچەکە دەستپێکرد بەمەبەستی وەرگرتنی. ئەوە بوو بەسەر فەلەستین و دیمەشق، (حمص)، حەلەب، ئەنتاکیە، (المصیصە)، (أذنة و طرسوس) و (الرقە)دا زاڵبوو، (الرقە)شی کرد بە بارەگای حوکمڕانی بۆ ئەوەی لە بەغدادەوە نزیك بێت. وای لێهات ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی رێك هاو سنووری عێراق بوون([4]). بەلام (الموفق) ئارامی نەدەگرت و هەر دژایەتی کوڕی تۆلۆنی دەکرد و تەنگی پێ هەڵدەچنی، جا ئەمجارە شێوازێکی دیکەی پەیڕەو کرد لە مامەڵە کردنیدا کە لەسەر ئاشوب نانەوە لەناو دامودەزگاکانی تۆلۆن هەستا بوو، ماوەیەکی زۆر خەریکی ئەوە بوو، ئەمەش بوو هۆی نیگەرانی کوڕی تۆلۆن.

ئەوە بوو لەساڵی (٢٦٥ک/٨٧٨ز) ئەلعەباسی کوڕی، لێی یاخی بوو([5])، هەروەها لەساڵی (٢٦٨ک/٨٨١ز) لوئلوئی نۆکەریشی کە فەرمانڕەوای (حمص) و حەلەب و قنسرین و شارەکانی (مضر) و ناوچە سەر سنوریەکانی شام بوو لەژێر فەرمانی

---

[1] هەمان سەرچاوە : ابن سعید : ل ٩١. ابن الاثیر: هەمان سەرچاوە.
[2] ابن الاثیر: هەمان سەرچاوە. ل ١٥.
[3] ابن الاثیر: ب ٦ل١٨٦.
[4] هەمان سەرچاوە.
[5] الطبري : ب٩ ل ٥٤٥.

دەرچوو([1]).

لەناوەڕاستی ئەم ململانێیانەدا، کوڕی تۆلۆن سیاسەتی بەکارهێنا بۆ بەرەنگار بوونەوەی پیلانەکانی (الموفق)، ئەوە بوو ناکۆکی نێوان ئەم و نێوان خەلیفەی بە هەلزانی و لەساڵی (٢٦٩ك/٨٨٢ز) داوای لە خەلیفە کرد بچێ بۆ میسر و لەوێ نیشتەجێ بێ تا لەرکێفی براکەی رزگاری بێ. بەڵێنی پێدا بیپارێزی و سەری بخات، هاوکات ناوی (الموفق) لە وتاردا وەکو جێنشینێك نەهێشت و ناوی لە دراو سڕیەوە، چونکە سنووری دەسەڵاتەکەی خۆی بەزاندوە([2]).

خەلیفە –داوا فریودەرەکانی– کوڕی تۆلۆنی پەسەند کرد و ویستی دەرچێ بۆ میسر، بەڵام (الموفق) بە پیلانەکەی زانی و خەلیفەی بۆ سامەڕا گەڕانەوە([3])، هاوکات کوڕی تۆلۆن دەرفەتی سەر قاڵبوونی (الموفق) بەجەنگاندنی زەنجەکانی قۆستەوە و کەوتە جموجوڵی سەربازی و دەسەلاتی خۆی بۆ سەر وڵاتی شام و ناوچەکانی سەر سنوری گەڕانەوە و بەرەو حیجاز چوو و لە مەککە روبەڕوی هێزەکانی (الموفق) بووەوە ([4]).

(الموفق)یش بەرپەرچی هەڵویستی رکابەرەکەی دایەوە، پاڕانەوە بۆی قەدەغە کرد و لەسەر دوانگەکاندا نەفرەتی لێکرد و بە ئاژاوەچی و تێکدەر ناوی برد و لەسەر میسر و شام لایبرد و ئیسحاقی کوڕی کنداج–ی کرد بە فەرمانڕەوا لەسەر کارەکانیدا([5]). ئابەم شێوەیە کوڕی تۆلۆن دەسەڵاتێکی فراوانی بە خۆیدا کە واقیعی ئەو ماوەیە دەنوێنێ و باڵادەستی تورکەکان و هێزی سەربازیان دەرئەخات، ململانێی نێوان هەردوولا بووە هۆی لاواز کردنی هەر یەك لە عێراق و میسر و دەستەوسانیان، لە رووبەڕو بونەوەی گۆڕانکاریەکانی دیکە لەسەر هەردوو گۆڕەپانی ناوخۆ و دەرەوە، دەرکەوت.

---

[1] ابن الاثير : ب ٦ ل١٨٧. ابن خلدون: العبر....المعروف بتاريخ ابن خلدون : ب٣٠ ل٣٣١٧.

[2] الطبري : ب٩ ل٦٢٠-٦٢١. ابن الاثير: ب٦ ل٤٩.

[3] الكندي : ل٢٢٩، ٢٢٥.

[4] ابن الاثير: ب٦ ل٤٩.

[5] ابن خلدون : ب ٣ل٦٩٥.

ئەرد بوو كوڕی تۆلۆن لاواز بووەوە، هێزەكەی لە مەككە دۆڕا و لەماڵی خوا نەفرەتی لێكرا [1] هەروەها لەناوچەی سەر سنوور لەژێر فشاری جموجوڵی یاخی بووەكان پاشەكشێی كرد، لەلایەنی خۆیەوە، (الموفق) خۆیی بە دەستەوسانی بینیەوە كە بەردەوام بێ لەم ململانیەدا بەهۆی ماندوو بوونی هێزەكانی و زانی كە ئەمە لە بەرژەوەندی هێزی ئیسلامی نیە، بەڵكو لە بەرژەوەندی دوو لایەنە دژ بە یەكەكەیە، لەبەر ئەوەش هەردوو لایەنەكە مەیلی لەیەك تێگەیشتنیان كرد.

دانوستان لە نێوان هەردوولا بەمەبەستی چەسپاندنی ئاشتی دەستی پێكرد. بەڵام مەرگ پەلەی لە كوڕی تۆلۆن كرد، لەسەرەتاكانی مانگی (ذي العقدة) پێش ئەوەی تەواو بێ ئەوەش لەساڵی (٢٧٠ك/٨٤٠ن) [2].

## پەیوەندی خیمارەوەی بە خیلافەتی عەباسی

سەربازەكان لە پاش مردنی ئەحمەدی كوڕی تۆلۆن بەیعەتیان بە خیمارەوەی كوڕی دا [3]. جا ئەوەی كە بۆی مایەوە بریتی بوو لە، ئەركی بەرگیریكردن لەو دەوڵەتەی كە باوكی لە میسر دایمەزراند، پاراستنی وڵاتی شام بەتایبەت لەگەڵ بەردەوامبوونی خیلافەت لە دژایەتی كردنی تۆلۆنیەكاندا و تەماحی میرە توركە ركابەرەكان لەحوكمڕانی میسر و شامدا.

یەكەم كار كە خیمارەوەی رایپەڕاند، رێكخستنی كاروباری وڵاتی شام بوو بە هۆی گرنگی لە پاڵپشتی كردنی دەسەڵاتەكەی لە میسر. ئەوە بوو سەركردایەتی كردنی گرنگترین شار و ناوچەكانی بە باشترین سەركردەكانی راسپارد، هەروەها زۆربەی سوپاكەی لەناوچەی حەلەب دانا. هێزێكی سەربازی بۆ (شیزەر) نارد [4].

هاوكات نووسراوێكی بۆ خیلافەتی عەباسی نووسی بۆ ئەوەی دان بەو ناوچانە بنێ

[1] الكندي : لا ٢٢٩.

[2] هەمان سەرچاوە. البلوي :لا٣٠٥. ابن الاثير : ب٦ لا٥٥.٥٦.

[3] ابن الاثير : ب٦ لا٥٦.

[4] ابن خلدوت : ب٣ لا٦٩٩. ابن الاثير :ب ٦لا٥٦. ابن العديم: زبدة الحلب من تاريخ حلب : ب ١لا٨٠.

کە لە ژێر دەستیدایە، لە بەرامبەر پارانەوە بۆی و گوێڕایەڵی کردنی، بەلام (الموفق) داخوازیەکەی رەتکردەوە، ئەمەش بووە هۆی بەردەوامبوونی ململانێ و پێکدادان لە نێوان هەردوولا ([1]).

(الموفق) توانی هێزێک کۆ بکاتەوە کە دوژمنی تولونیەکان و هەندی لەو سەرکردانەی کە لێیان هەڵگەڕانەوە لەخۆبگرێ، ئەوجا ئەم هاوپەیمانێتیەی بە لەشکرێکی عەباسی بە سەرکردایەتی ئەبو لعەباس پاڵپشتی کرد و هەموویانی بەرەو وڵاتی شام ئاراستە کرد.

هێزەکانی هاوپەیمان گەلێ سەرکەوتنی خێرایان بەدەستهێنا لە بەردەم پاشەکشێی تولونیەکان لە (رقە) و (العقاصم – پارێزگاکان).وە چوونە ناو ئینتاکیە و حەلەب، دیمەشق– یشی گرتەوە. فەلەستین ـ یشی داماڵی و گەیشتە لای سنووری میسر بە شێوەیەک میسری لێوە دیار بوو.

لەئاکامی ئەم سەرکەوتندا، خیمارەوەی بەخۆی دەرچوو بۆ وەستاندنی هێزی هاوپەیمان بەتایبەتی پاش ئەوەی کە هێزێکی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم هێزانە رەوانە کرد بەسەرکردایەتی (الواسطي)، ئەگەرچی ئەم هێزە چووە پاڵی هێزەکانی هاوپەیمان. ئەوە بوو لەسەر رووباری (فطرس) لەباشووری فەلەستین لە شوێنێک بە (الطواحين) ناسراوە، بە یەک گەیشتن ئەوەش لەساڵی (٢٧١ك/٨٨٤ن)، کە تێدا خیمارەوەی دۆڕا و بۆ میسر هەڵهات بەلام خۆڕاگری (سەعد ئەیسەر)ی سەرکردەی، دەرفەتێکی دیکەی پێدا بۆ سەرکەوتن، ئەوە بوو دیسانەوە هێرشی کردە سەر هێزەکانی هاوپەیمان و سەرکەوت بەسەریاندا و ئەبولعەباس هەڵهات و سەرکردەکانی کوژران ([2])سەر لەنوێ تولونیەکان دەسەلاتیان لە وڵاتی شامدا گرتە دەست. خیمارەوەی بەردەوام بوو لە فراوانخوازیەکەی لەجەزیرە و موسڵ تاوەکو سنووری دەوڵەتەکەی گەڕانەوە بۆ ئەوەی کە لە رۆژانی باوکیدا لەسەری بوو، لە (بەرقە)وە تا فورات، لە ئاسیای بچووکەوە تا وڵاتی نەوبە، دەسەلاتەکەی ناوچەی ئەرمینیا–شی

---

[1] ابن خلدون : ب٣ ■ ٦٩٥.

[2] الطبري :ب ١٠، ٨٧.

گرتـەوە ([1])، دەوڵـەتی تۆڵـۆنی بـوو بـە هێزێکـی گاڵتـە پێنـەکراو، سـەرەڕای ئـەم سـەرکەوتنانەی کـە خیمـاڕەوەی بەدەسـتیهێنا دەستپێشخەری کرد لـە داواکردنـی ئاشـتی ([2]) بەمـەش قۆنـاغێکی نـوێی دەسـتپێکردەوە لـە مێـژووی پەیوەنـدی نێـوان تۆڵۆنیەکان و خیلافەتی عەباسیدا. لەلایەنی خۆیەوە، (الموفق) هەستی بـە پێویستی چەسپاندنی ئاشتی و ڕێکەوتن لە نێوان هـەردوولا کـرد. خەلیفە حـوکمڕانی میسر و وڵاتی شام بە (وراثي) بۆ مـاوەی سـی سـاڵ بـە خیمـاڕەوەی و کوڕەکـانی بەخشی، بەمەرجی راوەستێ لە نەفرەتکردن لە (الموفق) لە سەر دوانگەکاندا و بپارێتەوە بـۆی لەگەڵ خەلیفەدا ([3]). لەپاش مردنـی هەریـەك لـە (الموفـق) لەسـاڵی (٢٧٨ك/٨٩١ن)، و خەلیفە (المعتمد) لەساڵی (٢٧٩ك/٢٩٢ن)، (المعتضد) چووە سـەر تـەختی خیلافـەت و ئەم هەلومەرجە نوێیە یارمەتی خیمارەوەی دا پەیوەندیەکانی بە پایتـەختی خیلافـەت پتەو بکاتەوە ([4]). جا ژن وژنخوازی پەیوەندی نێوان هەردوولای پتـەوتر کـرد، ئـەوە بوو خەلیفە، (قطر الندى)ی کچی خیمارەوەی، هێنا ([5]).

بەمـەش مـاڵی تۆڵـۆنی دەسـەڵاتێکیان پەیـدا کـرد، هـەروەها خیلافـەتیش هاوپەیمانێکی بەهێزی پەیدا کـرد لـەڕیزی دەوەسـتێ و پـشتگیری لێدەکات لـە ڕووی ماددی و سەربازییەوە.

## کۆتایی دەوڵەتی تۆڵۆنی

لەسـاڵی (٢٨٢ك/٨٩٦ن) خیمـاڕەوەی لەسـەر دەسـتی هەنـدێ لـە نۆکـەرەکانی لـە دیمەشق، کوژرا([6])، جا بە مردنی دەوڵەتی تۆڵۆنی شـڵەژا و دوای دە سـاڵ لەتەمـەنی بەرەو ڕوخان دەچوو، ئەوەش بـەهۆی دەسـتێوەردانی سـەربازەکان و ڕکابـەری میرە

---

[1] محمود، حسن احمد: حضارة مصر في العصر الطولوني، لا ١١٥

[2] الكندي : لا ٢٣٧. ابن تغري بردي: ب٣ لا ٥١.

[3] ابن تغری بردی: هەمان سەرچاوە : لا ٥٠-٥١

[4] الطبري: ب ١٠ لا ٢٠-٢١، ٢٠-٢٩.

[5] هەمان سەرچاوە : لا ٣٠

[6] ابن تغری بردی: ب٣، لا ٨٨-٨٩.

تۆلۆنیەکان لە نێوان خۆیاندا. ئەوە بوو تازە (ئەبو لعەساکر جەیشی کوڕی خیمارەوەی) جێی گرتەوە و پێش ئەوەی نۆ مانگ بە سەر دەسەلات گرتنی بەسەر بچێ، هارونی برای لایبرد. پاشان دەرکەوت کە هارون -یش بە کەڵکی فەرمانڕەوایی و دەسەلاتداری نایە ([1]).

لەو کاتەشدا دوو هێز دەرکەوتن، لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا هەڕەشەیان لە میسر دەکرد. یەکێکیان هێزی (قرمطي) بوو کەوا سوپاکەی دەستی کردە ئاژاوە گێڕی لەولاتی شامدا تا دەستی بەسەر باشووریدا، گرت. ئەوەی دیکەشیان هێزی عوبەیدیەکان بوو کەوا لە ڕۆژئاواوە هەستا.

هارون نەیدەتوانی بەرگەی ئەم دوو هێزە بگرێ و دەستەوسانی دەرکەوت لە لەناوبردنی (قرمطي)یەکان، \ سەلمێنرا کە تۆلۆنیەکان ئەو هێزەیانە لەدەستدا کە ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن و خیمارەوەی کوڕی هەیانبوو، بوونە گاڵتە بەدەستی سەربازەکان و هیچ پێویستیەك بۆ مانەوەی دەوڵەتەکەیان نەما.

خیلافەتی عەباسی ئاگاداری لاواز بوونی تۆلۆنیەکان بوو، بۆیە ئارەزووی کرد ولاتی شام و میسر بگەڕێنێتەوە بۆ ژێر دەسەلاتی ڕاستەوخۆی خۆی. ئەوە بوو خەلیفە (المعتضد) توانی ناوچە سەر سنووریەکان و ولاتی شام لە دەسەلاتی تۆلۆنیەکان بسێنێتەوە([2]).لەسالی (٢٩٢ك/٩٠٥ز) خەلیفە (المكتفي) هێرشی کردەسەر میسر، هێزەکانی تۆلۆنی خۆی ڕانەگرت لەبەردەم سوپای عەباسی کەوا چووە ناو شاری (القطائع ـ بەخشراوەکان) و خاپوری کرد، جگە لە مزگەوتەکە، بەوەش کۆتایی بە حوکمی تۆلۆنی هێنا. وە ئەم شارەش گەڕایەوە بۆ ژێر دەسەلاتی ڕاستەوخۆی خیلافەت([3]).

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] دەربارەی بە سەرهاتەکان لە ناوچە سەر سنووریەکاندا و کاریگەری لەسەر حوکمی تۆلۆنی بگەڕێوە بۆ: زبود : ل١٤٠٠-١٤٦. دەربارەی بە سەرهاتەکان لە ولاتی شامدا و کاریگەری لەسەر حوکمی تۆلۆنی : هەمان سەرچاوە: ل١٤٦-١٥٢.

[3] ابن تغري بردي : ب٣، ل١٣٤-١٤٠.

## دەوڵەتی ئەخشیدی ٣٥٨.٣٢٣ك/٩٦٩.٩٣٥ز

ناوی میرە ئەخشیدیەکان و ماوەی میرنشینی هەر یەك لەوان :

١- موحەمەدی ئەخشیدی کوڕی (طفج). ٣٣٤_٣٢٣ك/٩٤٦_٩٣٥ز

٢- ئەبو لقاسمی ئەنەوجوری کوڕی ئەخشید. ٣٤٩_٣٣٤ك/٩٦٠_٩[illegible]٦ز

٣ـ ئەبو لحەسەنی عەلی کوڕی ئەخشید. ٣٥٥_٣٤٩ك/٩٦٦_٩٦٠ز

٤ـ ئەبو (المسك الكافور). ٣٥٧_٣٥٥ك/٩٦٧_٩٦٦ز

٥ـ ئەبو لفەواریسی ئەحمەدی کوڕی عەلی. ٣٥٨_٣٥٧ك/٧٦٩_٩٦٧ز

### دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخشیدی

میسر گەڕایەوە بۆ ئامێزی خیلافەتی عەباسی و ڕاستەوخۆ خیلافەت حوکمڕانی دەکرد، ئەوەش بە دامەزراندنی والی لەلایەن خۆیەوە، بەڵام ئەم خیلافەتە لەسەردەمی (المقتدر) دا جارێکی تر سست و لاواز بووەوە و دەستەوسانی دەرکەوت لە پاراستنی دەسەڵاتەکەی لە ویلایەتەکاندا، بە میسریشەوە. ڕکابەری لەنێوان والیەکان و بەرپرسانی (دارایی) دووبارە بووەوە، ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی ڕەوشی ناوخۆ. لەگەڵ دەرکەوتنی مەترسی دەرەکی کە بریتی بوو لەهەوڵی عوبەیدیەکان بۆ پەلاماردانی میسر، جا ڕەوشەکە پێویستی بە فەرمانڕەوایەکی بەهێز هەبوو ئەم بۆشاییە پڕبکاتەوە و ڕووبەڕوی ئەم مەترسیانە ببێتەوە و میسر بکاتە دەڵەتێکی بەربەست لە بەردەم کشانی (فاطمي) بەرەو ڕۆژهەڵات، بۆیە خەلیفە (الراضي) لەساڵی (٣٢٣ك/ ٩٣٥ز)، موحەممەدی کوڕی (طفج)ی کوڕی جف ([1]) کرد بە فەرمانڕەوای میسر، و ئەم ئەرکەی پێسپارد([2]).

---

[1] (جف)ی باپیرەی یەکێك بووە لەو ئەفسەرە تورکانەی کە خیلافەت [illegible] پشتی پێ دەبەست وە (طفج)ی باوکی کاتێك خزمەتی ئەحمەدی کوڕی تۆلۆنی کرد ناوی دەرکرد، بنەچەی ئەم خانەوادەیە (فەرغانە)یە

[2] ابن تغری بردی :ب٣ لا٢٥١.

## پەیوەندی ئەخشیدیەکان بە خیلافەتی عەباسی

سەرەتا، موحەممەدی کوڕی (طغج) گرنگی بە بەهێز کردنی پلەوپایەی خۆی لەناوەوەدا. بۆیە سوپایەکی هاوشێوەی سوپای تۆلۆنی پێکهێنا. هەروەها سیاسەتێکی ئابووری هاوشێوەی سیاسەتی کوڕی تۆلۆن گرتەبەر لە کارەکانیدا، ئەوە بوو ئابووری وڵات گەشەی پێکرد و سۆزو خۆشەویستی میسریەکانی بەدەستهێنا. توانی بەرەنگاری هەڵمەتی عوبەیدیەکان ببێتەوە کەوا لە نێوان سالانی (٣١٢-٣٢٤ك/٩٢٤-٩٣٦ن) هێرشیان کردە سەر میسر، هاوکات پەیوەندی باشیشی بە خیلافەتی عەباسی، پاراست، جا خەلیفە وڵاتی شامیشی پێ سپارد و نازناوی ((ئەلئەخشید))ی لێنا، لەساڵی (٣٢٧ك/٩٣٩ن) لەسەر دوانگەکانی میسر و شام نزای بۆ کرا ([1]).

خیلافەتی عەباسی، لەو کاتدا، بە هۆی ململانێ لە پێناوی بەدەستهێنانی پۆستی (أمیر الامراء) گۆڕانکاریەکی خێرای بەخۆ دەبینی، ئەوە بوو لەساڵی (٣٤٦ك/ ٩٣٨ن)، (بجکم) گرتیە دەست، پاش ئەوەی کە بەسەر کوڕی رائق-دا سەرکەوت کەوا بەتەمای هەردوو ویلایەتی میسر وشام بوو بۆ ئەوەی قەرەبووی دۆڕانەکانی بکاتەوە. توانی راسپاردەی خەلیفە(الراضي) بە دەستبێنێ بۆ سەر حەلەب و کاروبارەکانی ([2]).

بێگومان خەلیفە ئەم کارەی لە بەرژەوەندی عەباسیەکاندا بینی کە لەسەر چاندنی تۆی دووبەرەکی لە نێوان والیەکاندا هەستاوە، دەربڕینی ئارەزووی خیلافەت بوو لە قبوڵ نەکردنی پەیدا بوونی دەسەڵاتێکی تر لە شام و میسردا کە هەڕەشە لە بەرژەوەندیەکانی بکات. خیلافەت لە بوونی ئەخشیدیەکان لەو ناوچانەی نزیکی عێراق دڵنیا نەبوو، هەرچەندە کوڕی (طغج) هەڵوێستی باشی هەبوو و خزمەتی بەرژەوەندیەکانی عەباسی دەکرد([3])، دوور نیە خیلافەت کوڕی رائق-ی بۆ وڵاتی شام

---

[1] الكندي : ل٢٨٨.

[2] ابن العديم : زبدة الحلب من تاريخ حلب :ب١ ل٩٩.

[3] زيود: العلاقات بين الشام و مصر في العهدين الطولوني و الاخشيدي : ل٢٩٣.

ئاراستە کردبێت بۆ ئەوەی رکابەری ئەخشید بکات و دەسەڵاتی کەم بکاتەوە([1]).

وادیارە کوڕی رائق هەر پۆستە تازەکەی وەرگرت تەماحی لەهەموو شام کرد. کەوتە دەستێوەردان لەکاروباری ئەخشیدیەکاندا. هەرچەندە ئەخشید نیگەرانی خۆی دەرخست و بێزاری خۆی دەربڕی، بەڵام ئەو بەباشی لەگەڵیا جوڵایەوە و هەوڵیدا رازی بکات.

وادیارە کوڕی رائق نیازە فراوانخوزیەکەی نەشاردەوە، ئەوە بوو بەرەو وڵاتی شام کەوتەڕێ و دەستی بەسەر (حمص) و دیمەشق-دا گرت پاشان بۆ رەملە و عریش کەوتەڕێ لەهەوڵێکدا بۆ چوونە ناو میسر. لەوێ روبەڕوی هێزە ئەخشیدیەکان بووەوە لەساڵی (٣٢٨ك/٩٤٠ن)، بەڵام دۆڕا و توانی خۆی رزگار بکات ([2]).

ئەخشید، سەرەڕای سەرکەوتنی، ویستی بەرژەوندی گشتی موسڵمانەکان زاڵ بکا بەسەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، لەگەڵ رەچاوکردنی باروردۆخی تێکچووی خیلافەتی عەباسی و هەڕەشەی بەردەوام لە دەوڵەتەکەی لەلایەن دەوڵەتی عوبەیدیەوە، لەلایەنی خۆیەوە، کوڕی رائق تێگەیشت کە هەڵوێستەکە پێویستی بەوەیە بگەڕێتەوە بۆ عەقڵ و ئاشتبێتەوە.

ئەوە بوو پەیماننامەی ئاشتی لە نێوان هەر دوولا مۆرکرا، کە تێدا دەبوایە ئەخشید دەست هەڵگرێ لەو ناوچانەی شامدا کە دەکەوێتە باکووری رەملە بۆ کوڕی رائق، پەیمانی دا ساڵانە لە باتی رەملە سەد و چل هەزار دیناری پێ بدا([3]).

پاش دوو ساڵ لەمۆر کردنی پەیماننامەکە، کوڕی رائق لەساڵی (٣٣٠ك/ ٩٤٢ن) لەسەر دەستی (ناصر الدولە)ی حەمدانی کوژرا([4]) ئەخشیدیش ئەم دەرفەتەی قۆستەوەی و بەبێ روبەڕوبونەوە زاڵبوو بەسەر وڵاتی شامدا، رووەو باکوور کەوتەڕێ تا گەیشتە نزیکی دەوڵەتی حەمدانی، هەروەها مەککە و مەدینەش هاتنە ژێر

---

[1] کرد علي، محمد خطط الشام.ب ١ل١٨٤.١٨٥.

[2] ابن الاثير: ب٦ ل٢٧٣.٢٧٤.

[3] ابن تغري بردي : ب٣ ل٢٥٣.

[4] مسكوية: ب٢ ل٢٧-٢٨.

دەسەڵاتی ([1])، بوو بەگەورەترین هێز لەجیهانی ئیسلامیدا. خەلیفە (المتقی)ش ناچار بوو دان بنێ بە (وراثـي) بوونی فەرمانڕەوایەتیەکەی لەسەر میسر، دانیشی بە دەسەڵاتی لە وڵاتی شامدا نا([2]).

هاوسنوری هەردوو دەوڵەتی ئەخشیدی و حەمدانی و تەماحیان لەوڵاتی شام بووە هۆی ململانێ لەنێوانیاندا. ئەوە بوو (سیف الدولە) هەڵمەتێکی سەربازی بەڕێوەبرد و لەساڵی (٣٣٣ك/٩٤٥ز) زاڵبوو بەسەر حەلەب و دیمەشق، کەوتە خۆئامادەکردن بۆ پەلاماردانی میسر، ئەمەش وای لەئەخشیدی کرد بەخۆی دەرچێ بۆ وڵاتی شام تا بەرەو پێش هاتنی حەمەدانیەکان بوەستێنێ ([3]).

لەئاکامی ئەو پێکدادانەی کە لە قنسرین لە نێوان هەردوولا روویدا (سیف الدولە) دۆڕا و ئەخشید چووە ناو میسرەوە و دیمەشق-یشی گرتەوە، بەڵام ئەخشید جارێکی دیکە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانەکانی خستە پێش بەرژەوەندی تایبەتی خۆی. ئەوە بوو لە گەڵ (سیف الدولە) پەیماننامەی ئاشتی مۆر کرد، بەپێی ئەو پەیماننامەیە، دەستی لە حەلەب و باکووری شام بۆ ناوبراو هەڵگرت. ([4])

وادیارە ئەخشید، هەبوونی هێزێکی ئیسلامی لە باکووری شامدا، وەکو هێزی حەمەدانیەکان، بەپێویست زانی، بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی بیزەنتیەکان بۆ سەر ناوچەکانی ئیسلامدا، سەرەڕای ئەوەی کە ئەخشیدیەکان لە ژێر فشارێکی دەرەکی گەورە بوون لە لایەن عوبەیدیەکانەوە، هەروەها کەوتنە روبەڕوبونەوەی هەندێ لە بزوتنەوە ئاژاوەچیەکاندا وەکو بزوتنەوەی (غلبون) لەناوچەی (ئەشمونیەکان)دا ([5]).

لەلایەکی دیکەوە، ئەوا خیلافەتی عەباسی نیاز پاك نەبوو لە گەڵیا، چونکە بەردەوام فەرمانڕەوای بۆ وڵاتی شام رەوانە دەکرد تا هەڕەشە لە دەسەڵاتی ئەخشیدی بکەن. لەبەر ئەوەش مەیلی ئاشتبونەوەی کرد.

---

[1] ابن الاثیر: ب٦ ل٢٨٤.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە:ب٦ ل٣١٢

[4] ابن تغري بردي: ب٣ ل٢٥٥.

[5] الكندي :ل٢٩٦.

وەكو چۆن پێشتر كوری تۆلۆن هەوڵی دا مەڵبەندی خیلافەتی عەباسی بگوازێتەوە بۆ میسر، لەساڵی (٣٣٢ك/٩٤٤ز) ئەخشیدیش ئەم هەوڵەی دووبارە كردەوە. ئەوەش كاتێك میرە توركەكان بەسەر خەلیفە (المتقی)دا زاڵبوون، حەمەدانیەكانیش یارمەتیان نەدا. بۆیە ناچار بوو هانا بۆ ئەخشیدیەكان بەرێ.

بەلام خەلیفە رازی نەبوو پایتەختەكەی بە جێبێڵێ، بۆیە داواكەی ئەخشیدی رەتكردەوە([1]). هەرچەندە شكستیشی هێنا بەلام توانی دانپێنانێكی لێ دەستكەوێ بە (وراثي) بوونی میسر بۆ خۆی و نەوەی لەپاش خۆیدا، هەروەها دانیشی نا بە دەسەلاتەكەی لەسەر ولاتی شام. ئەم دانپێنانە لەسەردەمی خەلیفە (المستكفی) لەساڵی (٣٣٣ك/٩٤٤ز) تازە بووەوە. ئەخشیدیش لەلایەنی خۆیەوە لە سەرتاسەری ویلایەتەكەی لەسەر دوانگەكاندا دەپارایەوە بۆ خەلیفەی عەباسی([2]).

لەساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) ئەخشید كۆچی دوایی كرد([3])، جا پێش مردنی، موڵك و دەسەلاتی بە دوو كورە بچووكەكەی خۆی ئەنەوجور و عەلی راسپارد، بەمەرجێ (كافوری حەبەشی) بەو راسپاردە هەستێ. ئەوە بوو كافور وەكو راسپێردراوێك بیست و دوو ساڵ میسری حوكمڕانكرد، تا ئەو كاتەی هەریەك لەئەنەوجور و عەلی لەدوو ساڵی (٣٤٩ك/٩٦٠ز) و (٣٥٥ك/٩٦٦ز) كۆچی دابیان كرد، ئەو زۆرдارانە حوكمی كرد. خیلافەتی عەباسی وەكو فەرمانڕەوایەك لەسەر میسر، دانی پێنا ([4]).

(كافور) لەماوەی راسپێرییەكەیدا توانی یەكگرتوویی دەوڵەت بپارێزێ، بەرگری لێبكات دژی مەترسی حەمەدانیەكان لە باكووردا و (قرمطي)یەكان كەوا هێرشیان كردە سەر ولاتی شامدا، میرەكانی نەوبە لەباشووردا، هەروەها بەرەنگاری كشانی عوبەیدیەكان بەرەو میسر، بووەوە.

بەلام هێرشی عوبەیدیەكان بۆ سەر ئەم ولاتەدا هەر بەردەوام بوو، هەروەها

---

[1] الانطاكي، يحيى بن سعيد : تاريخ الانطاكي : ل٤٦. ابن تغري بردي : ب ٣، ل٢٥٤.

[2] هەمان دوو سەرچاوە.

[3] ابن الاثير: ب٦ ل٣١٨.

[4] ابن تغري بردي : ب٤ ل٢.

بانگخوازەکانیان توانیان بانگەشەی خۆیان لەناو کۆمەڵگەی میسریدا بڵاو بکەنەوە.

ئەوە بوو خەلیفەی عوبەیدی (المعز)، داوای لە (کافور) کرد بێتە ژێر فەرمانی، بەڵام هێندە زیرەك و ژیر بوو توانی بە درێژایی سەردەمی خۆی هێرشی عوبەیدیەکان بۆ سەر میسر دوابخات.

ئەوە بوو لەپاش مردنی کافور لەساڵی (٣٥٧ك/ ٩٦٨ن) رەوشی میسر تێکچوو و بەهۆی تەمەن بچووکی کوڕەزاکەی و نەبوونی کەسایەتیەکی بەهێز لەنێو پیاوانی کۆشکدا بتوانێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە ئەو بەجێی هێشت. (ئەبولفەوارس ئەحمەد)، جێی گرتەوە.

خەلیفەی عوبەیدی (المعز)، بەتێکچوونی رەوشی سیاسی و ئابووریی میسر، زانی، بۆیە بەهەلی زانی و لەساڵی (٣٥٨ك/٩٦٩ن) ئەم وڵاتەی گرت. ([1])

لەراستیدا لەپاش مردنی (کافور) دەسەڵاتی ئەخشیدی لەحوکمی فەوتاندا بوو. پێویست بوو هێزێك هەبێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە هێزی ئەخشیدی بەجێی هێشت، پاشان چوونی عوبەیدیەکان بۆ ناو هەریەك لەمیسر و وڵاتی شام، سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو لە پەیوەندیە مێژووییەکانی نێوان خیلافەتی عەباسی و خیلافەتی عوبەیدی.

---

[1] ابن تغری بردی:ب٤ لا ١٨، ٢٤-٢٥.

## بەندی نۆهەم

# ڕەوشی دەرەکیی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

### پەیوەندی لەگەڵ (بێزەنتی)یەکاندا

بێزەنتیەکان، تێکچوونی باری سیاسی لە دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دووهەمدا، بەهەلزانی بۆ هێرش کردنەسەر ویلایەتەکانی ئیسلام. شەڕ لەنێوان موسڵمانەکان و بێزەنتیەکاندا، لەسەردەمی (المتوکل)، پەیوەست بوو بە ململانێی ناوخۆ لەنێوان دەسەڵاتەکانی بێزەنتیەوە (بیالصە)کان بە هۆی ناکۆکیان لەسەر پەرەستنی وێنە پیرۆزەکان. ([1])

بەهۆی ئەو زۆرو ستەمەی کە (بیالصە)کان بینیان لەسەر دەستی ئەو دەسەڵاتە بێزەنتیانەی کە لایەنگری پەرستنی وێنە پیرۆزەکان بوون، پەنایان بردە بەر میری (ملطیة)، عومەری کوڕی عەبدوڵڵا (الاقطع). ([2])، لە سێ شاری سەرەکی لەسەر سنووری ئەرمینیا لە ناوچەی (سیواس)ی شاخاوی جێگیر بوون، وە شاری (تەفریق)یان کرد بە پایتەختی خۆیان و (قربیاس)ی رابەریان تێدا نیشتەجێ بوو. هاوکاری موسڵمانەکانیان کرد لە جەنگاندنی بێزەنتیەکاندا([3]).

لەم قۆناغەدا، هەردوو سەرکردەی ئیسلامی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا(الاقطع) میری (ملطیة) و عەلی کوڕی یەحیا میری (طرسوس)، ئەرکی شەڕیان گرتە سەرشان. جا هاوکاری نێوان هەردوولا ([4])، بووە هۆی کەمبوونەوەی بەگوڕهاتنی بێزەنتیەکان بەرەو خاکەکانی ئیسلام. هاوکات لە بەرەی بێزەنتی ئیمپراتۆر میخائیلی سێهەم و هەردوو

---

[1] ڕێبازی (بیالصە) لە سەرتاسەری ئاسیای بچووک بڵاوبووەوە لە فریجیاوە تا ئەرمینیا. شوێنکەوتووانی ئەم ڕێبازە هاوکار بوون لەگەڵ ئیمپراتۆرە ئانەیقونیەکان، واتە ئەوانەی کە دژی پەرستنی وێنە پیرۆزەکانن لە ڕۆژئاوی قستەنتینی پێنجەم لە سەدەی هەشتی زاینیەوە. بەڵام هەر زوو چەوساندنەوەیان دەستی پێکرد لەو ساوەی کە ڕێبازی لایەنگری ئەیقونیەکان سەرکەوت لە سەردەمی ئیمپراتۆر (ئیوفیل)ی یەکەم و میخائیلی سێهەمی کوڕیدا. بگەڕێوە بۆ. العريني : الدولة البيزنطية، لا ٣٠٠.

[2] ڤازیلییف : العرب والروم، لا ٢٠٣.

[3] Ostrogorsky : op.cit, p ١٩٧

[4] موسڵمانەکان و (بیالصە)کان.

سەرکردە (بارداس) و (بترۆناس) وەکو دوژمنی سەرەکی ناویان دەرکرد کە ئەرکی هێرشکردنە سەر موسڵمانەکانیان گرتە سەرشان.

لەساڵی (٢٤١ك/٨٥٥ز) بێزەنتیەکان هێرشیان کردە سەر (عین زربە) و هەر کەسێکی تێدا بوو بەدیلیان گرت. هەر لەو ساڵەش دیلەکانی هەردوولا، ئاڵو گۆڕ کرا ([1]).

لەساڵی (٢٤٢ك/٨٥٦ز) بێزەنتیەکان پەلاماری ئەو ناوچانەیانە دا کە دەکەوێتە باکووری عێراق. ئەوە بوو هێرشیان کردە سەر (سمیساط) و ئامەد و تەفریق، دە هەزار موسڵمانیان بەدیل گرت و پاشان گەڕانەوە بۆ ناو خاکی بێزەنتی. هێزەکانی ماوپەیمانیش راوی نان([2]).ئیمپراتۆر میخائیلی سێهەم بە زۆر زگاری بوو([3]).

ئەم هێرشە چالاکە بە سەرەتایەك دادەنرێ لەماوەی پێکدادانی بەردەوامی نێوان هەردوولا. ئەوجا میری (ملیطة) و(طرطوس)، وەکو کاردانەوەیەك لەسەر هێرشی بێزەنتیەکان بۆ سەر باکووری عێراق، هێرشیان برد بۆ خاکی بێزەنتی.

هەروەها لەساڵی (٢٤٤ك/٨٥٨ز) خەلیفە (المتوکل) سوپایەکی رەوانە کرد چووەناو خاکی بێزەنتیەوە و توانی چەندین قەڵا رزگار بکات، گرنگترینیان (سمالو) بوو ([4])

بارگرژی سەرسنوور بەردەوام بوو، جارێك ئەمان پەلاماریان دەدا و جارێك ئەوان، موسڵمانەکان بەسەرکردایەتی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا (الاقطع) لەساڵی (٢٤٧ك/٨٦١ز) توانیان لە (توقات) بەخەستی سوپای ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی بشکێنن. ناوچەی سەر سنووری ئەرمنیاك–یان وێران کرد و سامسون–یان گرت، کە گەورەترین بەندەرەکانی کە بادوکیایە لە سەر دەریای ڕەش([5]).

لەئەنجامی ئەم ڕۆچوونە بۆناو ئاسیای بچووکەوە، کە بەسەرەتای ئاماژەیەکی

---

[1] الطبري :ب٩، ل٢٠٢٢.

[2] هەر دوو میری (ملطیة) و (طرسوس) و رابەری (بیالصة)ەکان.

[3] Bury:hist of eastern empire,p.٢٧٩

[4] الطبري ب ٩ ل ٢١٠.

[5] Bury:op.cit.p ٢٨٢

ترسناك دادەنرێ بۆ سەر ئیمپراتۆریەت، ئیمپراتۆر بەرپەرچی دانەوە. لەشکرێکی گەورەی ئامادە کرد بە سەرکردایەتی (بترونـاس) بۆ بەرەنگاربونـەوەی موسڵمانەکان کە لەپەنجا هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو. بەهۆی نابەرامبەری لەنێوان هەردوو هێز، عومەری کوڕی عەبدوڵڵا ئامۆژگاریەکی وەرگرت لەسوپا سالارەکانی کە ناوچەکە بەجێ بهێڵێ و نەکەوێتە شەڕ لەگەڵ دوژمنـدا کەوا ژمارەیان زۆرترە. میری موسڵمان ئەم ئامۆژگاریەی رەت کردەوە و بڕیاری دا بەرەنگاری لەشکری بێزەنتی ببێتەوە.

ئەوە بوو هەردوو سوپا لە (بۆزۆن) کە دەکەوێتە نێوان دەریاچەی تاتا و رووباری هالیس، بەیەك گەیشتن، بتروناس سوپای ئیسلامی لەهەموو لایەکەوە گەمارۆدا، بەپێی پلانێکی سەربازی دارێژراو، عومەر ویستی لەناوەڕاستی لەشکری بێزەنتی رێگایەك بدۆزێتەوە و پێدا بچێ تا ئەم ئابلۆقە سەربازیە بشکێنێ، بەلام نەیتوانی، پاش شەڕکردنێکی ئازایانە کوژرا([1]).

ساڵی دواتر لەشەڕی میافارقین لەسەرووی فورات، عەلی کوڕی یەحیا میری (طرطوس) کوژرا. جا بۆ تۆڵە سەندنەوەی کوشتنی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا، دەرچوو بوو([2]).

کوژرانی ئەم دوو سەرکردەیە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە هەڵگیرساندنی گیانی جیهاد لە دڵی موسڵماناندا. خەڵکی لە بەغداد و سامەڕا هەستان بە راپەرینی میللی و هاوار لە مزگەوت و شەقامەکاندا بەرز بووەوە جیهادی رادەگەیاند. ([3])

سەرەڕای سەرکەوتنی بێزەنتیەکان، ئەوا ناوچە سنوریەکان گۆڕانکاری گەورەی بەسەر نەهات. چونکە موسڵمانەکان چەندین قەلایان گەڕانەوە بۆ ژێر رکێفی خۆیان، پێیان لە کەبادۆکیا رۆژهەلاتی رووباری هالیس، جێگیر کرد([4]).

پاش ئەوە، لێشاوی ئیسلامی راوەستا، بەهۆی لەیەکترازانی دەوڵەتی خیلافەتی

---

[1] فازیلیف:لا ٢٢٢-٢٢٣

[2] الطبري:ب٩، لا ٢٦١.

[3] هەمان سەرچاوە:لا ٢٦٢-٢٦٣.

[4] Bury:op.cit. p ٢٨٥

عەباسی لەئاکامی زاڵبوونی تورکەکان بەسەر دامودەزگاکانیدا و پەیدابوونی دەوڵەت گەلێکی سەربەخۆ. بۆیە نەیتوانی موسڵمانەکان لە ژێر دەسەڵاتێکی ناوەندی یەکگرتوو کۆبکاتەوە، لەلایەنی خۆیەوە، دەوڵەتی بیزەنتی سەردەمێکی نوێی لە هێزو فراوانخوازی دەستپێکرد لە سەردەمی خانەوادەی مەقدۆنی کەوا لەنێوان سالآنی (٢٥٣-٤٤٨ك/٨٦٧-١٠٥٦ز) حوکمی کرد.

ئیمپراتۆر (باسیل)ی یەکەم، رەوشی تێکچووی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی؛ بەهەلزانی و جموجوڵی سەربازیی دەستپێکرد، قەلآی لوئلوئە کە دەکەوێتە رۆژئاوای چیاکانی تۆرۆس، داگیر کرد، رێرەوە شاخاویەکانیشی داگیر کرد، کاری کرد بۆ لەناو بردنی (بیالصه)کان ئەوە بوو لەساڵی (٢٥٨ك/٨٧٢ز) لەنێوان سیواس و (ملطیة) روبەڕویان بووەوە، سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەریاندا بەدەستهێنا و (تەفریق) کە حەشارگەیان بوو خاپوور کردو (خریسۆ خیرۆس)ی رابەریان کوشت ([1]) ئەم سەرکەوتنە هانی بیزەنتیەکانیدا بەردەوام بن لەکشانیان بەرەو رۆژهەلآت. ساڵی دواتر باسیل بەرەو هەرێمی فورات کەوتە رێ و (سمیساط)و(زبطرة) داگیر کرد، بەلآم لەلای (ملطیة) بە خەستی شکا([2]).

هەرچەندە ئەو، بەم سەرکەوتنە، سنوورداره، رازی بوو، بەلآم توانی بەسەر روبەرێکی فراواندا زاڵبێ کە لوئلوئە و هەموو ئەوەی دەکەوتە نێوان قەیسەریە لەباکووری رۆژئاوادا تا مرعش لەباشووری رۆژهەلآتی لەخۆدەگرت. ئەم کارەشیدا بە سەرەتای قۆناغێکی نوێ دادەنرێ لە قۆناغەکانی کشان و پێشکەوتنی رێکخراوی ئیمپراتۆریەتی بیزەتی بۆ سەر سنوورەکانی رۆژهەلآت([3]) جا ئەحمەد کوری تۆلۆن کەوا بەرێوەبردنی ناوچە سنووریەکانی شامی گرتە ئەستۆ، ئەرکی بەرگیری کردن لە ناوچەکانی ئیسلامی گرتە سەرشان و لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ململانێ بوو بە

---

[1] Ostroeorsky:op.cit.p ٢١١

[2] I bid

[3] Ostrogorsky:p٢١١ رمضان : سەر چاوەیەکی پێشوو، لا

مەترسی بۆ بێزەنتیەکان کەوا لە ساڵی (٢٦٥ك/٨٧٨ن) جەنگیان لەگەڵیا راگرت ([1]) بەڵام پێکدادان لە نێوان هەردوولا هەر بەردەوام بوو، بەرپا بوونی ئاژاوە و ناکۆکی لە ناو کۆشکی بێزەنتی بەهۆی کێشەی ژنەکانی ئیمپراتۆر لیو –ی شەشەم، هێشتی ململانێیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا قورس و گرانتر بێ. ([2]) ئەوە بوو لەچواردە ساڵی یەکەمدا لە حوکمی لیو–ی شەشەم، بێزەنتیەکان چەندین جار لەلای دەروازەکانی کیلیکیا و لەرۆژئاوایدا دۆران ئەمەش دەرفەتی بە موسڵمانەکاندا بە درێژایی کەنارەکان رۆبچنە ناو ئاسیای بچووکەوە ([3])، (نقفور فوکاس) ئەو سەرکردەیەی کە ئیمراتۆر بەپەلە بانگی کرد، نەیتوانی هێرشی موسڵمانەکان بوەستێنێ، سەرەڕای ئەو سەرکەوتنانەی کە لەساڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ن) لە (ئەدنە) بەدەستی هێنا([4]).

هەردوو لایان بەردەوام هەر دەرفەتێکیان بۆ برەخسایە سودیان لێ وەرئەگرت بۆ هێرشکردنە سەر خاکی ئەوەیتر. ئەوە بوو سەرقاڵبوونی خیلافەت بەجەنگاندنی زەنجەکان و (قرمطي)یەکان، دەرفەتی بە بێزەنتیەکان دا لەساڵی (٢٩١ك/٩٠٤ن) هێرش بکەنەسەر ناوچە سنوریەکان، شارە سنوریەکانی شام–یان وێران کرد، ئەوجا موسڵمانەکان روبەڕویان بوونەوە و (ئینتاکیە)یان رزگار کردو لەساڵی (٢٩٤ك/٩٠٧ن) گەیشتنە (قونیە) و خاپوریان کرد. بۆیە ئیمپراتۆر ناچار بوو داوای ئاشتبوونەوەی بکات، دیلەکانی لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئاڵو گۆڕ کرد. ([5])

لەساڵی (٣٠٣ك/٩١٥ن) بێزەنتیەکان، شۆڕشی ئەلحوسەینی کوڕی حەمدان دژی بنەماڵەی بوەیهی–یان، بەهەلزانی بۆ پەلاماردانی ناوچە سنوریەکانی جەزیرە. ئەوە بوو هێرشیان کردەسەر قەڵای مەنسور و دانیشتوانەکەیان بە دیل گرت، لە (طرسوس) موسڵمانەکانیان شکاند و مرعش–یان کاول کرد([6]).

---

[1] الطبري : ب٩ ل٥٤٥.

[2] Cambmed Hist:Iv p١٤٠

[3] Ibid

[4] الطبري : ب ١٠ل٧٥،٧٦.

[5] ابن الاثير: ب٦ ل١١١، ١٠٩.

[6] هەمان سەرچاوە: ل١٥٢.

سالّی دواتر موسڵمانەکان کاردانەوەیان هەبوو. بەسەرکردایەتی مونسی خزمەتکار هێرشیان کردەسەر (ملطية) و چەندین قەڵایان رزگار کرد، بێزەنتیەکان ناچار بوون لەساڵی (٣٠٥ك/٩١٧ن) داوای جەنگراگرتن بکەن([1]).

بێزەنتیەکان، بە لاواز بوونی خیلافەت لەسەردەمی (المقتدر)دا و دەستەوسانیان لەکۆمەکی کردنی ناوچەکانی سەرسنور بە جەنگاوەر و کەرەستەی جەنگ، ئاگادار بوون، بۆیە ئیمپراتۆر (قسطنطين)ی حەوتەم زاتی کرد و داوای لە دانیشتوانی ناوچەکانی سەر سنور کرد (سەرانە) رادەستی خۆی بکەن و هەڕەشەی لێکردن ئەگەر نەیدەن ([2]). سەرئەنجام بێزەنتیەکان لە ساڵی (٣١٤ك/٩٢٦ن) چوونە ناو (ملطية) پاش ئەوەی خەڵکەکەی بۆ بەغداد هەڵهاتن و هانایان بەردەبەر خیلافەت([3]).

دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی لەسەردەمی میری میرەکاندا (٣٢٤-٣٣٤ك/٩٣٦-٩٤٦ن) حاڵی زۆر باش نەبوو. جا ئەو کاتە دەوڵەتی بێزەنتی لەترسی بولغاری رزگاری بوو، بۆیە کەوتە جێبەجێکردنی پلانێکی هێرش ئامێز بۆ رۆژهەڵات. سەرکردەی ناوبانگ (یۆحەنا کۆرکواس) ئەرکی جێبەجێکردنی ئەم کارەی گرت ئەستۆ. زیاتر پێکدادانەکان لە ئەرمینیا و بەرزاییەکانی جەزیرە، روویدا([4]).

لەراستیدا ئەوەی لەپایتەختی خیلافەت روویدا لە کێشە و ئاژاوە، سەرەڕای هەڕەشە کردنی (قرمطي)یەکان لە عێراق، لایەنێکی گەورەی لە هێزە ئیسلامیەکان شەل کرد و نەیهێشت هیچ کارێکی جەنگی ئەنجام بدات.

رەنگە یەکەم سەرکەوتن کە یۆحەنا کۆرکواس بەدەستی هێنابێت، بریتییە لەدەستگرتنی بەسەر (ملطية) کەوا بەردەوام ئامانجێك بوو بۆ هێرشەکانی بێزەنتی، بەهۆی شوێنە ستراتیجیەکەی. بەڵام کۆرکواس هاوتایەکی بۆ پەیدا بوو، ئەوەش (سیف الدولە) ی حەمدانی بوو کەوا سەرکردایەتی کردنی جیهادی ئیسلامی دژی

---

[1] ابن الاثير: ب٦ ل١١١، ١٠٩.

[2] مسكوية : تجارب الامم، ب ١٤٦ل١.

[3] ابن الاثير: ب٦ ل١٨٥، ١٨٢.

[4] Ostrogorsky :p ٢٤٤

بێزەنتیەکانی گرتە ئەستۆ.

لەساڵی (٣٢٧ك/٩٣٩ن) توانی لە هەرێمی بەرزاییەکانی جەزیرە لەنێوان قەڵای زیاد و قەڵای سەلام سەرکەوتنێکی بەرچاو بەسەر سەرکردەی بێزەنتیدا بە دەستبێنێ ([1]) پاشان هێرشی کردەسەر ئەرمینیا و ژمارەیەك لە ئەرمەنەکانی ناچار کرد دان بە دەسەڵاتەکەی بنێن. لە ئەرمینیای بێزەنتی دەرکەوت، لەساڵی (٣٢٩ك/٩٤١ن) ناوچەکانی دەوروبەری (کۆلۆنیا)ی کاولکرد.

ئامانجی (سیف الدولە) ئەوە بوو نەهێڵی دەوڵەتی بێزەنتی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ بەسەر ئەرمینیادا، ئەو ناوچانەی لێی بگەڕێنێتەوە کە لەموسڵمانەکان لەهەرێمی جەزیرە زەوتی کرد ([2])، بەڵام ئەو ململانێ ناوخۆییەی کە لەپایتەختی خیلافەتدا روویدا و بووە هۆی پێکدادان لە نێوان حەمدانیەکان و ئەخشیدیەکاندا، نەیهێشت (سیف الدولە) بەردەوام بێ لە هەڵمەتەکانی. کورکواس-یش ئەم بارودۆخەی بە هەلزانی و شەڕکردنی دەستپێکردەوە. ئەوە بوو لەساڵی (٣٣٠ك/٩٤٢ن) هێرشی کردە سەر حەلەب، ساڵی دواتریش دەستی گرتەسەر میافارقین و ئامەد و دارا و نسیبین و چووەناو ئەرزەن-ەوە، گەمارۆی (ڕەها)ی دا و (رأس العین)یشی سوتاند لەساڵی (٣٣٢ك/٩٤٤ن) ([3]).

بە ماندوو بوون و هەوڵ و تەقەلای ناوبراو خاکی بێزەنتی بەرفراوانتر بووەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، بێزەنتیە سام و پلەوپایەی پەیدا کرد لە ئاسیای بچووك، ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئەو هێرشە بەرفراوانەی کە دواتر ئیمپراتۆر نقفور فۆکاس و یۆحەنا زمسکیس دەیکەن. کاتێك دوژمنایەتی نێوان حەمدانیەکان و ئەخشیدیەکان کۆتایی هات، (سیف الدولە) دەستی بەتاڵ بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی بێزەنتیەکان و جەنگاندنیان.

---

[1] Canard,m: Histoirede la Dynastiede Hamdanides de Jazira et de zyrie Ip ٧٤٣

[2] العريني: ٤٠٥٧.

[3] الانطاكي، يحيى بن سعيد : تاريخ الانطاكي، ٤٤٧، ٤١.

## سەردەمی عەباسی سێهەم

## سەردەمی دەسەڵاتی بوەیهی فارسی ٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٦-١٠٥٥ز

**خەلیفەکانی سەردەمی عەباسی سێهەم و ماوەی خیلافەتی هەر یەك لەوان:**

| | |
|---|---|
| ئەبو لقاسم عەبدوڵڵا (المستكفي) | ٣٣٣-٣٣٤ك/٩٤٤-٩٤٦ز |
| ئەبو لقاسم (الفضل المطيع) | ٣٣٤-٣٦٣ك/٩٤٦-٩٧٤ز |
| ئەبو بەکر عەبدو لکەریم (الطائع) | ٣٦٣-٣٨١ك/٩٧٤-٩٩١ز |
| ئەبو لعەباس ئەحمد (القادر) | ٣٨١-٤٢٢ك/٩٩١-١٠٣١ز |
| ئەبو جەعفەر عەبدوڵڵا (القائم) | ٤٢٢-٤٦٧ك/١٠٣١-١٠٧٥ز |

**ناوی میرەکانی ئال بوەیهی و ماوەی میرنشینی هەر یەك لەوان: [1]**

**أ - لە فارس**

| | |
|---|---|
| ١- (عماد الدولە) ئەبو لحەسەن عەلی کوڕی بوەیهی | ٣٢٠-٣٣٨ك/٩٣٢-٩٤٦ز |
| ٢- (عچد الدولە) ئەبو شوجاع خەسرەو | ٣٣٨-٣٧٢ك/٩٤٦-٩٨٢ز |
| ٣- (شرف الدولە) ئەبو لفەوارس شێرزاد | ٣٧٢-٣٧٩ك/٩٨٢-٩٨٩ز |
| ٤- (صمصام الدولە) ئەبو کالیجار مزربان | ٣٧٩-٣٨٨ك/٩٨٩-٩٩٨ز |
| ٥- (بها ء الدولە) ئەبو نەسر | ٣٨٨-٤٠٣ك/٩٩٨-١٠١٢ز |
| ٦- (سلطان الدولە) ئەبو شوجاع | ٤٠٣-٤١٥ك/١٠١٢-١٠٢١ز |
| ٧- (عضد الدولە) ئەبو کالیجار مزربان | ٤١٥-٤٤٠ك/١٠٢٤-١٠٤٨ز |
| ٨- (الملك الرحيم) ئەبو نەسر خەسرەو فەیرۆز | ٤٤٠-٤٤٧ك/١٠٤٨-١٠٥٥ز |

---

[1] تەماشای کتێبی (تاريخ إيران بعد الاسلام) بکە هی (عباس إقبال) ل٩٣-٩٥.

ب ـ له عێراق و ئه‌هواز و کرمان

١ـ (معز الدوله) ئه‌بو لحوسه‌ین ئه‌حمه‌د ٣٢٠ـ٣٥٦ك/٩٣٢ـ٩٦٧ز

٢ـ (عز الدوله) به‌ختیار ٣٥٦ـ٣٦٧ك/٩٦٧ـ٩٧٧ز

٣ـ (عضد الدولة) ئه‌بو شوجاع خه‌سره‌و ٣٦٧ـ٣٧٦ك/٩٧٧ـ٩٨٢ز

٤ـ (شرف الدوله) ئه‌بو لفه‌وارس شیرزاد ٣٧٢ـ٣٧٩ك/٩٨٢ـ٩٨٩ز

٥ـ (بها ء الدوله) ئه‌بو نه‌سر ٣٧٩ـ٤٠٣ك/٩٨٩ـ١٠١٢ز

٦ـ (سلطان الدولة) ئه‌بو شوجاع ٤٠٣ـ٤١٢ك/١٠١٢ـ١٠٢١ز

٧ـ (مشرف الدوله) ئه‌بو عه‌لی ٤١٢ـ٤١٦ك/١٠٢١ـ١٠٢٥ز

٨ـ ئه‌بو تاهیر (جلال الدوله) ٤١٦ـ٤٣٥ك/١٠٢٥ـ١٠٤٣ز

٩ـ ئه‌بو کالیجار مزربان ٤٣٥ـ٤٤٠ك/١٠٤٣ـ١٠٤٨ز

١٠ـ (الملك الرحيم) ئه‌بو نه‌سر خه‌سره‌و فه‌یرۆز ٤٤٠ـ٤٤٧ك/١٠٤٨ـ١٠٥٥ز (١)

ج ـ له ڕه‌ی و ئه‌سفه‌هان و هه‌مه‌دان

١ـ (ركن الدوله) ئه‌بو عه‌لی حه‌سه‌ن ٣٢٠ـ٣٦٦ك/٩٣٢ـ٩٧٦ز

٢ـ (مؤيد الدوله) ئه‌بو مه‌نسور ٣٦٦ـ٣٧٣ك/٩٧٦ـ٩٨٣ز

٣ـ (فچل الدوله) ئه‌بو لحه‌سه‌ن عه‌لی ٣٦٦ـ٣٨٧ك/٩٨٣ـ٩٩٧ز

٤ـ (شمس الدوله) ئه‌بو تاهیر (ته‌نها له هه‌مه‌دان) ٣٨٧ـ٤١٢ك/٩٩٧ـ١٠٢١ز

٥ـ (مجد الدوله) ئه‌بو تاڵیب روسته‌م (ته‌نها له ڕه‌ی) ٣٨٧ـ٤٢٠ك/٩٩٧ـ١٠٢٩ز

٦ـ (سما ء الدوله) ئه‌بو لحه‌سه‌ن (ته‌نها له هه‌مه‌دان) ٤١٢ـ٤١٤ك/١٠٢١ـ١٠٢٣ز

**بەندی دەیەم**

## خیلافەتی عەباسی و بوەیهیەکان

### دامەزراندنی دەوڵەتی بوەیهی

سەردەمی عەباسی سێهەم کاردانەوەیەکی توندو تیژی بەخۆوە بینی دژی دەسەلات تورکی کەوا لەسەردەمی عەباسی دووهەمدا بەسەر دامودەزگاکانی خیلافەتی عەباسیدا زاڵبوو بوو. ئەم کاردانەوەش لەلایەن بزوتنەوەیەکی فارسی شیعی زەیدی بوو ([1]) بۆ ئەوەی بایەخی خۆی، کەوا لە سەدەی سێهەمی کۆچیدا کەم بووەوە، بگەڕێنێتەوە. ئەم سەردەمە لە دیاردەکانیدا جیاوازە لە سەردەمی عەباسی دووهەمدا لە رووی تیشك خستنەسەر رۆژهەلات.

بنەماڵەی بوەیهی لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچیدا لەسەر شانۆی رووداوەکاندا دەرکەوتن([2])گەلێ دەوڵەتی سەربەخۆیان لە فارس و ئەهواز و کرمان و رەی و ئەسفەهان و هەمەدان دامەزراند. دەسەلاتی خۆیان سەپاندە سەر عێراق و لەگەڵ خیلافەتی عەباسیدا بەشدار بوون لە بەڕێوەبردنی.

دەسەلاتی ئەم خانەوادەیە ئەوەندە بەهێزەو بوو تەنانەت سەردەمێك لە سەردەمەکانی خیلافەتی عەباسی بە ناویان ناونرا.

ئەم خانەوادەیە لە باکوورە و لەولاتی دەیلەم -ناوچەیەکە نزیکی دەریای قەزوین- کۆچیان کردووە، لەسەر دەستی برا گەورەی ئەو سێ برا بوەیهیە ناویان دەرکردەوە، عەلی کوڕی شوجاعی کوڕی بوەیهی، کەوا (مرداویجی زیاری) ([3]) ولاتی کەرەجی ([4])

---

[1] جێی ئاماژەیە کە بوەیهیەکان بە رەچەڵەك فارس نین، بەڵکو ئەو دەیلەمی یانەن کەوا لە باشووری دەریای قەزوین نیشتەجێن. دەشێ تێکەڵەیەك بن لە ئێرانی و تورك وچەند گەلێکی تر. ناوچەکەیان پێکهاتووە لە بەشە شاخاویەکانی جیلان کە لەلای باشوورەوە ویلایەتی قەزوین سنووریەتی و لەلای رۆژهەڵاتەوە ناوچەی جالوس

[2] دەربارە هەڵومەرجی دەرکەوتنی خانەوادەی بوەیهی، بطەڕێوە بۆ : مسكوية : ب ١لا، ٢٧٥-٢٧٩.

[3] دامەزرێنەری دەوڵەتی زیاری سەر بەخۆ لە (طبرستان) لە ساڵی ٣١٦ك.

[4] کەرەج: شارێکیە لە نێوان هەمەدان و ئەسفەهان لە ناوەڕاستی رێگادا. یاقوت : ب ٤، ٤٤٦لا. بگەڕێوە بۆ مسكويە : ب١ ٢٧٧.

پێ سپارد.

وادیاره عەلی خەیاڵی جیابوونەوه و فراوانخوازی لەسەر حیسابی دراوسێکانی کرد بوو، سەرەڕای ئاواتە سیاسیەکانی کە زوو بۆی هاتەدی، چونکە زۆری پێنەچوو لەم دەڤەرە پشتی قایم بوو و بە سیاسەتی باشی، خەڵکی کردە لایەنگری خۆی، بەهۆی توانایی سەربازی و کارگێڕی و بەخشندەیی و جوان مامەڵە کردنی لەگەڵ شوێنکەوتووانیدا، توانی سوپایەکی بە هێز پێکبهێنێ کە بە ماوەیەکی کورت زۆربەی وڵاتی فارسی پێگرت. شاری شیرازی کرد بە مەڵبەندێك بۆ حوکمڕانی ([1]). عەلی بە رووکەش ئەم وڵاتانەی بە ناوی خەلیفەی عەباسیەوه دەگرت، بەڵام ئەو بەنیاز بوو دەوڵەتێکی تایبەت بۆ خۆی دامەزرێنێ، چونکە خیلافەت لەرووی سیاسی و سەربازیەوە لاواز بوو و نەیدەتوانی دەست لەم ناوچانە وەردا بۆ کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی ([2]) جا ئەویش ئەمەی بەهەلزانی. پاشان ناردی بۆ خەلیفە (الراضي) داوای لێکرد دان بە دەسەڵاتەکەی بنێ ([3]) ئەمەش شتێکی ئاساییە، چونکە پێویست بوو لەلایەنی خیلافەتەوە دڵنیا بێ لەبەر ئەوەی ئەو یەکێك لە ویلایەتەکانی بە زۆرداری زەوت کردوە، بۆیە ویستی حوکمڕانیەکەی شەرعیەت وەرگرێ. ئەمەش هاتەدی([4]).

پاشان کاریکرد بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی مرداویج، ئەوە بوو پێشنیازی کرد بچێتە ژێر فەرمانی و ئەو وڵاتانەی کە بەدەستەوەیەتی سەربە ئەو بێ و تێدا وتار بۆ ئەو بخوێنرێ. بێگومان مرداویج-یش بەم پێشنیازە خۆشحاڵ بوو، وە (ئەرەجان)ی پێ سپارد، عەلی-ش هەستا بە ناردنی حەسەنی برای بۆ لای وەکو بارمتەیەك ([5]) بۆ ئەوەی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی بۆ مسۆگەر بکات.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان عەلی و خیلافەتی عەباسی لەم ماوەیەدا، ئەوە کورت بووەوە سەر ئەو دانپێنانەی کە خەلیفە ناردی بۆی، بەڵام خیلافەت ویستی

---

[1] ابن الاثير ب ٢٣٤، ٢٣٥.٦.

[2] إقبال:لا٤٠٧.

[3] ابن الاثير ب ٦، لا٢٣٥.

[4] ابن الاثير: ب ٦، لا ٢٣٥.

[5] هەمان سەرچاوە :لا ٢٣٩

سامی خۆی بگەڕێنێتەوە، ئەوە بوو سوپایەکی ڕەوانە کرد گەیشتە نزیکی فارس، بەڵام لە ساڵی (٣٢٣ك/٩٣٥ز) لە شەڕی (ئەرەجان) بەرپەرچ درایەوە([1]) و عەلی-ش پێی لەو ناوچەیە جێگیرکرد و دەوڵەتەکەی دامەزراند، دیارە هەلومەرجی سیاسی لەبەرژەوندی بوەیهیەکاندا بوو، چونکە لەساڵی (٣٢٣ك/٩٣٥ز) مرداویج کوژرا، عەلی-ش سوودی لەم دەرفەتە وەرگرت و زاڵبوو بەسەر وڵاتی شامدا کەوا لەژێر دەسەڵاتی (شمکیری زیاری) بوو برای مرداویج. وە حەسەنی برای، کەوا پاش کوژرانی مرداویج هەڵهات، ڕەوانەی عێراقی عەجەم کرد، ئەوە بوو زاڵبوو بە سەر ئەسفەهان و ورەی و هەمەدان و کەرەج و وڵاتەکانی تری عێراقی عەجەم، وە ئەبو (الفضل)ی کوڕی ئەلعەمید کرد بە وەزیری خۆی ([2]).

پاش ئەوە، عەلی کوڕی بوەیهی چاوی بڕییە مسۆگەرکردنی سنوری ئەو هەرێمانە ی دەستی بەسەرداگرت، سیاسەتەکەی وای دەخوازی پێش ئەوەی بچێتە ناو عێراق، کەوا جێی سەرنجی بوو، دەست بەسەر کرمان و ئەهوازدا بگرێ، چونکە ئەم دوو هەرێمە ڕێڕەوێکی سروشتین بۆ هەر هێرشێکی چاوەڕوان نەکراو لە هەرێمی فارسەوە چ لەلای ڕۆژهەڵاتەوە و چ لەلای باکورەوە.

بوەیهی، ئەحمەدی برای لە سەرووی هێزێکی سەربازیەوە ڕەوانە کرد، لەساڵی (٣٢٤ك/٩٣٦ز) لەپاش شەڕی (القنطرة) کرمانی گرت ([3]) و خستیە پاڵ دەسەڵاتی بنەماڵەی بوەیهی، پاشان ئەهوازیشی خستە ژێر ڕکیفی خۆی([4]).

لەبەرامبەر ئەم گۆڕانکاریە سیاسی و سەربازیەدا خیلافەتی عەباسی دەستەوسان نەوەستا. بۆیە ململانێی بوەیهی - زیاریی، بەهەلزانی و ویستی ئەهواز بگەڕێنێتەوە، ئەوە بوو بە سەرکردایەتی (بجکم) هێزێکی ڕەوانە کرد بۆ هێنانەوەی و دەرکردنی بوەیهیەکان لەناوی. ناوبراو لەلای سنووری ئەهواز کە نزیکی عێراقە ڕاوەستا چاوەڕێی

---

[1] ئەم سوپایە بە سەرکردایەتی یاقوت بوو.

[2] ابن خلکان: ب٢، ل١١٨.

[3] ابن الاثیر: ب ٦ل٢٥٥-٢٥٦.

[4] هەمان سەرچاوە: ل٢٦٣-٢٦٤.

هـەڵێکی دەکـرد بـچێتەناو. بـەڵام سـەرکردەی عەباسـی لـە ژێـر فـشاری رووداوە سـەربازیەکان پـاش ئـەوەی بوەیهیـەکان سـەرکەوتن، ناچـار بـوو پاشەکـشێ بکـات. لەئەنجامی ئەمەش ئەهواز کەوتە دەسـتی بنەماڵـەی بوەیـە-وە، کەواخـستیانە پـاڵ مولکەکانی تریان[1].

لـەئاکامی ئـەم گۆڕانکاریانـە، بنەماڵـەی بـویهی بـەپێی ئاواتـە فراوانخوازیـەکانیان بەهێزەوە بوون، هاتنەخوارەوەیان لە ئەهوازەوە بۆ ناو عێـراق بـووە کـارێکی ئاسـان، کەوتنە چاودێری کردنی رووداوەکان لە پایتەختی خیلافەتدا بـۆ ئـەوەی دەرفـەتێکیان بۆ برەخسێ و بچنەناوی[2].

رەوشی عێراق شڵەژا بوو، ئەوەش بە هۆی ناکۆکی نێوان کوڕی رائق والی بەسـرە و میری میرەکان لەلایەکەوە، نێوان ئەبو عەبدوڵڵا لبەریدی والی پێشووی ئـەهواز کـە لـە ترسی هێزەکانی خیلافەتەوە هەڵهاتووە لە لایەکی دیکەوە، ئەوە بوو پـەنای بردەبـەر عەلی کوڕی بوەیهی و تەماحی پێکرد بچێتەناو عێراقەوە. لەلایەکی دیکەوە، خیلافـەت کەوتبووەوە ژێر دەسەلاتی تورکەکان، نەیدەتوانی رەوشـی عێـراق سـەقامگیر بکـات. خـەڵکیش هەسـتی بـەم بۆشـاییە سیاسـیە و شکـستخواردنی مـیری میرەکـان کـرد. هـەروەها دارایـی گـشتی دەوڵـەت تێکـچوو و گەنجینـەکانی خیلافـەت بـەتاڵ بـوو، خەلیفەکانیش بە هۆی زاڵبوونی تورکـەکان و چاوچـنۆکیانەوە کەوتنـە تەنگەشـەیەکی داراییەوە.

جا خەڵکیش بە ئاوات بوو ئەم هێزە تازەیە کە لـە نزیکیانـەوە سـەری هەڵـداوە و لێهاتوویی خـۆی سـەلماند، لـەم پاشـاگەردانیە رزگاریـان بکـات، هـەروەها هەندێ لـە سەرکردە دوورخراوەکاندا بە تـەما بـوون ئـەم هێـزە بوەیهیـە گەشـەکردوە بێبەشیان نەکات لەوەی کە پێشتر بێبەش بـوون لێـی. سـەرئەنجام خەلیفـە (المتقـي) ئـارەزووی کرد داوا یارمەتی لە بوەیهیەکان بکات بۆ ئەوەی سنووری بۆ ململانێی ناوخۆی نێـوان میرەکان دانێ، بەتایبەتی پاش ئەوەی پەیوەندی نێوان خۆی و تۆزان تێکـچوو. ئـەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] محمود و الشريف : ل ٥١٢.

بـوو خەلیفـە، ئەحمـەدی کـوڕی بـوەیهی بانگهێـشت کـرد و داوای لێکـرد بێتـە نـاو بەغدادەوە، هەروەها هەندێ سەرکردەی تریش بۆ هەمان مەبەست رێککەوتن لەگەڵیا.

لەسـاڵی(٣٣٢ك/٩٤٤ز) بـەرەو بەغـداد کەوتـەڕێ و لەسـاڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) پـاش دەرچوونی تورکەکان لەناوی، چووە ناویەوە، خەلیفە (المستکفی) بە گەرمی پێشوازی لێکـرد و دیـاری پێـشکەش کـرد و وەکـو مـیری میرەکـان دایمەزرانـد، نازنـاوی (معـز الدولە)ی پێ بەخشی و نازناوی (عماد الدولە)ی لـە عـەلی بـرای نـا، هـەروەها نازنـاوی (رکـن الدولـە)ی لـە حەسـەنی بـرای نـا([1]). لـە پاشـان ئـەم نازنـاوە مەزنانـە بـووە ناولێنانێکی ئاسایی بۆ میرە بوەیهیەکان.

ئابەم شێوەیە بوەیهیەکان گەلێ میرنشینی (وراپی)یان لە فارس و عێراق و ئـەهواز و کرمـان و ڕەی و هەمـەدان و ئەسـفەهاندا دامەزرانـد کـە تـا سـاڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) مایـەوە.، جـا ئـەم سیـستەمە (وراپـی)یـە بـووە هـۆی دەسـتەبەرکردنی جۆرێـك لـە سەقامگیری سیاسی لە دەوڵەتی عەباسیدا، کە لـەکاتی خۆیـدا بوەیهیـەکان کاروبـاری دەوڵەتیان کۆنترۆڵ کرد بوو و بەشێوەیەکی ڕەهـا هەڵسوکەوتیان دەکـرد. بـەڵام ئـەم سـەقامگیریە هەنـدی جـار پەشـێویی و ئـاژاوە تێکـەڵی دەبـوو لـە ئـەنجامی ململانێـی مەزهەبی بە هۆی شیعەتگەری خانەوادەی بوەیهی.

## پەیوەندی خیلافەتی عەباسی بە بوەیهیەکان

وا چاوەڕاونکراو بوو، بوەیهیەکان بەسەپاندنی دەسەڵاتیان سـەقامگیری و یـەکێتی بۆ هەرێمەکانی خیلافەت بگەڕێننەوە، جۆش و خرۆشی سەربازەکانیان کـپ بکەنـەوە، دەرفەت بدەنە خیلافەت ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆیان دەستپێبکەن و نەهێڵن ئاژاوەی مەزهەبی بەرپا بێ. بەڵام ئەمانە نەهاتنەدی، چونکە ئـەوان بـەگیانێکی دژ بـە خەلیفـە عەباسیەکان کەوا مەزهەبیان جیاواز بوو لەوان، چوونە نـاو بەغـدادەوە. (معـز الدولـە) پـاش ئـەوەی کـە چـووەناو بەغـدادەوە و بارەگاخەکـەی کـۆنترۆڵ کـرد، بـیری وابـوو

---

[1] ابن الاثیر: ب٦، ل٢٩٢٧، ٢٢٩٥، ٢٦٣، ٢١٤، ٢٩٦.

خیلافەتی عەباسی هەڵوەشێنێتەوە و خیلافەتی شیعی لە باتی دامەزرێنێ و یەکێك لە رابەرەکانی شیعەی زەیدی دانێ لەسەری ([1]) و دەیتوانی ئەو کارە بکات. بەڵام پاش راوێژکردن بە هاوەڵەکانی وازی لەو بیرۆکەیە هێنا، چونکە گۆڕانکاریەکی ئاوەها جیهانی ئیسلامی تووشی لەرینەوەیەکی توند دەکات سەرەڕای تێکدانی حوکمی بوەیهی. ئەوجا شیعەی عێراق کەوا (معز الدولە) هەوڵیدا بۆ لای خۆی رایان بکێشێ، لەسەر مەزهەبی ئیمامی بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دامەزراندی خەلیفەی زەیدی بەراورد بەخەلیفە عەباسی وەکو یەکن لە دیدەیاندا. لە بەر ئەوەش (معز الدولە) بە بۆچوونی سیاسی زیرەکانەی خۆی پێی باش خیلافەتی عەباسی بهێڵێتەوە، بە پێی ئەو بنەمایەکی زەیدی کە دەڵێت: ((ئیمامەتی باش رەوایە لەگەڵ بوونی باشتر)). لەسەر ئەم بنەمایەش کە رێبازی زەیدی دایناوە و لەسەر بنەمای بەرژەوەندی سیاسی رێی دا وەلاتی خۆی بۆ خەلیفەیەکی سونی بنوێنێ([2]) بەڵام سیاسەتێکی پەیڕەو کرد هەوڵیدا دەسەڵاتەکەی سنووردار بکات لە بەرامبەر بەهێز کردنی دەسەڵاتی خۆی.

سەردەمی بوەیهی لەرووی ماوەی حوکمکردنی خەلیفەکاندا تارادەیەك سەقامگیریەکی سیاسی بەخۆوە بینی. چونکە خەلیفەکانی، ساڵانێکی زۆر حوکمیان دەکرد پێش ئەوەی لەسەرکار لابرێن. بۆ نموونە، خەلیفە (المطیع) بۆ ماوەی ٢٩ساڵ حوکمی کرد (٣٣٤ـــ٣٦٣ك/٩٤٦ـــ٩٧٤ن)، (الطائع)یش ١٨ساڵ (٣٦٣ـ٣٨١ك/٩٧٤ـ٩٩١ن)، (ئەلقادر) یش ٤١ساڵ (٣٨١ـ٤٢٢ك/٩٩١ـ١٠٣١ن). رەنگە ئەمە هۆکارەکەی ئەوە بێت، پۆستی میری میرەکان -کەوا بوەیهیەکان گرتبوویانە دەست- هەموو شتێکی بەدەستەوە بوو، لەسایەیدا بەرەما هەڵسوکەوتیان دەکرد لەعێراق بەرامبەر بە بەردەوام کەمکردنەوەی دەسەڵاتی خەلیفە کەوا جگە لە هێمایەك هیچی تر نەبوو کەسێك رکابەری لەسەر بکات، کاری ئەو تەنها شەرعیەتدان بوو بە

---

[1] (معز الدولە) راوێژی بە هاوەڵەکانی کرد ■ دامەزراندنی ئەبو لحەسەن موحەممەدی کوڕی یەحیای زەیدی.

[2] ابن الاثیر: ب٦، ل٢١٥، بگەڕێوە پەراوێزی ژمارە٢ل٢١٥،٢١٦.

کارەکانی ئەوان.

مێژوونووسان زۆریان باس لەوە دەکەن کە بنەماڵەی بوەیهی، خەلیفە عەباسیەکانیان سووك و رسوا کردوە و دەسەڵاتیان لێ سەندون، هەندێ جار، خۆیان رانەگرتووە لە دەستدرێژی کردنە سەریان، لە سەردەمیاندا خیلافەت سامی خۆی لە دەستداوە و لاواز بۆتەوە، خەلیفە بۆتە گاڵتەی دەستیان و جگە لەهێمایەکی ئاینی هیچیتر نەبووە، بەشی لە دەسەڵاتدا تەنها ناوی بوو، دەسەڵاتی راستەقینە لە دەوڵەتدا بە دەستی میری بوەیهی بوو ([1]).

لەراستیدا بنەماڵەی بوەیهی هۆکاری راستەوخۆی لاواز بوونی خیلافەتی عەباسی و لە دەستدانی سامی، نەبوون، ئەوان ئەم لاوازیەیانە لە سەردەمی پێش خۆیان بۆ مابووەوە، کە خەلیفە لەمیانەیدا هەموو تایبەتمەندیەکانی وەکو سەرچاوەی یەکەم بۆ دەسەڵات لە دەوڵەتدا، لەدەستدا([2]).

ئیتر، دەتوانین بڵێین کە بنەماڵەی بوەیهی کە پۆستی میری میرەکانیان گرتە دەست، هیچ لە دەسەڵات و بەرپرسیاریێتی ئەو کەسەیانە نەگۆری کە ئەم پۆستە دەگرێتە دەست، لەوانەیە کردنی پۆستی میری میرەکان بە (ورایی) لە بنەماڵەکەیاندا تاکە گۆرانکاریەك بێ کە کردبێتیان، بەڵکو مامەڵە کردنیان لەگەڵ خەلیفەکاندا وەکو ئەوانەی پیشی خۆیان بوو.

رەنگە بارودۆخی خیلافەت لە سەردەمیاندا، باشتر بوبێت لەوەی لەسەردەمی دەسەڵاتی تورکی، ئەوەش بە هۆی سەقامگیر بوونی دەسەڵات بۆ بنەماڵەی بوەیهی، ئەمەش خەلیفەکانی لەو کێشانە دوورخستەوە کە پێشتر لەئەنجامی ململانێی سەرکردە و میری میرەکاندا تووشی دەبوون و کەوا هۆکارێکی راستەوخۆ بوو بۆ زوو لەسەر کار لابردنیان و دەستدرێژی کردنە سەریان. بەڵکو میرە بوەیهیەکان سوور

---

[1] محمود و الشریف:٧ ٥٢٤.

[2] البیرونی : الاثار الباقیة عن القرون الخالیة، ١٣٢٧. ابن الاثیر: ب ٦، ٧ ٣١٥. حسن ابراهیم حسن : تاریخ الاسلام... سەرچاوەیەکی پێشوو ب٣ ٧ ٤١.

Arhold : The caliphate: p ٦٨

بوون لەسەر ئەوەی لە بەرامبەر خەڵکدا گوێڕایەڵی و لایەنگری خۆیان بۆ پلەو پایەی خەلیفە عەباسیەکان بنوێنن، بەهۆی ئەو دەسەڵاتە ئاینیەی کە لەنێوان موسڵماناندا هەیان بوو کەوا ئەو سەرۆکی باڵای کۆمەڵگەی ئیسلامییە ([1]).

جا کاتێك ململانێ لەسەر دەسەڵات کۆتایی هات و پۆستی میری میرەکان بوویە (وراپی) لە بنەماڵەی بەویهدا، هیچ هۆکارێك نەما بۆ تەنگهەڵچنین بە خەلیفە ([2]).

لەلایەنی خۆیەوە، خەلیفە بەڕێوەبردنی دەوڵەتی بە شێوەیەکی فەرمی بە میری بوەیهی راسپارد، ئەمەش شەرعیەتی بە کاروبار و رەفتارەکانیان بەخشی.

ئەوەی راستی بێ میرە بوەیهیەکان دەستیان وەرنەدا لەهەڵبژاردنی خەلیفە و لابردنی لەپۆستی خیلافەت جگە لە دووجار نەبێ([3]). یەکەمجاریان لەساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ن) بوو واتە راستەوخۆ پاش چوونە ناویان بۆ شاری بەغداد. ئەوە بوو (معز الدولە) ی بوەیهی خەلیفە (المستكفي)ی دەستگیری کرد و لەخیلافەت لایبرد و بەیعەتی بە (المطيع) دا ([4])، زیاتر میری بوەیهی بەهۆی دوو هۆکارەوە، سیاسی و ئاینی، ئەم رێگەیەی لەگەڵ خەلیفەدا گرتەبەر ([5]).

سەبارەت بە هۆکاری سیاسی، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەلیفە (المستكفي) نامەی بۆ (ناصر الدولە) ی حەمدانی دەنارد لەکاتی ململانێ سەربازیەکەیدا لەگەڵ (معز الدولە) لە موسڵ، تێدا ئاگاداری دەکردەوە بە نهێنی و جموجوڵی سەربازیی سوپای بوەیهی ([6]).

سەبارەت بە هۆکاری ئاین، ئەوا خەلیفە هەستا بەدەستگیرکردنی سەرۆکی شیعەکان کەوا فەتوادان لە بەغداد لە ئەستۆیدا بوو، زەبوونی کرد لە بەردەم (معز الدولە). ئەمیش دڵگرانبوو چونکە شیعە بوو. بۆیە ا(لمستكفي) کەوا بێ رێزیی

---

[1] العبادي : ١٦٣ل

[2] الزهراني: ل٢٤.

[3] الزهراني :ل٢٤.

[4] المسعودي: ب٤ ل٢٧٦.

[5] الزهراني :ل٢٤

[6] المسعودي: ب ٤ل٢٧٦.

بەرامبەر مەزهەبەکەی نواند، لەسەر کار لابرد([1]).

سەبارەت بە دووهەم جاری دەستێوەردانی بوەیهیەکان لەلابردنی خەلیفەی عەباسی، ئەو لەساڵی (٣٨١ك/٩٩١ز) بوو، کاتێك ( بها الدوله) خەلیفە (الطائع) ی لابرد و (القادر)ی لەسەر تەختی خیلافەت دانا([2]).

(السیوطي)یش هۆی ئەم کارە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە خەلیفە (ئەبو لحەسەنی کوڕی ئەلموعلیم)ی دەستگیر کردوە و زیندانی کردوە، ناو براویش یەکێکە لە کەسە نزیکەکان لە(بها الدوله)، ئەم کارەش (بها الدوله) ی هەراسان کرد و بەلایەوە ناخۆش بوو، بۆیە خەلیفەی دەستگیر کرد ولایبرد و سەروەت و سامانی و هەرچی لەناو کۆشکی خیلافەتدا بوو زەوتی کرد([3]).

بەڵام زیاتر کێشەی دارایی لە پێشی ئەم رووداوە بووە. چەنکە (بها الدوله) کەوتە تەنگەشەیەکی داراییەوە و سەربازەکان هەڵچوون لێی، (ئەبو لحەسەنی کوڕی ئەلموعەلم)یش بیرۆکەی دەستگیرکردنی خەلیفە و زەوتکردنی سامانەکانی بۆ رازاندەوە([4]).

سەبارەت بە خەرجیاتی خەلیفە، ئەوا میری میران بۆ ئەو خەرجیانە داشکانێکیان دانا کە ناو دەنرێ بە (چیاع المستخلصه – داشکانی پوخت) ([5]) سەبارەت بە بنەماڵەی بوەیهی، ئەوا مووچەیەکیان بۆ خەلیفە (المستکفی) تایبەتکرد کە بریتی بوو لە بڕی پێنج هەزار درهەم ([6])، بەڵام وادیارە ئەو وای بینی کە ئەمە ناگونجێ، چونکە پارەکە لەوانەیە دوابکەوێ، بۆیە لەپاش رزگار کردنی بەسرە لەساڵی (٣٣٦ك/٩٤٧ز) (چیاع مستخلصه)ی خستە سەری وەکو بەخشیشێك لەسەر موچەکەی ([7]) بەڵام

---

[1] مسکویة : ب٢ ل٨٦. ابن الاثیر: ب ٦ل٣١٥.

[2] ابن عمراني : الابنا ' في تاریخ الخلفا ' : ل١٤٨.

[3] السیوطي : ل١٧٢. کوڕی ئەلموعلیم فەقێی ئیمامی بوو.

[4] ابن الاثیر: ب٧ ل١٤٧. بڕاوردي بکە لەطەل (الانطاکي)دا کە واباسي دەکات طوایە(بهاء الدولة) خەلیفة (الطائع)ي بە بێ تاوان لەسەر کار لابردوە.ل٢٢١.

[5] الصولي: ل١٣١،١٤٥.

[6] ابن الاثیر: ب٦، ل٣١٤.

[7] ابن الاثیر: ب٦، ل٣١٤.

بەردەوام سەروەت و سامانی خەلیفە ئەگەری زەوتکردنی هەبوو.

میرە بوەیهیەکان هەندێ ئاکاریان هەبوو کە نیشانەی بەهێزی و جیاوازیان بوو لە میر و سەرکردەکانی پێش خۆیان، لەوانەش:

– نەریت وابوو خەلیفە کە میرێکی دامزارندبایە، دەبوو ئەو میرە بهاتایە بۆ کۆشکی خەلیفە، ئەمیش بازنە و ملوانکەی دەکردە ملی و شمشێرێکی دەکرد بە قەدیا و ئالایەکی لە زیو گیراوی رادەست دەکرد و پەیمانێکی بۆ دەنووسی بەو میرنشینە یاخود ئەو ویلایەتەی کە وەری دەگرت([1]). بەلام لەسەردەمی بوەیهیەکاندا لەسالی (٣٦٧ک/٩٧٧ز) ئەم نەریتە گۆڕانکاری بەسەردا هات، ئەوە بوو میر (عضد الدولە) لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرباز و پیاوماقوڵ و دادپرس و کەسی پلەداردا هات بۆ کۆشکی خیلافەت، خەلیفە (الطائع) یش کۆمەڵێ دیاری سوڵتانی پێشکەش کرد، دوو ئالاشی رادەست کرد یەکێکیان لە زیو گیراو بوو لەسەرمایەی میرەکان، ئەوەی دیکەش لە زێڕ گیراو بوو لەسەرمایەی جێنشینەکان. نازناوی (تاج الملە)ی لێنا سەرەڕای نازناوی (عضدالدولة). ئەوجا پەیمانێکی بۆ نووسی کە بەئامادەبوونی خۆی، خوێنرایەوە ([2]) جا پێشتر نەریتی وا نەبوو، بەڵکو پەیماننامەکان لەبەردەمی خەلیفەکاندا رادەستی والیەکان دەکرا، کە هەر کەسێك لەوان وەری بگرتایە پێی دەوت، ((ئەمە پەیمانی منە بۆ تۆ، جا کاری پێ بکە)) ([3]). ئەم نەریتە، واتە سپاردنی دوو ئالاکە و خوێندنەوەی پەیماننامەی میرنشینێتی لەبەردەم خەلیفە، بوو بە مافێك لە مافەکانی میرە بوەیهیەکان کەوا لەپاش (عضدالدولة) یەك لە دوای یەك دەسەلاتیان گرتە دەست.

– بوەیهیەکان ئاکارێکی تریان هەبوو، ئەوەش لێدانی دەهۆڵ بوو لە بەردەم ماڵەکانیان وەکو ئاگادار کردنەوەیەك بۆ هاتنی کاتی نوێژ، جا ئەم نەریتە گرنگترین دیاردەی سەروەری عەباسی بوو، واتە لێدانی دەهۆڵ پێنج جار لەکاتی نوێژەکاندا لە بەردەم ماڵی خەلیفە. کەسیش ئەم تایبەتمەندییەی نەبوو، تەنانەت

---

[1] الزهراني :٢٦ل.

[2] ابن الجوزي : المنتظم: ب٧ ل٨٧. السيوطي: ل٤٠٧.

[3] ابن الجوزي: هەمان سەرچاوە.

جێنشینەکانیش([1]).

میرە بوەیهیەکان هەر لەسەردەمی (معزالدولە)وە هەوڵیاندا ئەم نەریتەیانە هەبێ بەڵام سەرنەکەوتن. تاوەکو (عچد الدولە) لە ساڵی (٣٢٧ك/٩٧٧ز) کاروباری عێراقی گرتە دەست و داوای لە خەلیفە (الطائع) کرد مافی دەهۆڵ لێدان لە بەردەم ماڵی پێ بدا، ئەویش ڕێیدا ڕۆژانە سێ جار لێی بدرێ لە کاتەکانی بەیانی و ئێوارە و شێواندا ([2]) وادیارە ئەو ناکۆکیەی کە لە نێوان ئەم دوو پیاوە پەیدا بوو لەکاتی ململانێی نێوان بنەماڵەی بوەیهی و تورکەکاندا، پاڵنەرێك بوو بۆ ئەوەی خەلیفە ئەم تایبەتمەندیەی پێ بدا، بەمەبەستی باشکردنی پەیوەندیی لەگەڵیا ([3]).

دواتر ئەم تایبەتمەندیە بووبە مافێك لە مافەکانی میرە بوەیهیەکان. هەموو ڕۆژێك سێ جار لە بەردەم ماڵیاندا دەهۆڵی لێ دەدرا. تا ئەو کاتەی کە (سلطان الدولە) لە ساڵی (٤٠٣ك/١٠١٢ز) دەسەڵاتی گرتە دەست، فەرمانیدا ڕۆژانە پێنج جار لە بەردەم ماڵیدا دەهۆڵی لێبدرێ بە بێ ئەوەی مۆڵەت لە خەلیفە وەرگرێ([4]).

(جلال الدولە)ش لە ساڵی(٤١٨ك/١٠٢٧ز) وەك ئەوی کرد، هەرچەندە خەلیفە سەرەتا ناڕەزایی خۆی دەربڕی لەسەر ئەم کارە، بەڵام دوایی لە ژێر فشار ناچار بوو ڕازی بێ([5]).

– سەبارەت بە وتار و دراو، ئەوا نەریت وابوو لەسەر هەموو دوانگەکان لە ویلایەتەکاندا وتار بۆ خەلیفە و میری میرەکان بخوێنرێ، جگە لە بەغداد کەوا تەنها بۆ خەلیفە وتاری تیا دەخوێنرا، بەڵام لەپاش ساڵی (٣٦٨ك/٩٧٨ز) خەلیفە (الطائع) فەرمانیدا لەسەر دوانگەکانی بەغداد لەپاش خەلیفە وتار بۆ (عضدالدولە)ش بخوێنرێ ([6]). سەبارەت بە نوسینی ناوی میری میرەکانی بوەیهی لەسەر دراو، ئەوا دابونەریتێك

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو : ٩٢لا و ب٨، لا٣٠.

[2] ابن الاثیر: ب٧، لا٩٠،٩١.

[3] الزهرانی :لا٢٤.

[4] ابن الجوزي: ب ٨، لا٣٠.

[5] هەمان سەرچاوە.

[6] هەمان سەرچاوە.

بوو هەر لەمێژەوە مابووەوە([1]).

– بوەیهیەکان ئاکارێکی تریان هەبوو، نازناو لێنان. ئەوەی راستیش بێ ناو لێنانی ئەمانە بە (ملك شاه) و نازناوی تر دەگەڕێتەوە بۆ توانای سەربازیان و هەستی نەتەوەیی فارسیان ئەوەش بە زیندوو کردنەوەی کەلتووری دێرینی فارس([2]).

ئەوە بوو لە ساڵی (٣٥١ك/٩٦٢ز) خەلیفە (المطیع) نازناوی (عضدالدولة)ی لە میر (شوجاع فەناخەسرەو)، نا ([3])، لەساڵی (٣٥٥ك/٩٦٦ز) نازناوی (موید الدولە) نرا لە ئەحمەدی کوڕی بوەیهی([4])، نازناوی (عز الدولە) لە میر بەختیار نرا([5])، لە ساڵی (٣٦٤ك/٩٧٥ز) نازناوی (فجر الدولە) لە ئەبو لحەسەن عەلی کوڕی (رکن الدولە) نرا([6]).

وادیارە خەلیفە بەخۆی نازناوی بۆ میری بوەیهی هەڵدەبژارد، پێویست بوو لەسەر ئەمیش پەسەندی بکات و ناڕەزایی دەرنەبڕێ([7]). بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، چونکە لەساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) ەوە میری بوەیهی بە ئارەزووی خۆی نازناوی بۆ خۆی هەڵدەبژارد و پاشان رەزامەندی خەلیفە لەسەری بەدەست ئەهێنا.

ئەوە بوو (عچدالدولە) کاتێك لەساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) هات بۆ بەغداد، داوای لە خەلیفە کرد نازناوی (تاج الملە)ی بۆ زیاد بکات، خەلیفەش رازی بوو و نازناوەکەی پێ بەخشی ([8]).کاتێك پشتیان قایم بوو، بوەیهیەکان زیادەڕەویان کرد لە مەزنکردنی خۆیان لەمیانەی نازناوەکان. ئەوە بوو (عضدالدولة) نازناوی (ملك الملوك)ی لەخۆی نا واتە (شاه نشاه)، خەلیفە ناڕازی بوو لەسەر ئەوە، ئەبو کالیجار نازناوی (ملك الامە)ی

---

[1] محمود و الشریف.

[2] الزهراني: ل٢٢٧.

[3] مسکویه:ب٢، ١٩٢. ابن الاثیر:ب٧ ل ٥.

[4] هەمان سەرچاوە:ل ٢٢١.

[5] ابن الاثیر:ب٧، ل ٢١-٢٢.

[6] ابن الاثیر:ب٧، ل ٦٥ پەراوێزی ژمارە١.

[7] الزهراني:ل ٢٨.

[8] ابن الجوزي: ب٧، ل ٩٨.

لەخۆی نا ([1]) واتە (شای گەل). لەساڵی (٤٢٩ك/١٠٣٨ز) (جلال الدولە) نازناوی (شاهنشاه الاعظم)ی بۆ خۆی زیادکرد ئەوەش بە رەزامەندی خەلیفە و وتاریشی بەوە بۆ خوێندەوە لەسەر دوانگەکاندا. خەڵکیش نکۆڵیان لێکرد و خشتی سووریان لە وتار بێژەکاندا گرت، بەهۆی ئەوەوە ئاژاوە و ئاشووبێکی گەورە بەرپا بوو([2]).

لەساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٨ز) میر خەسرەو فەیرۆز نازناوی (الملك الرحیم)ی لەخۆی نا. جا سەرەتا خەلیفە رازی نەبوو ئەم نازناوەی پێبدا، پاشان ناچار کرا رازی بێ([3]).

**کۆتایی بوەیهیەکان**

بارودۆخی بوەیهیەکان لەپاش مردنی ( بها الدولە) لەساڵی (٤٠٣ك/١٠١٢ز) شڵەژا، رەنگە هۆی ئەوەش بگەڕێتەوە بۆ:

– ململانێی کوڕەکانی. چونکە ناوماڵی بوەیهی بنچینەیەکی جێگیری نەبوو بۆ فەرمانڕەوایەتی. بۆیە تاکەکانی تاکۆکی کەوتە نێوانیاندا و یەکگرتوویی خۆیان نەپاراست و بەشێك لەپۆست و چالاکیان لەدەستدا. ئەوە بوو هەر یەك لە کوڕەکانی ( بها الدولە) دەستی گرت بەسەر ناوچەیەك ی (سلطان الدولە) لە شیراز جێگیر بوو، پۆستی میری میرەکانی لە بەغداد سپارد بە (مشرف الدولە) ی برای، هەروەها (جلال الدولە) ی برای کرد بە فەرمانڕەوای ناوچەی بەسرە، ئەبو لفەوارس لە کرمان([4]). جا هەریەك لەمان بە تەما بوو بە ناوچەکەی ژێر دەسەڵاتی، جیابێتەوە و تەماحی دەکرد ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی براکەیدایە زەوتی بکات، تاوەکو دووبەرەکی کەوتە ناو خانەوادەکەیاندا.

– بوەیهیەکان لەسەردەمی (معز الدولە) پشتیان بە تورکەکان بەست. زۆرینەیانی کرد بەسەربازی خۆیان، هەندێکیشیان گەیشتە پۆستی سەرۆکایەتی. هەرچەندە دەسەڵات لەدەستی بوەیهیەکانە مایەوە، بەڵام سەربازە تورکەکان بەردەوام بەهێزتر

---

[1] هەمان سەر چاوە : ل ١١٣-١١٤.

[2] ابن کثیر : ب١٢، ل٤٣٧. ئەو باسی وتەی فەقێ و دادپرسەکانی کردوە دەربارەی ئەم نازناوە

[3] ابن الاثیر:ب٨ل٤٨٧.

[4] لبن الاثیر:ب٧، ل٢٦٨.

دەبوون لەژێر دەسەڵاتی دواکەوتووی بوەیهی لەپاش (عضدالدولە)، بوون بە هێزێکی گاڵتەپێنەکراو، جا تورکەکان لەناو سوپادا (یەکەی سوارچاکیان) پێك ئەهێنا و بوەیهیەکانیش (پیادە).

شتێکی ئاسایی بوو کە لەسایەی ئەم باروذۆخەدا رکابەری لەنێوان هەردوولا پەیدا بێ، ئەمەش کێشەی زۆری بۆ بوەیهیەکان دروست کرد، چونکە زۆرجار بووە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕش و بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ، جا سەربازە تورکەکانیش درێغیان نەدەکرد لە تاڵانکردن تەنانەت پایتەختیش هەندێ جار، هەروەها تاڵانکردنی کۆشکی میرەکانیشیان، داوای زیادکردنی مووچەیان دەکرد و قەرەبووی زیاتر.

لەبەر ئەوەی توانایان نەبوو ئەم گرفتانە چارەسەر بکە و پێداویستی سەربازەکانیان دابین بکەن، بوەیهیەکان سیاسەتێکی نوێیان گرتەبەر کە بریتی بوو لە دەرکەوتنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی، ئەوەش سیستەمی بەخشین. ئەوە بوو، لە بەرامبەر خزمەتەکانیان، گوندیان پێ ئەبەخشین. جا ئەم بەخشینەش "کاتی" بوو، واتە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەبەر مسۆگەرکردنی ژیانی سەربازەکان، ئەمەش وای لە سەربازەکان کرد بایەخی پێ نەدەن چونکە دەیانزانی کە پاش ماوەیەکی کورت گوندەکانیان لێ دەسێننەوە، لەئەنجامدا گوندەکان کاولی رووی تێکرد و لە رووی ئابوورییەوە تێکچوو بە شێوەیەك، گەنجینەی بوەیهی پێی کاریگەر بوو سەرەڕای گەنجینەی گشتی خیلافەت.

– بوەیهیەکان خۆیان لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکەیان گیردا. هاوکات ئەوەی کە لەناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی رووی دەدا پشتگوێ خست و بەشداریان تیا نەکرد، ئەمەش دەرفەتیدا میرنشینی دیکە دابمەزرێ، ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ. وەکو (عەقیلی)یەکان لە باکووری عێراق و هەندێ لە ناوچەکانی جەزیرە، (نەمیری)یەکان لە حەران و رەها و رقە، (مەروانی)یەکان لە دیاربەکر و میافارقین و هیتریش. ئەمەش بووە هۆی پێکدادان لە نێوان بوەیهیەکان و نێوان ئەم هێزە پەیدا بووانە.

– لەسەر ئاستی دەرەکی، ئەوا بوەیهیەکان بایەخیان بە گەشەکردنی هێزی بێزەنتی لە سەردەمی خانەوادەی مەقدۆنیدا نەدا، هەروەها بە تەمای وڵاتی شام

نەبوون، کەوا هەندێ جار ململانێیەکی توندی بە خۆوە دەبینی لە نێوان تۆلۆنیەکان و ئەخشیدیەکاندا لەلایەکەوە، لە نێوان خیلافەتی عەباسی و دەوڵەتی حەمدانی لەلایەکی دیکەوە.

– سەبارەت بە رۆژهەڵات، ئەوا بەشداریان نەکرد لەگەڵ سامانی و غەزنەویەکاندا لە بەرگریکردن لە ناوچە سنووریەکان لەگەڵ هند و تورکە بتپەرستەکان. زیاتر ناکۆکیە ناوخۆیەکانی ناو خانەوادەکەیان نەیهێشت گرنگی بە کاروباری دەرەکی بدەن یان سووربن لەسەر ئەوەی رۆڵێکی کاریگەریان هەبێ لە جیهانی ئیسلامیدا.

دەوڵەتی بوەیهی لە عێراق و فارسدا لەژێر چەپۆکی سەلجوقیەکان روخا، (الملك الرحيم) لەساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)، دیل کرا، کاتێک (طغرلبك)ی سەلجوقی چووە ناو بەغدادەوە.

## سەردەمی عەباسی چوارەم

## سەردەمی دەسەڵاتی سەلجوقی تورکی٤٤٧ـ٦٥٦ك/١٠٥٥ـ١٢٥٨ز

**خیفەکانی سەردەمی عەباسی چوارەم و ماوەی خیلافەتی هەر یەك لەوان:**

| | |
|---|---|
| ئەبو جەعفەر عەبدوڵلا (القائم) | ٤٢٢ـ٤٦٧ك/١٠٣١ـ١٠٧٥ز |
| ئەبو لقاسم محمد (المقتدی) | ٤٦٧ـ٤٨٧ك/١٠٧٥ـ١٠٩٤ز |
| ئەبو لعەباس ئەحمەد (المستظهر) | ٤٨٧ـ٥١٢ك/١٠٩٤ـ١١١٨ز |
| ئەبو مەنسور (الفضل المسترشد) | ٥١٢ـ٥٢٩ك/١١١٨ـ١١٣٥ز |
| ئەبو جەعفەری مەنسور (الراشد) | ٥٢٩ـ٥٣٠ك/١١٣٥ـ١١٣٦ز |
| ئەبو عەبدوڵلا موحەمەد (المقتفی) | ٥٣٠ـ٥٥٥ك/١١٣٦ـ١١٦٠ز |
| ئەبو (المظفر) یوسف (المستنجد) | ٥٥٥ـ٥٦٦ك/١١٦٠ـ١١٧٠ز |
| ئەبوموحەممەد ئەلحەسەن (المستضئ) | ٥٦٦ـ٥٧٥ك/١١٧٠ـ١١٨٠ز |
| ئەبو لعەباس ئەحمەد (الناصر) | ٥٧٥ـ٦٢٢ك/١١٨٠ـ١٢٢٥ز |
| ئەبو (نصر)موحەمەد (الظاهر) | ٦٢٢ـ٦٢٣ك/١٢٢٥ـ١٢٢٦ز |
| ئەبو جەعفەری مەنسور (المستنصر) | ٦٢٣ـ٦٤٠ك/١٢٢٦ـ١٢٤٢ز |
| ئەبو ئەحمەد عەبدوڵلا (المستعصم) | ٦٤٠ـ٦٥٦ك/١٢٤٢ـ١٢٥٨ز |

## سەردەمی تورکە سەلجوقیەکان

### سەلجوقیە مەزنەکان لە خۆراسان و ئێران

١ـ ركن الدوله أبوطالب طغرليك ٤٢٩ـ٤٥٥ك/١٠٣٧ـ١٠٦٣ز

٢ـ (عضد الدوله) ئەبو شوجاع ئەلئەب ئەرسەلان ٤٥٥ـ٤٦٥ك/١٠٦٣ـ١٠٧٢ز

٣ـ (معز الدوله) ئەبو لفەتح مولکشاهی یەکەم ٤٦٥ـ٤٨٥ك/١٠٧٢ـ١٠٩٢ز

٤ـ (ناصر الدين) مەحمود ٤٨٥ـ٤٨٧ك/١٠٩٢ـ١٠٩٤ز

٥ـ (ركن الدوله) ئەبو (المضفر) بركيارق ٤٨٧ـ٤٩٨ك/١٠٩٤ـ١١٠٤ز

٦ـ (جلال الدوله) مولکشاهی دووهەم ٤٩٨ك / ١١٠٤ز

٧ـ (غياث الدين) ئەبو شوجاع موحەمەد ٤٩٨ـ٥١١ك/١١٠٤ـ١١١٧ز

٨ـ (معزالدوله) ئەبو (الحارث) سنجەر ٥١١ـ٥٥٢ك/١١١٧ـ١١٥٧ز

### سەلجوقیەکانی عێراق

١ـ (مغيث الدين) مەحمود ٥١١–٥٢٥ك/١١١٧–١١٣١ز

٢ـ (غياث الدين) داوود ٥٢٥–٥٢٦ك/١١٣١–١١٣٢ز

٣ـ ( ركن الدين) ئەبو تالَيب (طغرل)ی دووهەم ٥٢٦–٥٢٩ك/١١٣٢–١١٣٥ز

٤ـ (غياث الدين) ئەبو لفەتح مەسعود ٥٢٩–٥٤٧ك/١١٣٥–١١٥٢ز

٥ـ (معز الدين) ئەبو لفەتح مولکشاهی دووهەم ٥٤٧ك/١١٥٢ز

٦ـ (غياث الدين) ئەبو شوجاع موحەمەدی دووهەم ٥٤٨–٥٥٤ك/١١٣٥–١١٥٩ز

٧ـ (غياث الدين) ئەبو شوجاع سولەیمان شاه ٥٥٤–٥٥٦ك/١١٥٩–١١٦١ز

٨ـ (ركن الدين) ئەبو (المضفر) ئەرسەلآن شاه ٥٥٦–٥٧١ك/١١٦١–١١٧٥ز

٩ـ (ركن الدين) ئەبو تالَيب (طغرل)ی سێهەم ٥٧١–٥٩٠ك/١١٧٥–١١٩٤ز

## بەندی یانزەهەمین

# کۆتایی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

## خیلافەتی عەباسی و تورکە سەلجوقیەکان

### دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی

بە دامەزراندنی دەوڵەتی تورکە سەلجوقیەکان، سەردەمێکی نوێی گرنگ لە مێژووی خیلافەت و ئیسلامدا سەری هەڵدا. جا کاتێك لە سەرەتای سەدەی یانزەهەمینی زاینی لە رۆژهەڵاتدا دەرکەوتن، خەلیفە هیچ دەسەڵاتێکی راستەقینەی نەبوو و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی پارچە پارچە بوو بوو.

ئەوە بوو ئەمەویەکان لەئەندەلوس جێگیر بووبوون، هەروەها عوبەیدیەکانیش لە میسرو باکووری ئەفریقیا، بەغدادیش هیچ رێگە چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی هەموو ئەمانە لە ناو بەرێ.

سەبارەت بە باکووری سوریا و جەزیرەی فورات، ئەوا بینیمان چۆن کەوتنە دەستی گەلێ رابەری شۆرشگێری عەرەب کە هەندێکیان توانیان دەوڵەتێکی بەهێز دامەزرێنن. ئەوجا فارس و ناوچەکانی دوای رووبار ئەوا بنەماڵەی بوەیهی دابەشیان کرد یاخود چەند فەرمانرەوایەك گرتیانە دەست کەهەر یەکێکیان چاوەرێی دەرفەتێك بوو رکابەرەکەی لە ناوبەرێ، تاوەکو پەشێوی سیاسی و سەربازی سەرتاسەری وڵاتی گرتەو. وتاری مەزهەب گەری سونەو شیعە زیادی کرد بە شێوەیەك ئەوەی تەماشای دەوڵەتی ئیسلامیی بکردایە، دەیوت دوا دواییەتی.

ئەمە بوو حاڵی خیلافەتی ئیسلامی کاتێك میرنشین سەلجوقی لە سەر شانۆی سیاسی دەرکەوت.

سەلجوقیەکان سەربە هۆزی (قنق)ی غەزی تورکین، دەگەرێنەوە بۆ باپیرەیەك ئەویش سەلجوقی کوری (دەقاق)ە ([1]). ماڵەکانیان لەبیابانە بەرفراوان و پێ

---

[1] الحسینی، صدرالدین بن علی :اخبار الدوله السلجوقیه ل۲۷-۳.المستوفی:تاریخ کزیده :ل ٤٢٤ خواند امیر:حبیب

دەشتەکاندا بووە کە لە چینەوە تاوەکو ڕۆخەکانی دەریای خەزر درێژ بۆتەوە ([1]) مەزهەبی سونیان لەخۆ گرت، بە جۆش و خرۆشەوە پشتگیریان کرد. لەساڵی (٣٧٥ک/٩٨٥ن)لە نیشتمانە ڕەسەنەکەی خۆیانەوە بۆ وڵاتی دوای ڕووبار و خۆراسان کۆچیان کرد، ئەوەش بەهۆی باری ئابووری خراپەوە لەم ناوچە بیابانیەدا یاخود بەهۆی ئەو شەڕانەی کە لەنێو هۆزە جیاجیاکاندا ڕووی دەدا، ئەوە بوو ڕوبەڕوی غەزنەویەکان بوونەوە کەوا ناوچەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو، دەریان کردن.

لەساڵی (٤٣١ک/١٠٤٠ن) سوڵتانی سەلجوقی (طغرلبك) پاش سەرکەوتنی بە سەر سوڵتان مەسعودی غەزنەوی لە شەڕی داندانقان([2])، دەوڵەتێکی لە خۆراسان دامەزراند. خەلیفەی عەباسیش (القائم) ساڵی دواتر وەکو سوڵتانێك دانی پێنا([3]).

سەلجوقیەکان بەردەوامبوون لە سیاسەتی فراوانخوازیان لە فارسدا لەچوارچێوەی دانپێنانی خیلافەتی عەباسی، بە مەبەستی لەناوبردنی هێزی بوەیهیەکان و ڕێخۆشکردن بۆ فراوانکردنی دەسەلاتیان لەعێراق. ئەوەبوو لەساڵی (٤٣٢ک/١٠٤١ن) دەستیان گرتەسەر (ڕەی) ([4])ساڵی دواتر چوونە ناو جرجان و (طبرستان)ەوە ([5])، لەساڵی (٤٤٢ک/١٠٥٠ن) سوڵتان (طغرلبك) ئەسفەهانی داگیر کرد و کردی بە پایتەختی خۆی([6])، پاشان دوای چوار ساڵ هەرێمی ئازەربێنجان-یشی هێنایە ژێر ڕکێفی خۆی ([7]).

ئابەم شێوەیە دەوڵەتی سەلجوقیە مەزنەکان لە خۆراسان و فارس-دا، دامەزرا، لەشکرەکەیان لە ئامادەکاریەکی تەواودا بوو بۆ چوونە ناو عێراق ەوە.

---

السير ب ٢لا٤٧٩.

[1] فامبری لرمینیوس: تاریخ بخاری :لا ١٢٧.

[ ] داندانقان دەکەوێتە نێوان سەرخەس و مرو.

[2] الراوندي ابو بكر محمد بن علي: :راحة الحدود و اية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية:لا ١٦٨-١٦٩.

[4] الحسيني: لا١٠.

[5] ابن الاثير: ب٨ لا٣٠.

[6] هەمان سەرچاوە.

[7] ابن العبري: ابوالفرج جمال الدين : تاريخ الزمان، لا٩٠.

## ڕەوشی ناو بەغداد پێش کشانی سەلجوقیەکان بەرەو ڕۆژئاوا

ڕەوشی ناو بەغداد، ئەو کاتەدا، شلۆق و نائارام بوو، بەمەش ڕێگە خۆش بوو لە بەردەم سەلجوقیەکان، چوونە ناوی، بەوەش عێراقیان خستەپاڵ دەوڵەتەکەی خۆیان کە لە خۆراسان و ئێران دایان مەزراند. ئەمەش بەهۆی ناکۆکی ناو خانەوادەی بوەیهی. کەوا ململانێ و ڕکابەری لەنێوان میرە بوەیهیەکاندا پەیدا بوو لەلایەکەوە، لە نێوان خۆیان و سەربازەکاندا لەلایەکی دیکەوە، هەروەها ئاژاوە و ئاشوب لە ناو سەربازەکاندا بڵاو بووەوە([1])

لەساڵی (٤٢٤ک/١٠٣٣ز) بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕکابەری لەنێوان (جلال الدولە)ی بوەیهی و نێوان ئەبو کالیجاری برازای پەیدا بوو، وتار بۆ ئەم خوێنرایەوە لە بەغداد([2]).شارەکە بووە گۆڕەپانێک بۆ ئاژاوە گێڕی و ململانێی مەزهەبی و خانەوادەیی. کاتێك لەساڵی (٤٣٥ک/١٠٤٤ز) (جلال الدولە) مرد، (الملك العزيز)ی کوڕی نەیتوانی ماوەیەکی زۆر دەسەڵات بپارێزێ، ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆ ئەوەی کالیجار پێی لە دەسەڵاتدا بچەسپێنێ، لە ساڵی (٤٣٦ک/١٠٤٥ز) لە بەغداد جێگیر بێ. ([3])

لەئاکامی ڕکابەری ناو خانەوادەکەیاندا و بەهۆی شۆڕشی بەردەوامی سەربازەکان، نائارامی کەوتە ناو بەغدادەوە. خەلیفەی عەباسیش هەستی بەم پەرتەوازەیی و پاشاگەردانیەی کرد، بینی کە دەوڵەتی بوەیهی توانای نیە ڕەوشەکە لە عێراق سەقامگیر بکات.

## چوونە ناوەوەی سەلجوقیەکان بۆ بەغداد

کاتێك سەلجوقیە مەزنەکان نزیکی عێراق بوونەوە، ئەبو (الحارث) ئەرسەلانی بساسیری، کە یەکێکە لە سەرکردە تورکە شیعەکانی بنەماڵەی بوەیهی، بەغداد و دەوروبەری کۆنترۆڵ کرد بوو و دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو بەشێوەیەك لەسەر

---

[1] سرور، محمد جمال الدين: سياسة الفاطميين الخارجية، ل١٧٩.

[2] ابن الاثير: ب ٨، ل٥.

[3] ابن الاثير: ب ٨، ل٥.

دوانگەکانی عێراق و ئەهواز وتاری بۆ دەخوێنرا.

وەوای لێهات هەر یەك لە خەلیفەی عەباسی و شای بوەیهی نەیاندەتوانی بەبێ ڕەزامەندی ئەوهیچ بڕیارێك بدەن کە پەیوەندی بە کاروباری دەوڵەتەوە هەبێت. جا ئەم سەرکردەیە مەترسیەکی ڕاستەقینە بوو لەسەرخیلافەتی عەباسی و دەوڵەتی بوەیهی.

سەبارەت بە مەترسی لەسەر خیلافەتی عەباسی، ئەوا لەساڵی (٤٤٦ك/ز١٠٥٤) روونبوەوە، کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوان خۆی و خەلیفە ئەلقائم، کەوای لێکرد روو لە (فاطمي)یەکان بکات و داوای یارمەتیان لێبکات. ([1])

سەبارەت بە مەترسی لەسەر دەوڵەتی بوەیهی، ئەوا لەو ناکۆکیە روون بووەوە کە لەنێوان خۆی (الملك الرحيم)ی بوەیهی روویدا، ئەمەش هەرەشەی لەدەسەڵاتی بوەیهیەکان دەکرد لە عێراق پاش لەناوچوونی لەنێران لەسەر دەستی سەلجوقیەکان.

لەم کەشە نالەبارەدا، هەر لایەنێك و بۆ بەرژەوەندی خۆی هەوڵی دەدا. سەبارەت بە خەلیفە کەوا متمانەی نەمابوو بە دەوروبەرەکەی، وای بینی پەیوەندی کردن بە هێزی سەرکەوتوو لە بەرژەوەندی ئەودایە، بەتایبەتی ئەم هێزە سونی مەزهەبەو ڕێز لە خیلافەت دەگرێ و وەلائی هەیە بۆی. ئەوە بوو داوای یارمەتی لە سوڵتانی سەلجوقی (طغرلبك) کرد، دژی بساسیری ([2]).

سوڵتانیش ئەمەی بەهەلزانی و بە سوپاکەی بەرەو بەغداد کەوتەڕێ، لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) چووە ناوی. خەلیفەش وەکو سوڵتانێك لەسەر هەموو ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەستی بوو دانی پێنا، فەرمانیدا لە وتار ناوی بهێنرێ ([3]).

ئا بەم شێوەیە عێراق چووە ناو بازنەی دەسەڵاتی سەلجوقیە مەزنەکان.

---

[1] ابن الاثير: ب ٨/٣٢٨.

[2] الحسيني : ١٨/٧.

[3] ابن الاثير: ب ٨/٧١٦.

## پەیوەندی نێوان خیلافەتی عەباسی و سوڵتانی سەلجوقی

(طغرلبك) سیانزە مانگ لە بەغداد نیشتەجێ بوو، لەم ماوەیەدا کاریان کرد بۆ پاڵپشتی کردنی دەسەڵاتی سەلجوقی لە پایتەختی خیلافەت و پتەوکردنی پەیوەندی سەلجوقیەکان بە خەلیفەوە. هەروەها خیلافەتیش لەلایەنی خۆیەوە کاری کرد بۆ بەهێز کردنی رایەڵەکانی لەگەڵ ئەم هێزە تازەیە. ئەوە بوو خەلیفە ئەلقائم، (ئەرسەلان خاتوون خەدیجە)ی کرد بەهاوسەری خۆی، کچی داوود جغری بەگ، برای (طغرلبك)، لەساڵی (٤٤٨ك/١٠٥١ز) ([1])، بەمەش، نزیکبوونەوەیەك لەنێوان ماڵی عەباسی و سەلجوقی دروست بوو، دەسەڵاتی سەلجوقیەکان لەعێراق سەقامگیر بوو ([2]).لە ناوەڕاستی ئەم سەرکەوتنانەی کە (طغرلبك) بە دەستی هێنا، بساسیری، لە بارەگا تازەکەی (ئەلرەحبە) هەستا بە چەند کودەتایەکی سەربازی و سیاسی بەمەبەستی دەرکردنی سەلجوقیەکان لە بەغداد.

لەسەرئاستی سەربازی، سەرکەوت لە داگیر کردنی موسڵ، پاش ئەوەی سەلجوقیەکانی شکاند لە نزیکی شەنگال لەساڵی (٤٤٨ك/١٠٥٦ز)، کەوتە خۆسازکردن بۆ چوونە ناوەوەی بەغداد ([3]). لە سەر ئاستی سیاسی، چونی بۆ ڕێزی (فاطمي)یەکان ڕاگەیاند، وتاری بۆ خەلیفەی (فاطمي) خوێند کەوا دیاریی بۆ نارد، ئەمەش بووە هۆی پەشێویەکی مەزهەبی توند ([4]).

لەم کاتەدا، (طغرلبك) بەدەستی چەندین ئاستەنگی ناوخۆییەوە دەیناڵاند، کە ناچاری کرد لەساڵی (٤٤٩ك/١٠٥٧ز) لە بەغداد دەرچێ و بەرەو موسڵ بکەوێتە ڕێ تا سنورێك بۆ ئەو کێشانە دانێ کە بساسیری دژی وورووژاند بووی، ئەوە بوو دیاریەکری خستەژێر رکێفی خۆی ([5])، پاشان گەڕایەوە بۆ بەغداد، خەلیفەش بە خۆشحاڵیەوە

---

[1] البنداري، الفتح بن علي بن محمد : اختصار تاريخ دولة آل سلجوق. للامام عماد الدين محمد الاصفهاني : لا ١٣.

[2] محمود و الشريف : سەرچاوە یەکی پێشوو لا ٥٦٢.

[3] ابن الاثير: ب ٨لا٧٧.

[4] ابن الاثير: ب ٨٣لا٨، ٧٧.

[5] هەمان سەرچاوە: لا٧٧.

پێشوازی لێکرد و نازناوی ((ملك المشرق والمغرب))ی لێنا([1]) واته ((شای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)) ئەم نازناوەش نیشانەی ئەوەیە کە خەلیفە دانی نا بۆ (طغرلبك) بەو وڵاتانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا لەژێر دەسەڵاتیتی، ڕێگەی پێدا ڕۆژئاوا لە(فاطمي) یەکان، بسێنیتەوە([2]).

پاشان ئەوە ڕوویدا کە (طغرلبك) تووشی گرفتێکی تازە بوو، ئەوەش ئیبراهیم (ئەینال)ی برای لە وڵاتی شاخ لێی یاخی بوو. بۆیە ناچار بوو جارێکی تر لە بەغداد دەرچێ بۆ سەرکوتکردنی ئەم یاخی بووانە. بساسیر-یش ئەمەی بەهەلزانی، وە لە (مانگی ـ ذي القعده ـ ساڵی ٤٥٠ك/مانگی کانونی یەکەم ساڵی ١٠٥٨ز)دا چووە ناو بەغدادەوە و بۆ ماوەی یەك ساڵی ڕەبەق بۆ خەلیفەی (فاطمي) وتاری خوێندەوە([3])، خەلیفەش ناچار بوو دەرچێ بۆ (عانە) ([4])، پەنای برد بۆ قورەیشی کوڕی بەدران. کەوتە نامە نێری لەگەڵ (طغرلبك) داوای یارمەتی لێدەکرد([5]).

وادیارە خیلافەتی(فاطمي)، بەپێی پێویست بەهێز نەبوو تا کۆمەکی بساسیری بکات و دەستکەوتەکانی بپارێزێت، هەروەها وادیارە زۆر متمانەی بەم پیاوە نەبوو، لەبەر ئەوەش، نەجوڵا بۆ فریاکەوتنی، جێهێشت بەتەنیا ڕوبەڕوی هەڵویستەکە بێتەوە لە بەردەم هێزی سوڵتان کەوا هێندەی پێنەچوو گەڕایەوە بۆ عێراق، پاش ئەوەی یاخی بوونی براکەی دامرکاندەوە. بساسیریش ناچار بوو لە بەغداد دەرچێ چونکە نەیتوانی لەبەردەم سوپای سەلجوقی بوەستێ، پاشان لە ساڵی (٤٥١ك/١٠٥٩ز) کوژرا.

(طغرلبك) پاش ئەوەی چووە ناو بەغدادەوە، داوای لە خەلیفە کرد بگەڕێتەوە بۆ پایتەختەکەی و لە نەهرەوان پێشوازی لێکرد و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە هاتنەوەی

---

[1] هەمان سەرچاوە : ل٨٠.

[2] محمود و الشریف : ل٥٦٣.

[3] البنداری : ل١٨. الحسینی:ل١٩.

[4] (عانە): شارێکی ناسراوە لە نێوان ئەلرقەو (هیث)، سەر بە جەزیرەیە. نزیکی فوراتە. نزیکی (حدیثة الفرات) یاخود (حدیثة النورة).الحموي: ب٤ ل ٧٢.

[5] ابن العبری :ل ١٠٤.

([1]). بەوەش لە عێراقدا پرسەکە بۆلای سەلجوقیەکان لەنگەری گرت، بوونە دیاردەیەکی نوێ لە ژیانی خیلافەتی عەباسیدا. جا بەشێوەیەکی گشتی هەڵوێستیان بەرامبەر بە خیلافەت لە هەڵویستی بوەیهیەکان جیاواز بوو، ئەوان رێزیان لەخیلافەت دەگرت، چونکە دیندار بوون ئەم رێزەش لە بیروباوەڕو پەروەردەیان لەسەر مەزهەبی سونی، هەڵقوڵاوە.

لەلایەکی ترەوە، سەلجوقیەکان توانیان سەر لەنوی رۆژهەڵاتی ئیسلامی لە ژێر ئاڵای خۆیان یەك بخەنەوە و بەرفراوانی بکەن، لە رۆژئاوای ئاسیاوە تا سنوری بوسفۆر، ئەوەش لە رێگای جیهاد کردن دژی دەوڵەتی بێزەنتی، توانیان زۆربەی وڵات بسێننەوە.

پەیوەندی نێوان خیلافەتی عەباسی و سوڵتانی سەلجوقی نزیکەی هەژدە ساڵ بەباشی بەردەوام بوو لەو ساتەی کە (طغرلبك) دامەزراندنی دەوڵەتەکەی لە خۆراساندا راگەیاند. زیاتر ئەو هەلومەرجی سیاسیەی کە باس کرا، وایکرد پەیوەندییان پتەو بێ.

بەڵام بە هۆی هەوڵدانی (طغرلبك) بۆ پاوانەکردنی هەموو دەسەڵاتەکان لە عێراقدا تەنانەت ئەوەی کە پەیوەندی بە خەلیفەشەوە هەبوو، ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوولا، سەرەڕای ئەوەی کە دەرامەتی دارایی عێراقی بۆ گەنجینەی سەلجوقی هەڵئەگرت. جا پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ پایتەختەکەی –ڕەی –، کارمەندێکی سەلجوقی کە ناوی ( ئەلعەمید)ی لێنا وەکو جێگری خۆی لە بەغداد دانا ([2]).

هەروەها کارمەندێکی لەژێر فەرمانی ناوبراو بۆ پاراستنی ئاسایش دانا کە ناسراو بوو بە (الشحنه) ([3]) جا دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو تەنانەت بە سەر خەلیفەشدا. هێزێکی سەربازی بۆ پارێزگاری کردنی تێدا بەجێهێشت، چەند شارێکی تایبەتکرد بۆ کەسە تایبەتەکانی خۆی([4]) ئا بەم شێوەیە خەلیفەی عەباسی بەتەواوەتی بێ

---

[1] ابن عمرانی : لا ١٦١.

[2] ابن الاثیر:ب ٨ لا ٨٧.

[3] هەمان سەرچاوە :لا ٨٩.

[4] هەمان سەرچاوە :لا ٧٢، ٨٩.

دەسەلات بوو، جێگرەکانی سولتان زاڵبوون بەسەر دەسەلاتدا.

ئەوەی کە کارەکەی خەستر کرد، هەوڵدانی سولتان بۆ بەستنەوەی هەردوو ماڵی عەباسی و سەلجوقی بە ژن و ژنخوازی. ئەوە بوو کچی خەلیفەی هێنا، بەم کارەش سنوری دابونەریتی خیلافەتی عەباسی بەزاند، ئەمە تەماحێکە پێشتر کەس هەوڵی بۆ نەدابوو. ([1])

وادیارە ئەم هەنگاوە هۆکارێك بۆ پاڵپشتی کردنی دەسەلاتە سیاسیەکەی بە رایەڵێکی ئەدەبی بەهێز لەگەڵ خیلافەتی عەباسیدا.بەڵام زیاتر سەلجوقیەکان تەماحی پۆستی خیلافەتیان کرد، ئەگەرچی یەکێك لە مەرجەکانیان نەبوو ئەوەش (نسب) بوو واتە رەچەڵەك، چونکە ئەوان عەجەم بوون. جا بیرکردنەوەی (طغرلبك) جێگیربوو لەسەر هێنانی کچی خەلیفە بەئومێدی ئەوەی کوڕێکی لێ بخاتەوە شەرعیەتی رەچەڵەکی هەبێ و بەپاڵپشتی سەلجوقیەکاندا بگەیەتە تەختی خیلافەت([2]).

کاردانەوەیەکی نەرێنی هەبوو لە سەر ئەم پرسە، ئەوە بوو خەلیفە ئەلقائم جارس لەمە و داوای لێبوردنی لە سولتان کرد، بەڵام سولتان رازی نەبوو، ئەویش ناچار بوو داواکەی پەسەند بکات و لەساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز) کچەکەیدا بە شوو([3]). جا کاتێك سولتانشینی سەلجوقیە مەزنەکان کەوتە دەستی ئەلپ ئەرسەلان لەساڵی (٤٥٥ك/١٠٧٣ز)، بارودۆخەکە هەروەکو خۆی مایەوە، دەسەلاتداری سولتان و بێ دەسەلاتی خەلیفە. ئەوە بوو لەساڵی (٤٥٨ك/١٠٦٦ز)، سولتان، مەلکشای کوڕی کرد بەجێنشینی خۆی و فەرمانیدا لە سەرجەم ئەو ولاتانەی کە حوکمی دەکات وتاری بۆ بخوێنرێتەوە بە بەغدادیشەوە، بێ ئەوەی پرس بە خەلیفە بکات لەو دامەزراندنە و لەو وتارە. بە فەرمی پێی نەوت تا ساڵی (٤٦٤ك/١٠٧٢ز)، واتە پاش شەش ساڵ ([4]). هەروەها سولتان لە هەمان ساڵدا (ئەبو لعەلا موحەممەدی کوڕی ئەلحوسەین)ی کرد بە وەزیر بەبێ پرس بە خەلیفە بکات، کەوا ئەم هەڵسوکەوتەی پێناخۆش بوو، بە

---

[1] البنداري:لا ٢١

[2] امين، حسين: تاريخ العراق في العصر السلجوقي لا١٣٥-٣٦.

[3] الحسيني :لا ٢١.

[4] ابن الاثير:ب ٨ لا١١١، ١٠٣.

دەستێوەردان لە کاروباری تایبەتی خیلافەت داینا و رازی نەبوو لەسەری([1]).

خەلیفە، لە سەردەمی سوڵتان مەلکشاە تووشی سووکایەتی پێکردنی زۆر بوو، هەندێ لەجێگرەکانی سوڵتان زاتیان کرد هاوبەشی بکەن لەهەندێ دیاردەی تایبەت بە خۆیدا. (سعد الدولە) کوهرائین، بەرپرسی پۆلیسی بەغداد، بە زۆری زۆردارەکی لە بەردەم ماڵی خۆی دەهۆڵی لێدا([2]).

لە دوا دوایی حوکمڕانی ئەم سوڵتانەدا، پەیوەندی لەنێوان خۆی و خەلیفە خراپتر بوو، تاوەکو بڕیاریدا لە بەغداد دەری بکات و پایتەختی خیلافەت بگوازێتەوە بۆ ئەسفەهان، بۆ ئەوەی رێگە بۆ دامەزراندنی کچەزاکەی وەکو خەلیفەیەکیش بکات ([3]) بەڵام قەدەر چاوەڕوانی سوڵتان بوو. خەلیفەش لەلابردنی رزگاری بوو([4]).

لەپاش مردنی مەلکشاە لەساڵی(٤٨٥ك/١٠٩٢ز) دەوڵەتی سەلجوقیە مەزنەکان بەهۆی ئەو ململانێی نێوان کوڕەکانی، تووشی دووبەرەکی ولاوازی بوو([5]). جا ئەوەش رەنگی دایەوە سەر خیلافەتی عەباسی کەوا بەپێی بەرژەوەندی خۆی کاری دەکرد تا لەتەوقی سەلجوقیەکان رزگاری بێ. ئەوە بوو هەندێ جار رۆڵی تەماشاکەری دەبینی لەم ململانێ یانەدا، هەندێ جاریش هەر جارێك دانی بە هێزێك دەنا، جاروباریش دانی بە دوو کەس لە یەك کاتدا دەنا، یاخود بە سەرکەتووەکەیان، بۆ ئەوەی هێزە سەلجوقیەکان بەگژ یەك بدا.

خەلیفە (المسترشد) و خەلیفەکانی پاشیشی ئەم دەرفەتەیانە قۆستەوە، کەوتنە هێنانەوەی دەسەڵات بۆ خیلافەت([6])، دوورکەوتنەوەی سەلجوقیە مەزنەکان لە بەغداد زیاتر یارمەتی دان لەسەر ئەم کارە، چونکە خەلیفە لە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی سوڵتانی سەلجوقی نەما، جا ئەم خەلیفەش هەنگاوی باشی نا لەم رێگەیەدا، بەڵام لە

---

[1] البنداري: لا٤٥.

[2] البنداري: لا٥٥.

[3] ابن الاثير:ب ٨ لا

[4] ابن عمراني: لا. ابن خلكان: ب لا.

[5] یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەم ناکۆکیە ئەوە بوو سوڵتان مەحمودی کوڕی مەلکشاە حوکمی عێراقی جیاکردەوە، بەوەش دەوڵەتی سەلجوقیەکانی عێراقی دامەزراند، کەوا لە دەوڵەتی سەلجوقیە مەزنەکان جیا بووەوە. کە لە خۆراسان و ئێران حوکمی دەکرد.

[6] Arnold: The Caliphate: p ٨٠

کۆتاییدا بووە قوربانی هەوڵەکەی ([1]) پاشان (المقتفی) لەساڵە کۆتاییەکانی حوکمڕانیدا، گۆڕانی بارودۆخی سیاسی دژ بە بەرژەوەندی سەلجوقیەکانی بە هەلزانی، توانی بەشێکی زۆر لەو ئامانجە بەدیبێنی. کەوا (المسترشد) سەرنەکەوت لە بەدی هێنانی.

لەساڵی (٥٣٦ك/١١٤١ز)، سوڵتان سنجەر، کە دواین سوڵتانی سەلجوقیە مەزنەکانە، لەبەردەم (قەراختائی)یەکاندا دۆڕا. هەروەها لەساڵی (٥٤١ك/١١٤٦ز) ناکۆکی خانەوادەیی لە خۆراسان و عێراق دەستی پێکردەوە.

ئەمەو لە کاتێکدا خەلیفە خەریکی بەهێز کردنی ناوەندی خیلافەت بوو لە رووی سەربازیەوە. ئەوە بوو فەرمانی کرد بە خەڵکی. چەکەکان کۆبکەنەوە و کەندڕ لە دەوروبەری بەغداد هەڵکەنن و پەرژینەکانی نۆژەن کردەوە([2]).

ساڵی (٥٤٣ك/١١٤٨ز) بەسەرەتایەکی راستەقینە دادەنرێ بۆ بوژانەوەی خیلافەتی عەباسی، ئەمەش لە ئەنجامی دەستەوسانی سوڵتان مەسعود سەلجوقی فەرمانڕەوای عێراق لە ملکەچ کردنی میرەکانی دەوروبەری کەوا دژی راپەڕین، ئەمەش دەرفەتێکی بە خەلیفەدا دەوڵەت راپەڕێنێ.

جا کاتێك سوڵتان مەسعود لەساڵی (٥٤٧ك/١١٥٢ز) کۆچی دوایی کرد، دەوڵەتی سەلجوقی لە عێراق کۆڵەکەیەکی سەرەکی لەدەستدا، بۆیە لاواز بووەوە و پەشێوی کەوتە ناوی، لە ئاکامدا بەرە بەرە دەسەڵاتی سەلجوقی لە عێراقدا کەم بووەوە تا ئەوەی بە تەواوەتی نەما.

یەکەم شت کە خەلیفە (المقتفی) لەپاش مردنی سوڵتان مەسعود، ئەنجامی دا، بریتی بوو لە زەوتکردنی موڵکەکانی (شحنە – هێزی پاراستنی ئاسایشی ناو شاری بەغداد)، ئەو کارمەندانەی لابرد کە سوڵتان دایمەزراندبوون و کارمەندی متمانە پێکراوی لە باتیان دانا([3])، پاشان سوپایەکی ئامادە کرد و شەڕی پێکردن لەگەڵ

---

[1] خەلیفە ئەلموسترشد ویستی سوود لەو ململانێیە وەربگرێ کە لە نێوان سوڵتان (طغرل)ی کوڕی موحەممەد و سوڵتان مەسعودی برای بەرپا بوو. دەربارەی ئەم رووداوانە بگەڕێوە بۆ ابن الاثیر: ب٨ ل٣٤٥، ٣٤٩.

[2] ابن الاثیر: ب٨ ل٣٥٢.

[3] ابن الاثیر: ب ٩ل٣١، ٣٢.

(شحنه)ی بەغداد–دا و شکاندنی و حله و کوفه و واست–ی لێ سەندەوە ([1]).

خەلیفە سیاسەتی لێدانی هێزە سەلجوقیەکان بەیەکدا، گرتەبەر بۆ ئەوەی سوود لە دووبەرەکی میرەکانی ناوماڵی سەلجوقی وەرگرێ، ئەوە بوو لەساڵی (٥٥١ك/١١٥٦ز) سولەیمان شاهی کوڕی مەحمود کرد بە سوڵتان لەسەر عێراق، هەروەها مەلکشاهی برای کرد بە جێنشین.، پاشان بۆ جەنگاندنی سوڵتان موحەممەدی دووهەم رەوانەی کردن ([2]).

رەوشی دەوڵەتی سەلجوقیەکان لە عێراقدا لەپاش مردنی موحەممەدی دووهەم لەساڵی (٥٥٤ك/١١٥٩ز) خراپتر بوو، جێنشینەکانی هەوڵیاندا دەسەلاتی پێشوویان بگەڕێننەوە، بەلام دووچاری بەرهەڵستی بەهێزی خەلیفەکان بوونەوە، مێژوونوسی سەلجوقی (البنداری) گوزارشت لەم هەڵوێستە شڵەژاوە دەکات دەڵێت: ((ترس کەوتە دڵیانەوە لە بەغداد و لە داگیر کردنی نائومێد بوون، بۆیە نە شاە رووی تێکرد و نە سوڵتان کەوتەڕێ بۆی)) ([3]).

خەباتی خەلیفەکان لە پێناو دەرباز بوون لە کۆت وبەندی سەلجوقی هەر بەردەوام بوو تائەوەی لەسەردەمی خەلیفە (الناصر) بە تەواوەتی سەربەخۆ بوون و دەسەلاتی خەلیفە گەیشتە لوتکە. دەسەلاتی سەلجوقی لە عێراق و رۆژئاوای فارس لەناوچوو، بەلام هەوڵەکانی خیلافەت بۆ سەپاندنی دەسەلاتی بەسەر فارسدا سەرنەکەوت، هەرچەندە توانی ئەهواز بگەڕێنێتەوە.

بە کوشتنی سوڵتان سنجەر لەسەر دەستی (غەز)ەکان دەوڵەتی سەلجوقیە مەزنەکان لەساڵی(٥٥٢ك/١٥٧ز) لەناوچوو، لەکاتێکدا بە کوشتنی سوڵتان(طغرل)ی سێیەم لەسەر دەستی (علا الدین) یشی خەوارزمشاە دەوڵەتی سەلجوقیەکان لە عێراقدا لەناوچوو([4]). لەئاکامی ئەم گۆڕانکاریە، دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی چووە ناو ماوەی سەربەخۆیی راستەقینە کە تاوەکو ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) بەردەوام بوو ([5]).

---

[1] هەمان سەرچاوە: ل٣٢.

[2] الراوندي : ل٢٨٣. ابن الاثير: هەمان سەرچاوە:ل٤٨، ٤٩.

[3] البنداري : ل٢٦٨.

[4] ابن الاثير:ب ٩ل٢٥٥، ٢٣٠.

[5] الزهراني : سەرچاوەیەکی پێشوو : ل٦٧.

## قۆناغی کۆتایی لە حوکمی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

٥٩٠ـ٦٥٦ك/١١٩٤ـ١١٥٨ز

### دەوڵەتی ئەتابەگی - شاهەکان - مەغۆلەکان

لەئاکامی لاواز بوونی سەلجوقیەکان لە دوا دوایی سەردەمەکەیاندا دەوڵەت گەلێکی سەربەخۆ لەچوار چێوەی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیدا دامەزرا، ناسران بە دەوڵەتەکانی ئەتابەگی، کە رەگو ریشەیەکی تورکیان هەیە. (ئەتابەگ: وشەیەکی تورکیە لە دوو وشە پێکهاتووە: ئەتا: پەروەردیار، بەگ: میر، واتە: پەروەردیاری میر).

ئەتابەگەکان لە کۆشك و تەلاری سەلجوقیەکاندا پێگەیین، ئەوەش چونکە سەلجوقیەکان سیستەمێکیان داهێنا لەسەر کڕینی کۆیلە تورکەکان هەستا بوو، ئەوجا دەیانکردنە ناو کۆشك و تەلاری سوڵتانەکاندا بۆ خزمەتکاری، بەتایبەتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، سەرەڕای گرتنە دەستی کاری گشتی.

ئەمانە پۆستی ئیداری و سەربازی گەورەیان گرتە دەست تەنانەت گەیشتنە پۆستەکانی سەرۆکایەتی، جا بەرپابوونی ململانێی ناوماڵی سەلجوقی لەپاش مردنی سوڵتان مەلکشاهی یەکەم-یان بە هەلزانی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بە سەر ئەو ناوچانەی کە لە ژێر حوکمڕانی خۆیاندا بوو. کەوتنە پێشبڕکێ لەناوی خۆیاندا هەر یەکێکیان دەیویست فراوانخوازی لەسەر حیسابی ئەوەی یتر بکات. بەوەش ململانێیەکی ئەتابەگی ناوخۆیی بەرپابوو هاوشێوەی ململانێی ناوخۆیی سەلجوقیەکان.

ناوبانگترین دەوڵەتەکانی ئەتابەگی: کیفا و ماردین و دیمەشق و دانشمەند و موسڵ و جەزیرە و ئازەربێنجان و فارس.

لە تەنیشتیان چەند دەوڵەتێکی دیکە دامەزرا، ئەوەش چونکە سوڵتانە سەلجوقیەکان جێگریان دانا لەو هەرێمانەی کە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوو، جا ئەم

جێگرانە، هەرێمەکانیان زەوتکرد و جیایان کردەوە و کوڕەکانیان کرد بەمیراتگری خۆیان، ئەوە بوو نازناوی (شاهەکان)یان لەخۆیان نا. ناوبانگترینی ئەم شاهانە: شاهەکانی خەواریزم و شاهەکانی ئەرمینیا.

ئا بەم شێوەیە دەوڵەتەکانی ئەتابەگی و شاهەکانی خەواریزم، مولکی سەلجوقیەکانیان بۆ مایەوە، ئەمەش ڕێی خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی قۆناغێك تیایدا خەلیفە عەباسیەکان سەربەست بن و هەموو دەسەڵاتەکانیان بگەڕێننەوە، هەروەها ئەم لاوازی و دووبەرەکیە دەرفەتی بۆ ڕۆژئاوی ئۆرپی ڕەخەساند جەنگی (صلیبی - خاچپەرستەکان) دژی وڵاتە ئیسلامی لە هەرێمەکانی وڵاتی دوای رووبار و فارس وعێراق دەستپێبکاتەوە، لەلایەکی دیکەوە، ئەوا بوو بەغدادیان وێرانکرد و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیان لەناو برد.

جا لەبەر ئەوەی روخاندنی ئەم دەوڵەتە لەسەر دەستی ئەم مەغۆلانە بوو، ئەوا دەبێ کورتە باسێکی مێژووی ئەم گەلە بکەین پێش باسکردنی هەلومەرجی روخاندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی.

## پێگەیشتنی مەغۆلەکان

ئەوەی راستی بێ دەرچوونی مەغۆلەکان لە نیشتیمانی رەسەنی خۆیان کە لەناوەڕاستی ئاسیادایە، بەرەو جیهانی ئیسلامی، نیشانەی ئاستێکی بەرزە لە پەیوەندیەکانیان بە دەوڵەتی خەواریزمی. هەر ئەوەندە گرنگی سەدەی حەوتەمی کۆچی دەرکەوت، جیهانی ئیسلامی بەگوڕهاتنی لەشکرەکانی مەغۆلی بەخۆوە بینی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە بە شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵی لەیەك نزیك و لەیەك دوور، کاریگەری نزیك و دووری هەبوو لە ڕووەکانی سیاسی و ئابووری و ئاینی و ڕۆشنبیری.

مەغۆلەکان جگە لە کۆمەڵێ هۆزی رەوند هیچی تر نەبوون، لە بانی مەنغۆلیا باکووری بیابانی غوبی پێگەیین. لەسەر زێ یەکانی رووباری ئامور ژیان، زاڵبوون بەسەر ئەو ناوچانەی کە دەکەونە نێوان دەریاچەی بایکاڵ لە ڕۆژئاواوە و چیاکانی

کانکان لەسەر سنوری مەنشۆریا لە ڕۆژهەڵاتەوە([1]).

لەنێوان تاکەکانی مەغۆلدا (تیموجین) هەڵکەوت کەوا هۆزە مەغۆلیەکان بەرابەڕ هەڵیان بژارد، ناوی (جەنگیزخان)ی هەڵبژارد واتە (گەردن کەچکەری خەڵکی). ئەوە بوو ئیمپراتۆریەتیەکی بەرفراونی دامەزراند لە چینەوە بەرەو ڕۆژهەڵات درێژ بووەوە تاوەکو سنووری عێراق و دەریای خزر و وڵاتی روس بەرەو ڕۆژئاوا، وڵاتی هند بەرەو باشوور.

## هەلومەرجی فراوانخوازی مەغۆل بەرەو رووی جیهانی ئیسلامی

ئا لەم کاتەدا، خەواریزمیەکان جێی سەلجوقیەکانیان گرتەوە لە حوکمڕانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات لە جیهانی ئیسلامیدا، لە وڵاتی دوای رووبار و خۆراسان و ئێران، رابەرەکانیان کەوتنە دەستێوەردان لە کاروباری خیلافەتی عەباسی تا ئەوەی بڕیاریاندا بەغداد، داگیر بکەن ([2]).

ئەوە بوو عەلائەدین موحەممەدی خەوارزمشاە کە وا جێی (تکشی) باوکی گرتەوە، تەماحی هەبوو ئەم خواستە بەدی بهێنێ و دەسەڵات لەدەستی خەلیفەی عەباسی (الناصر) بسێنێتەوە ([3]).بەڵام لە ژێر فشاری مەغۆلی کەوا کەوتنە دامالینی وڵاتەکەی، سەرەڕای تەنگ پێهەڵچنینی میرەکان بۆی، ناچار بوو پاشەکشێ بکات ([4])

لەئەنجامی ناکۆکی نێوان خۆی و خەلیفە، ئەمیان داوای پاڵپشتی مەغۆلەکانی کرد بۆ ئەوەی سوڵتانی خەواریزمی خەریك بکەن تا شەڕێ لەکۆڵ خۆی بکاتەوە و لە عێراق دووری بخاتەوە ([5]). ئەوە بوو نوسراوێکی بۆ جەنگیز خان نارد هانی دەدا بۆ

---

[1] الجوینی: عکا ملك: تاریخ قاهر العالم ب ۱ل ۶۰.

[2] هەمان سەرچاوە:ب ۲ ل ۲۹-۳۰.

[3] ئەم سوڵتانە بیری لە دامەزراندنی خیلافەتی عەلەوی دەکردەوە لە جێی خیلافەتی عەباسی، جێی باسە ئەو شیعە مەزهەب بوو. دەربارەی هۆکارەکانی تەماحکردنی سوڵتانی خەواریزمی لە بەغداد بگەڕێرەوە بۆ: محمد عبدالباسط عبدالهادي محمد : الشرق السلامي من ظهور السلاجقة حتي زوال دولة الخلافة العباسية.ل ۱۳۵-۱۳۶.

[4] إقبال: [illegible] ۳۳۲.۳۳۲.

[5] ابن الاثیر:ب ۹ل۳۶۱.

وڵاتە ئیسلامیەکان بیّ و بەڵێنی پێدا هاوکاری بکات لە لێدانی خەوارزمیەکاندا ([1]).

بەڵام وێڕای گەیشتنی ئەم نامەیە بۆ مەغۆلەکان، ئەوا هۆکاری هێرشی جەنگیزخان نەبوو بۆ سەر دەوڵەتی خەوارزمی. چونکە ئەو کاتەی کە نامەکەی خەلیفە گەیشت، رابەری مەغۆلی وڵاتێکی زۆری داگیر کردبوو و بەرەو رۆژئاوا فراوانی کردبوو بەجۆرێك سنوری وڵاتەکەی نزیکی سنووری وڵاتی خەواریزم بووەوە، توانی پەیماننامەیەکی بازرگانی لەگەڵ خەواریزمیەکاندا مۆر بکات. لەبەر ئەوەش هیچ بایەخیەکی بەنامەکەی خەلیفە نەدا([2]).

وادیارە کارەساتەکە بەرێوە بوو، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەم نێردە بازرگانیانە، کاتێك جەنگیز خان کاروانێکی بازرگانی بۆ رۆژئاوای ئاسیا نارد بۆ بازرگانی کردن لە بازارەکانی خەواریزم. جا کاتێك گەیشتە شاری (ئەوتراز) کە دەکەوێتە سەر رووباری سیحون. ئەینالّ خان، فەرمانڕەوای شارەکە، دەستی بەسەرا گرت و هەموو تاکەکانی کوشت و کەلوپەلەکەی تالآنکرد([3]).

جەنگیزخان نەیتوانی چاوپۆشی لەم کارە بکات، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە سوڵتان داوای رادەستکردنی فەرمانڕەوای شاری (ئەوتراز) رەتکردەوە. بۆیە لەشکرێکی بیّ شوماری ئامادە کرد و هێرشی کردە سەر خاکی خەوارزم. لەساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) هەرێمی دوای رووباری گرت و پایتەختی خەواریزم بە دەستێوە روخا([4]).

عەلائەدین-یش هەڵهات (لە ترسی مەغۆلەکاندا، کەوا خۆراسانیان گرت) و لەیەکیّ لە دوورگەکانی دەریای قەزوین لەساڵی (٦١٨ك/١٢٢١ز) کۆچی دوایی کرد ([5]). لەساڵی(٦١٩ك/١٢٢٢ز) جەنگیز خان هەرێمەکانی رۆژئاوای بەجێهێشت پاش ئەوەی

---

[1] Lamb. H: Jengkis khan: p ١١٦
[2] Curtih :The Mongols :p.٩٩.
[3] النسوي : سيرة جلال الدين منكبرتي: ل٨٦.
[4] بەسەر هاتەکانی روخانی وڵاتی دوای رووبار لەلای (الجويني) بخوێنەوە: ب ٧١ ل ١١٠-١٣٥.
[5] النسوي: ل٢٣.

کە دەسەڵاتی مەغۆل لە هەردوو هەرێمی دوای رووبار و خۆراسان بەشێوەیەکی تەواوەتی چەسپا([1]).

## روخانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی

مەغۆلەکان، پاش مردنی جەنگیز خان لەساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٧ز)، لە چوارچێوەی سیاسەتێکی فراوانخوازیدا، کشانیان بەرەو ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیادا دەستپێکردەوە، ئەوە بوو مەنگۆ خان کەوا بووە رابەری مەغۆلەکان لە ساڵی (٦٤٦ك/١٢٢٨ز)، سەرکردایەتی هەڵمەتێك بە (هۆلاکۆ)ی برای سپارد بۆ سەر فارس، تەمێی کرد ئەو وڵاتانەی کە لە عێراق درێژ بۆتەوە تاوەکو ئەو پەڕی میسر بخاتە ژێر رکێفی خۆی. پەیوەندی لەگەڵ خیلافەتی عەباسیدا لەم چوارچێوەیە دیاری کرد: ئەگەر گوێرایەڵی کرد و دۆستایەتی خۆی نواند ئەوا هیچی لێ نەکات، بەڵام ئەگەر یاخی بوو و گوێرایەڵی نەکرد، ئەوا دەبێ لەناوی ببات. تا نەبێتە تەگەرەیەك لە رێی کشانی مەغۆلەکاندا([2]).

لەلایەنی خۆیەوە، هۆلاکۆ پلانێکی سەربازی دانا، کە یەکەم جار ئیسماعیلیەکان لەناو ببات، پاشان هێرش بکاتە سەر ناوچەکانی رۆژئاوا تا دەگاتە میسر لە قۆناغی دووهەمدا. جا پاش ئەوەی ئامانجی یەکەمی هێنایەدی کەوتە رێ بۆ هێنانەدیی ئامانجی دووهەمی.

رەوشی ناو بەغداد، لەو کاتەدا، زۆر خراپ بوو، ئەوە بوو خەلیفەی عەباسی (المستعصم) ناسراو بوو بە جدی نەبوونی لە بەڕێوە بردنی کاروباری گشتی ([3])، خۆی بۆ روبەڕوبونەوەی کشانی مەغۆلەکان ئامادە نەکرد، چونکە پێی وابوو دەتوانێ فێڵیان لێبکات و لە بەردەم مەترسیان خۆی راگرێ ([4]). هەروەها ئەو کاتە لایەنە

---

[1] العريني : السيدالباز: المغول ل١٤٢.

[2] رشيد الدين جامع التواريخ، تاريخ المغول في إيران: ب٢ ل٢٣٦،٢٣٧.

[3] ابن الطقطقا: الفخري في الاداب السلطانية: ل٣٣٢.

[4] الصياد، فؤاد عبدالمعطي: المغول في التاريخ. ل٢٥٢.

بەهێزەکان لە بەغداد زیاتر بوون و ناکۆکی کەوتە نێوانیان بەهۆی هۆکاری سیاسی و مەزهەبی. خەلیفەش دەستەوسان وەستا بوو و نەیدەتوانی سنوورێك بۆ کێشەکان دانێ، لەئەنجامی ئەوەش ئاستی ناکۆکی لەنێوان (موجاهیدەدین ئەیبەك دواتدار)ی بچووك، کە سونی مەزهەب بوو، نێوان (موئەیدەدینی کوڕی ئەلعەلقەمی)، وەزیری (المستعصم)، جا شیعە بوو. ئەمەش کاریگەریەکی خراپی هەبوو لەسەر شێواندنی بارودۆخەکەو لاوازبوونی دەسەڵاتی خیلافەت([1]).

زیاتر ناکۆکی نێوان دەسەلاتداران، رەنگدانەوەی هەبوو لەسەر هاوڵاتیان، ئەوە بوو دانیشتوانی بەغداد بەهۆی شەڕی مەزهەبیەوە بوونە دووبەشەوە ([2]) ئەمەش هانی، کوڕی ئەلعەلقەمی وەزیردا، بۆ ئەوەی نامە بۆ مەغۆلەکان بنێرێ و تەماحداریان بکات بێنەناو بەغدادەوە([3]).

ئەوەی راستی بێ، پەیامنێری و دانوستانی نێوان هەردوولا، کاریگەریەکی گەورەی نەبوو لەهاندان یاخود پەشیمان بوونەوە لە هێرش کردنە سەر بەغداد، چونکە داگیرکردنی عێراق لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی مەغۆلەکاندا بوو.

لەم بارودۆخە تەنگاوەدا، هۆلاکۆ داوای لە خەلیفە کرد کۆمەکی بکات بە سوپایەك بۆ لەناو بردنی پروهی ئیسماعیلی. (المستعصم) راوێژی بە یاریدەرانی کرد، ئەوانیش ئامۆژگاریان کرد ئەم کارە نەکات، چونکە هۆلاکۆ دەیەوێ بەغداد لە بەرگریکار و جەنگاوەر چۆڵ بکات تاکە هێرشی کردە سەری بە ئاسانی داگیری بکات. ئەویش بۆ چوونیانی پەسەند کرد وکۆمەکی هۆلاکۆی نەکرد([4]).

جا کاتێك رابەری مەغۆل لە لەناوبردنی گروپی ئیسماعیلی تەواو بوو، نامەیەکی سەرزەنشت ئامێزی بۆ خەلیفە نارد ناوەڕۆکەکەی هەڕەشەو گورەشە بوو بە هۆی کۆمەکی نەکردنی. لە راستیدا ئەم نارەزایی دەربڕینە تەنها پەڵگرتنێك بوو بۆ داوا

---

[1] صفا، نبیح الله: تاریخ ادبیات در إیران، ب ٣ لا ١٢٠.

[2] السیوطي: تاریخ الخلفاء : لا ٤٦٥.

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] بگەڕێوە بۆ -الرسالەڧ فتح بغداد -کە هی -نصیرالدین الطوسي-یە و گەێنراوە بە کتێبی - تاریخ قاهر العالم - الجویني ب ٢ لا ٣٦٢.

کردنی دەسەڵاتی بەغداد ([1])، داوای لێکرد :

– قـەڵاکان بـروخێنێ، وە کەنـدرەکان پـڕ بکاتـەوە، وڵاتـیش رادەسـتی کوڕەکـەی بکات.

– بێ بۆ دیداری یا خود سولەیمان شاهی وەزیر و دواتدار، بنێرێ ([2])

خەلیفەش بە هەڕەشە و گوڕەشەوە داواکەی رەتکردەوە، چونکە پێی وابـوو ئـەوە وا لە هۆلاکۆ دەکات لـە بڕیاری داگیر کردنـی بەغداد پەشـیمان بێتـەوە و بـاش بـیر بکاتەوە پێش ئەوەی ئەم هەنگاوە بنێ.

وادیارە خەلیفە هیوادار بوو میرە موسڵمانەکان دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەنـەوە، بەڵام هەڵسەنگاندنەکەی هەڵە بوو، چونکە ئەیوبیەکان لەوڵاتی شام و مەمالیکەکان لـە میسردا، ئەوەندە گیرو گرفتیان هەبوو نەیانتوانی یارمەتی بدەن. ئەتابـەگی و تـورك و فارسەکانیش لەترسی مەغوڵەکاندا پاڵپشتیان نەکرد، سەبارەت بە سەلجوقیەکانی رۆم ئەوا ملیان بۆ کەچ کردن و چوونە ژێر دەسەڵاتیان([3]).

ئا بـەم شـێوەیە جیهـانی ئیـسلامی بـە تـرازاوی دەرکـەوت، نـەدەبوو خەلیفـە ئـەم هەڵوێستە توندە بنوێنی لە کاتێکدا پشتیوانیەکی راستەقینەی نەبوو.

جا ئەم هەڵوێستە عەباسیەکان کاریگەریـەکی خراپـی هـەبوو لـە نـاخی هۆلاکۆدا، ئەمەش وایکرد بەرەو بەغداد بکشێ.

نێردراوانی خەلیفە گەیشتنە لای هۆلاکۆ، کاتێك چاوی بە نامەکەیدا خشاند و بـۆی دەرکەوت کە نێردراوەکانی ئازاریان پێگەیشت لـە هاوڵاتیـانی بەغـداد، زۆر تـوڕە بـوو. نێردراوانی (المستعصم) ی گەڕانەوە و نامەیـەکی لەگـەڵ نـاردن کـە ئاگـادار کردنێکـی کۆتایی لەخۆ دەگرت و بە شێوەیەکی توند دارێژرا، بوو ([4]).

کاتێك نێردراوەکان گەڕانەوە بۆ بەغداد و خەلیفە زانی وەڵامی مەغۆلی مانای چیە،

[1] الصیاد: لا ٢٥٥.

[2] رشید الدین: جامع التواریخ، سەرچاوەکەی پێشوو ب ٢لا ٢٧١.

[3] العرینی:لا ٢١٦-٢١٧.

[4] رشید الدین : جامع التواریخ:ب ٢ لا ٢٧١.

نامەکەی خستە بەر دەستی گەورە پیاوانی دەوڵەت تا بزانی بۆچوونیان چیە، ئەوە بوو کوڕی ئەلعەلقەمی، وەزیر، پێشنیاری کرد پارەیەکی زۆر و شتی دەگمەن و ناوازە و دیاری بۆ هۆلاکۆ بنێرێ لەگەڵ داوای لێبوردن و دراویش بکاتە ناویەوە ([1])، بەو شێوەیەی کە لە رۆژانی بوەیهی و سەلجوقیەکاندا باو بوو، خەلیفەش ئەم بۆچوونەی پێ پەسەند بوو، بەڵام موجاهیدی کوڕی ئەیبکی دواتداری بچووك کەوا سەرکردایەتی هێزی سوپای دەکرد و پاڵپشتی سوننەکانی دەکرد لە بەغداد، بۆچوونی وەزیری رەتکردەوە و سوور بوو لەسەر بەرگریکردن ([2]).

ئابەم شێوەیە نامەنێری لە نێوان هەردوولا هیچ کاریگەریەکی نەبوو جگە لەوەی جەنگیان، کرد بە پێویستیەك دەبێ بکرێ([3])

جا هۆلاکۆ کاتێك دڵنیا بوو لەوەی دەتوانێ بەرەو عێراق بکەوێتەرێ بە بێ ئەوەی تووشی ئاستەنگ بێت و هێزەکانیشی دەتوانن بەغداد داگیر بکەن، دەستی کردە جێبەجێکردنی پلانە جەنگیەکانی کە لەکاتی مانەوەی لە هەمەدان دایناںبوو، فەرمانیدا لەشکری مەغۆلی بەرەو پایتەختی خیلافەت بجوڵێ. لە (سیانزەی مانگی موحەڕەم ساڵی ٦٥٦ك/مانگی کانونی دووهەم ساڵی ١٢٥٨ز) گەیشتە لای، گەمارۆیەکی توندوتۆڵیدا و سەربازگەکەی لەرووی دەرەوەی شار لەلای رۆژهەڵاتەوە دانا ([4]) خەلیفە کە خۆیی لەم هەڵویستە تەنگاوە بینیەوە، ویستی مەغۆلەکان هێور بکاتەوە و لە تەواوکردنی هێرشەکەیان پەشیمانیان بکاتەوە، بۆیە کۆمەڵێ نێردراوی بە دیاریەوە بۆ لای هۆلاکۆ نارد([5]) بەڵام هۆلاکۆ رازی نەبوو. پلانێکی سەربازیی جێبەجێکرد، کە بەپێی، بەغداد لە بەرگریکارانی چۆڵ بکات پێش ئەوەی سەربازەکانی بچنە ناویەوە. هەستا بە ناردنی (نصیرالدین الطوسي) بۆ لای خەلیفە، فەرمانی پێ دەکات سولەیمان شاه و دواتر بنێرێ. خەلیفەش ناچار بوو بە گوێی بکات. جا کاتێك گەیشتنە لای،

---

[1] هەمان سەرچاوە:ل ٢٧١.

[2] هەمان سەرچاوە٢ ل ٢٧١

[3] حسن، حسن ابراهیم: تاریخ السلام السیاسي.....، ب ٤ ل ١٥٦.

[4] ابن العبري :ل ٣٠٧.

[5] الصیاد: ل٢٦٢.

گەڕاندنیەوە بۆ بەغداد بە مەبەستی هێنانی شوێنکەوتووان و هاوەڵەکانیان بە بەهانەی ئەوەی کەوا شار بەدەر دەکرێن بۆ شام و میسر. ئەوە بوو سەربازەکانی بەغداد و ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی لەگەڵیا دەرچوون([1]).

کاتێك ئەم کۆمەڵە خەڵکە دەرچوون، هۆلاکۆ فەرمانیدا هەر هەموویان بکوژرێن([2]) لەم کاتەش خەلیفە هەڵوێستی خۆی ئاشکرا کرد و مەیلی کرد رادەستیان بێ، چونکە زانی مەغۆلەکان دێنە ناو بەغدادەوە.

دوو رۆژی پێ نەچوو لە سەر ئەو کردەوە، مەغۆلەکان بە بەڵێنی درۆ هەڵیان خەڵەتاند. ئەوە بوو کوڕی ئەلعەلقەمی لەو پیلانە بەشدار بوو کاتێك خەلیفەی رازی کرد بە خۆڕادەست کردن، کەوا ئەمە رێ خۆشکەرێکە بۆ ئاشتی و داوتر هۆلاکۆ و مەغۆلەکان بە گوێرایەڵی بۆ لای دێن([3]).

(ابن کثیر) دەگێڕێتەوە، کەوا کوڕی ئەلعەلقەمی، وەزیر (المستعصم)، بە هۆلاکۆ کۆبووەتەوە لەگەڵ کەسوکار و هاوەڵ و داروودەستەکەیدا، پاشان بە خەلیفەی وت دەرچێ بۆ لای و بچێتە بەردەستی بۆ ئەوەی ئاشتبوونەوە بێتەدی کەوا نیوەی (باج) بۆ هۆلاکۆ بێ و ئەو نیوەکەی تریشی بۆ خەلیفە([4]).

رۆژی یەکشەممە (چواردەی مانگی سەفەر ساڵی ٦٥٦ك/مانگی شوبات ساڵی ١٢٥٨ز) خەلیفە لە بەغداد دەرچوو و خۆی و پایتەختەکەی بە بێ مەرج رادەستی مەغۆل کرد، پاش ئەوەی کە هۆلاکۆ بەڵێنی پێدا هیچی لێ نەکات ([5]).

ئەوسا سەربازەکانی مەغۆل چوونە ناو شارەوە و بۆ ماوەی هەفتەیەك خەریکی تێکدان بوون، مزگەوتەکانیان روخاند، شتەناوازەو دەگمەنەکانی کۆشکەکانیان تالان کرد، ژمارەیەکی زۆر لە کتێبی بە نرخی کتێبخانەکانیان لەناودا، زۆر لە زاناکانیان لەناوبردا، ئیمامی مزگەوتەکان و قورئان لەبەرەکانیان کوشت. قوتابخانەکان دەوامیان

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] جامع التواریخ: ب ٢، ل ٢٩٠.

[3] الصیاد: ل٢٦٣.

[4] ابن کثیر: البدایة و النهایة في التاریخ : ب١٣، ل٢٠١.

[5] الصیاد: ل٢٦٣.

ئەما و شارەکە بوویە زەویەکی تەخت[1].

تەرم لە شەقام و کۆڵانەکاندا کەڵەك بوو، پاشان دەرد و پەتا بڵاویوو، ئەوەی لە کوشتن رزگاری بوو، کوشتی[2]

ئەم بەسەرهاتانە بە کوشتی خەلیفە (المستعصم) و هەردوو کوڕەکەی ئەبو لعەباس ئەحمەد و ئەبو (الفضائل) عەبدولڕەحمان کۆتایی هات، هەروەها بە دیلگرتنی (موبارەك) کوڕە بچووکەکەی و هەرسێ خوشکەکەی، فاتمە و خەدیجە و مەریەم[3].

بە روخانی بەغداد و کوشتنی خەلیفەی عەباسی (المستعصم) دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی کەوا لە پێنج سەدە زیاتری خایاند، کۆتایی هات. ئەوە دەمێنێ بڵێین کە پۆستی خیلافەت بە چۆڵی مایەوە و هەموو رابەرێکی تەماحکار چاوی تێ دەبڕی. کاتێك سوڵتانی مەمالیکەکان (الظاهر) بێبرس چووە سەرتەختی پادشایەتی لە میسر، بۆ یەکێك لە تاکەکانی دەوڵەتی عەباسی گەڕا و کردی بە خەلیفە و لە میسر داینا لەساڵی(٦٥٩ك/١٢٦١ز).

لە راستیدا سوڵتانی ناوبراو مەبەستی ئەوە بوو شەرعیەت بدا بە دەسەڵاتەکەی خۆی، ئەوەش بەو پێسپاردنەی کە لەخەلیفە بە دەستی کەوت. ئەم بارودۆخە ئاوەها بەردەوام بوو لە میسر تاوەکو لە ساڵی (٩٢٣ك/١٥١٧ز) سوڵتانی عوسمانی سەلیمی یەکەم هات و ئەم دیاردەیەی کۆتایی پێهێنا.

سوڵتانە عوسمانیەکان پۆستی خیلافەتیان گرتە دەست، لە ئیستابولی پایتەختیانەوە کاروباری جیهانی ئیسلامیان هەڵدەسوڕاند تاوەکو ساڵی (١٩٢٤ز) کاتێك کەمال ئەتاتورك کۆدەتایەکی سەربازی لەسەر خیلافەت کرد.

لەو بەروارەوە، جیهانی ئیسلامی تاوەکو ئەمڕۆ، بێ خەلیفەیە.

---

[1] Brown:Literary Hist of Persia:II p ٤٦٣

[2] ابن کثیر:ب١٣، ل٢٠٣.

[3] ابن کثیر:ب١٣، ل٢٠٥. الطوسي : سەرچاوەیەکی پێشوو : ل٢٧٠.

## کۆتایی

دانیشتنی ئەبو لعەباسی خوێنرێژ لەسەر تەختی خیلافەت، سەرەتای قۆناغێکی سیاسی نویێ بوولە قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامی، تێدا عەباسیەکان دەسەلاتیان گرتەدەست و سیاسەتیان بەکارهێنا، سیستەمی حوکمیش هەر وەکو ئەوەی ئەمەویەکان مایەوە، سیستەمێکی شاهانە و (وراپی)، کە کۆشکەکانی عەباسی پربوو لە دیاردەی خۆشگوزرانی.

بەڵام ئەم سیستەمە رێبازێکی تری گرتەبەر لە رووی پەیوەندیکردنی بە گروپەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە، پشتی بەست بەو رەگەزە ئیسلامیە ناعەرەبانەی کە تێکەڵی ئەم کۆمەڵگەیە بوون، هەر چەندە پۆستی خیلافەت و زۆر لە پۆستەکانی دیکەی سەرۆکایەتی بەشی عەرەب بوو.

لەئەنجامی ئەمەش سەردەمی عەباسی یەکەم مۆرکی فارسایەتی پێوە دیار بوو لەگەڵ پاراستنی مۆرکی عەربچێتی، ئەمەش بووە هۆی ئاوێتە بوونێکی "سیاسی" و "شارستانی"، ئاکامی یەکەمەکەی باڵادەستی فارسەکان بوو لە هەڵسوراندنی کاروباری دەوڵەت، ئاکامی دووهەمەکەش سەرهەڵدانی رۆشنبیریەتێکی نۆی بوو کە بریتی بوو لە رۆشنبیریەتی فارسی وەکو چوارچێوەیەکی گشتی بۆ رۆشنبیریەتی عەرەبی.

جا ئەبو جەعفەری مەنسور لەسەردەمی خۆیدا کەسی نمونەیی بوو بۆ گرتنەدەستی پۆستی سەرۆکایەتی، بە دامەزرێنەری راستەقینەی دەوڵەتی خیلافە عەباسی دادەنرێ، چونکە بەرهەڵستکاران و یاخی بووان لە دەسەلاتەکەی، لەناوبرد، لە ناوەوەی خانەوادەی عەباسی و دەرەوەشی. هاوکات سنوری دەوڵەتەکەی لەگەڵ دەرەوە پاراست.

ویرای ئەو تەگەرانەی کە عەباسیەکان تووشی بوون، ئەوا توانیان کۆڵەکەی سیستەمێکی نویێ بچەسپێنن. کە هەلومەرجی نوێی سیاسی و کومەلایەتی و پلەوپایە دەوڵەتی ئیسلامی پێویستی پێی بوو، چونکە عەقڵیەتی ئیسلامی وشك نەوەستا لە بەرامبەر گۆڕانکاریە شارستانیەکان کە جیهانی ئیسلامی بەخۆیەوە بینی، بەڵکو

ئاوێتەی بوو و سیستەمێکی گونجاوی لەگەڵ بنەما باڵاکانی ئیسلام هێنایە ئاراوە بێ ئەوەی لەو چوارچێوە گشتیەی کە قورئانی پیرۆز وێنای کردوە و سونەتی پێغەمبەر دیاری کردوە، دەربچێ، بەرژەوەندی باڵای ئیسلام و بەرژەوەندی گەل لە رووی هەلومەرجی سیاسی و دونیایی و ئاراستەکانی سەردەم یەك بخات، جا کرانەوەی شارستانی بەرووی رۆژهەڵات، بەتایبەتی، رۆژئاوا، یەکێك بوو لە هەنگاوە گرنگەکان بۆ گەشەکردن و گۆڕانکاری.

جێنشینێتی یەکێك بوو لەو هەنگاوە گرنگانەی کە عەباسیەکان دایان نا لە پێناو چەسپاندنی پێی خانەوادەکەیان و پاراستنی دەسەڵات و بەردەوامبوون لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، لە سایەی بەرهەڵستکاری (طالبی)یەکان بەشێوەیەکی تایبەت، کەوا دڵتەنگ و خەمناك بوون لە دەسەڵاتداریێتی بنەماڵەی عەباس و تاکڕەوی کردنیان لە بەڕێوەبردنی، چونکە ئەمان پاڵپشتی شۆڕشی عەباسیان کرد بە ئومێدی ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست، کەوا مافێکی شەرعیە بۆ بنەماڵەی عەلی. بەرهەڵستکاری (طالبی) بە درێژایی سەردەمی عەباسی یەکەم بەچالاکی مایەوە تاوەکو توانی لەسەردەمی عەباسی دووهەم دەوڵەت گەلێکی جیاخواز لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا دامەزرێنێ، کە جاروبار رکابەری دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی دەکرد و بە مەترسی دادەنرا لەسەر بوونی. خەواریجەکانیش دەوڵەت گەلێکی سەربەخۆیان لە مەغریب دامەزراند. هەروەها عەبدولڕەحمان داخلی ئەمەوی دەوڵەتێکی سەربەخۆی لە ئەندەلوسدا دامەزراند.

هێندەی نەمابوو سەردەمی عەباسی یەکەم تەواو بێ، جیهانی ئیسلامی لە رووی سیاسیەوە دووبەرەکی کەوتە ناوی، لەگەڵ (عوبەیدی)یەکاندا روویدا کەوا تەنانەت دانیان بە خیلافەتی عەباسیش نەنا.

وادیارە هۆی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی کەسایەتی خەلیفەکان و فراوانبوونی رووبەری دەوڵەت و قورس و گرانی لە پەیوەندی کردن بە بەشەکانیەوە، ئیتر خەلیفەکانیش نەیاندەتوانی چاودێریەکی راستەقینەی فەرمانڕەواکان بکەن لە هەرێمەکاندا، وێڕای سەرهەڵدانی رەگەزە ناعەرەبەکان و جیابوونەوەیان، لە هەوڵێکدا

بۆ زیندوو کردنەوەی شکۆمەندی دێرینیان.

جا دیاردەی جیابوونەوەی سیاسی لە ناوەندی خیلافەت کاریگەری هەبوو. ئەوە بوو سەرەتا میری میرەکانی تورك دەرکەوت، پاشان فەرمانڕەوای دەوڵەتە جیابووەوەکان لەسەر حیسابی خیلافەت. خەلیفەش هیچ رۆڵێکی نەما، هەموو تایبەتمەندیەکانی وەکو سەرچاوەی یەکەمی دەسەڵات لە دەوڵەتدا لە دەستدا، خەلیفەکان (هەندێ جار) دووچاری لەسەر کار لابردن و زەوتکردنی ماڵ و سامانیان و کوشتن، بوونەوە.

لاوازی خیلافەت و پەرتەوازە بوونی لە سەردەم عەباسی سێیەمیش هەر بەردەوام بوو. ئەمجارە لە بەردەم دەرکەوتنی هێزی بوەیهیە شیعەکان. بەڵام لە دوادواییەکانی سەردەمی بوەیهی خەلیفەی عەباسی (ئەلقائم) هەلومەرجی تێکچوونی سیاسی کەوا دەسەڵات پێدا تێپەر دەبوو، بە هەلزانی و هەندێ دەسەڵاتی بۆ خۆی گەڕانەوە.

لەم کاتەدا تورکە سەلجوقیەکان سەرکەوتن لە دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ خۆیان لە رۆژهەڵاتدا لە پاشماوەی غەزنەوی وبوەیهیەکان، بەرەو عێراق کشان و چوونە ناوی و دەوڵەتی بوەیهیان لەناوبرد و جێیان گرتنەوە لە حوکمڕانیدا. دەستیان بەسەر هەموو دەسەڵاتەکان لە وڵاتدا گرت، بارودۆخی خەلیفەکانیش لەشارنشینی خیلافەتدا بەبێ دەسەڵاتی مایەوە، بەڵام مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەلیفەکاندا باشتر بوو بەراورد بە بنەماڵەی بوەیهی، چونکە سونی مەزهەب بوون، ئەوان سوور بوون لەسەر مانەوەی خیلافەتی عەباسی تا لەناوبردنی رکابەرەکانیان لە لایەنگرانی مەزهەبی شیعی ئاسان بکات و پشتگیری سونیەکانی جیهانی ئیسلامیش بە دەست بێنن.

لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەلجوقی، سەلجوقیەکان لاواز بوونەوە، پەیوەندی نێوان خەلیفە عەباسیەکان و سوڵتانە سەلجوقیەکان شێوەیەکی تری لەخۆگرت کە بە تەواوەتی جیاواز بوو لە پەیوەندییان لەکاتی یەکرێزی سەلجوقیەکاندا، خەلیفەکانیش سوود لەم دەرفەتەیانە وەرگرت و کەوتنە کارکردن لەسەر گەڕانەوەی دەسەڵاتی خیلافەت، ئەوەش لە رێگەی لەناوبردنی دەسەڵاتی سەلجوقیەکان، ئەوە بوو هەردوولا چوونە ناو ململانێیەکی توندوتیژ بە هاتنی خەوارزمیەکان پاشان مەغۆلەکان بۆ سەر

هێڵی سیاسی کۆتایی پێهات. جا مەغۆلەکان سەرکەوتنی سەرسوڕهێنەریان بەدەستهێنا. دەوڵەتی خەوارزمیان لەناو برد، پاشان بەرەو عێراق کشان لە هەوڵێکدا بۆ زاڵبوون بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، چوونە ناو بەغدادەوە و خەلیفە (المستعصم) یان کوشت و دەوڵەتی خیلافەتی عەباسیان ڕوخاند لەساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز).

بە ڕوخانی دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی عەرەب سەروەری ڕەهایان لە دەستدا و تای تەرازوی ڕەگەزە ناعەرەبەکان قورس بووەوە بەتایبەتی مەمالیکەکان و تورکە عوسمانیەکان کەوا ئاڵای خیلافەتی ئیسلامیان هەڵگرت. بە ناوی ئیسلامەوە سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستیهێنا.

خیلافەت لە دەوڵەتی بنەماڵەی عوسمان بە (وراپی) مایەوە تا ساڵی (١٩٢٤ز) بەردەوام بوو کاتێك کەمال ئەتاتورك ڕۆڵی خیلافەتی نەهێشت. ئەم پۆستەیەش تا ئەمڕۆمان بە چۆڵی ماوەتەوە.

سەرئەنجام، دەوڵەتی خیلافەتی عەباسی کەوا زیاتر لە پێنج سەدەی خایاند، سەرەڕای لایەنە نەرێنیەکانی، بە وێنەیەکی گەشاوە دەمێنێتەوە لە ویژدانی موسڵماندا، لاپەڕەیەکی ڕۆشن لە مێژووە شکۆدارەکەیدا، کە شانازی بە بەسەرهاتەکانی بکات.

بەپشتیوانی خودا تەواو بوو

ئەم توێژینەوەیە باس لەمێژووی دەوڵەتی خەلافەتی عەباسی دەکات لە ڕووی سیاسییەوە بە شێوەیەکی بابەتیانە، ئەوەی ڕاستی بێت ڕووداوەکانی مێژووی دەوڵەتی عەباسی زۆر ئاڵۆزو تیکەڵ وپێکەڵەن وپێکهاتەی سیاسی زۆری هەیە، بۆیە دەوڵەتێکی ئیسلامی بەرفراوانی لێدروستبوو، وە بە تەواوکەری دەوڵەتی خەلافەتی ئەمەوی دادەنرێت، کە چەند لایەنێك ململانێیان لەسەریدەکرد وەکو لایەنی عەرەبی و فارسی و تورکی، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و دەمارگیری جیاوازی بەخۆوە بینی لەگەڵ گەشەکردنێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی گرنگ، کە ڕێڕەوو ڕیبازی دیاریکرد، بیروباوەری ئیسلامیش هۆکارێکی ڕوون و ئاشکرابوو لەدروستبوونی ئەم ڕووداوو ئاوێتەبوونە، چونکە کاریگەرییەکی بنەڕەتی هەبوو لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی.




Cover Design: Harem Osman






facebook chapxanai chwarchra

نرخ: ٦,٠٠٠ دینار